# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

---

فلسفة المسؤولية القانونية
في ضوء المقولات الأرسطية

.......................................

فەلسەفەی بەرپرسیارێتی یاسایی
لەبەر ڕۆشنایی وتەکانی ئەرستۆدا

---

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : کۆسار بەرزنجی
پێداچوونەوەی : تۆفیق کریم
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠.٠٠٠ دینار

**پرۆژەی وەرگێڕانی**
**کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا**



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾

سورة البقرة/١٩٤

**(الحكمةُ ضالّةُ المؤمنِ، فحيثُ وجدَها فهو أحقُّ بها)**

رواه أبوهريرة

# ناوەڕۆك

# پێشەكی

**ناساندنی فەلسەفە:**

فەلسەفەی هەموو شتێك ئەو بایسەمەبەستەیەتی(علتە الغائیة) كە لە رووی وێناكردنیەوە لە سەرەتادا ناوی لێدەنرێت نیاز و هەڵنەر و پاڵنەر و لە رووی بەدیهاتنەوە پاش هەبوونیشی پێی دەوترێت: مەبەست ، ئامانج ، ئەنجام ، ئارمانج ، مەسڵەحەت و ناوی تری لەم بابەتە.

لە فەرموودەی خوای گەورەدا كە قورئانە ناوی بە( رەحمەت) هاتووە كاتێك دەفەرموێت ﴿ وما ارسلناك الا رحمة للعالمين[1]﴾. كەواتە پەروەردگار ئەركی پەیامی موحەممەدیی تەنها لە مەسڵەحەتی مرۆڤدا قەتیسكردووە، واتە بەدیهێنانی قازانج بۆ مرۆڤ (یان سوودی هێنراو)، وە دوورخستنەوەی زیان( یان زیانی دوورخراوە) چ ماددی بێت یان مەعنەوی، دونیایی بێت یان پاشەرۆژیی، كەواتە سەبارەت بە مرۆڤەوە بە (بەرژەوەندی) ناو دەبرێت و لە لایەن پەروەردگاریشەوە بە ئامانج ناو دەبرێت.

بەرژەوەندییەكانی مرۆڤیش(یان ئامانجەكانی شەریعەت) یان لە پێویستییە بناغەییەكانی ژیانن(زەروراتەكان) یان پێویستییە پلەدووەكان(حاجيات) یان تەواوكاری یەكانن(كەماليات).[2]

---

[1] سورة الانبياء / ١٠٧ .

[2] بۆ درێژەی پتر بگەڕێوە بۆ پەرتووكی أصول الفقه في نسيجه الجديد ، دلندر ١٨٤/١ .

## ناساندنی بەرپرسیارێتی:

بەرپرسیاریەتی مرۆڤ بریتیە لە خستنەئۆبالّی ئەو ئەنجامانەی بە هۆی سەرپێچی لە بنەمایەکی یاسایی یان رەوشتییەوە تووشی دەبێت. لە حالّەتی یەکەمدا پێی دەوترێت بەرپرسیاریی یاسایی و پاداشتێکی یاسایی بە سەردا دەسەپێت کە خۆی لە سزادان یان بژاردندا دەبینێتەوە. وە لە حالّەتی دووەمدا پێی دەوترێت بەرپرسیاریەتی کۆمەلاّیەتی (ئەدەبی) و دەبێتە هۆی رق و نەفرینی کۆمەلّگە بۆ ئەو رەوشەی کە پێچەوانەی ڕەوشتەکانە. وە بەرپرسیاریەتی یاسایی دەکرێت بە دوو بەشەوە: یەکەم: سزایی، ئەگەر هەلّەیەکی لەو هەلاّنە تێدا بوو کە یاسای تاوانەکان ڕاستەوخۆ دیاری کردبوو. دووەم: مەدەنی، ئەگەر لەسەر بناغەی ئەو هەلّەیە بوو کە یاسا بە شێوەیەکی رەها دیاری کردبوو، چ راستەوخۆ چ ناراستەوخۆ.

## سروشتی لێکۆلّینەوە لەم بابەتە:

سروشتی لێکۆلّینەوە لەم بابەتە وەها دەخوازێت کە لە رووی شێوەوە بکرێت بە سێ دەروازەوە. یەکەم: بابەتە رێخۆشکەرەکان، دووەم: لێکۆلّینەوەی بەرپرسیاریەتی سزایی لە رووی کاریگەریبوونی بە (کردار) و (کارتێکران)ی فەلسەفی یەوە، سێیەم: لێکۆلّینەوە لە بەرپرسیاریەتی مەدەنی لە رووی کاریگەریبوونیان بە (کردار) و (کارتێکران)ی فەلسەفی یەوە.

# دەروازەی یەکەم

## جیاوازی نێوان بەرپرسیارێتی تاوانکارانە و مەدەنی و ناساندنی ئەرەستۆ و بنەما ئەرەستۆیی یەکان

لەم دەروازەیەدا سێ خاڵی سەرەکی باس دەکەین وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ لێکۆلینەوەی فەلسەفی لەسەر بەرپرسیاریەتی سزایی و مەدەنی، ئەم سێ خاڵەش بریتی یە لە:

**یەکەم/** جیاوازی یە سەرەکیەکانی نێوان بەرپرسیاریەتی سزایی و مەدەنی.

**دووەم/** ناساندنی ئەرەستۆ و بۆچوونە فەلسەفی یەکانی.

**سێیەم/** دە وتەزا(مەقولە) فەلسەفی یەکەی ئەرەستۆ.

# بەندی یەکەم:
# گرنگترین جیاوازی یەکانی نێوان بەرپرسیاریەتی سزایی و مەدەنی

ئەم دوو بەرپرسیاری یە لەوەدا یەکدەگرنەوە کە دوو جۆرن لەژێر چەتری یەك رەگەزدا کە بەرپرسیاریەتی رەهای یاسایی یە، بەڵام لە زۆر رووەوە جیاوازن وەك:

**یەکەم: لە رووی چیەتی( ماهییەت )ەوە:**

چیەتی بەرپرسیاریەتی سزایی بریتیە لە خستنەئۆباڵی پادلشتی بەجێنەهێنانی ئەرکێکی یاسایی، کە یاسایەکی سزایی دیاری دەکات، وەك یاسای سزاکان و یاسای بناغەکانی دادگاییکردنە سزاییەکان(بناغەکانی رێوشوێنگرتنەبەری سزایی) وە یاسای چاودێری نەوجەوانان و هەریاسایەکی تری سزایی. بەڵام چیەتی بەرپرسیارییەتی مەدەنی بریتیە لە قبوولکردنی بەجێهێنانی ئەرکێك بە خواست بێت یان بە زۆر، بە هۆی ئەم کارەوەش ماف کەسێکت دەکەویتە ئەستۆ تا ئەو ساتەی بە هۆی یەکێك لە هۆکارەکانی بەسەرچوونەوە بەسەر دەچێت.

**دووەم: لە رووی بابەتەوە:**

بابەتی بەرپرسیاریەتی سزایی، سزایەکی دڵماڵەری ئازادی یە وەك زینداني کردن، یان سزای پارەلێسەندن یان دەستبەسەرداگرتن، تاوانباریش پابەند دەبێت بۆ جێبەجێکردنی یەکێك لەم سزایانە. شوێنی پابەندبوون بریتی یە لە جێبەجێکردنەکە. بەڵام بابەتی بەرپرسیاریەتی مەدەنی مافێکی بەرجەستەی دارایی یە یان مافێکی کەسی یە، کە پێویستە لە سەر (کەسی پابەند) بە ویستی خۆی ئەو مافە بدات وەگەر نا بە زۆر لێی وەردەگیرێت، بە مەرجێك بەربەستێکی یاسایی نەبێت وەك ماوەبەسەرچوونی هەڵوەشێنەرەوە (التقادم المسقط).

## سێهەم: لە رووی جێگەوە:

جێگەی بەرپرسیاریەتی سزایی هەمیشە ملکەچکردن و تەسلیم بوون دەبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو سزایەی کە حوکمی لە سەر دراوە تاکو کۆتایی هاتنی ماوەی ئەم حوکمە، بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنی یەوە کە جێگەکەی بریتیە لە بەجێهێنان بە ولتا گشتیەکەی کە هەم کردار و هەم خۆگرتنەوە دەگرێتەوە، وەك راەدەستکردنی ئۆتۆمبیلی فروشراو بە کڕیارەکەی، وە رادەستکردنی نرخی شتی کڕاو بە فرۆشیار، وە وەك خۆگرتنەوە لەو کارەی کە پێویست بێت نەیکەیت، وەك پابەندبوونی فرۆشیار بە دوورکەوتنەوە لە فشار دروستکردن لە سەر کڕیار، کە پێی دەوترێت: زەمانەتی رۆرلێنەکردن.

## چوارەم: لە رووی هۆ(السبب)وە:

هۆی بەرپرسیاریەتی سزایی هەمیشە کارێکی نادروستی پێچەوانەی یاسای تاوانکاری یە، وەك کوشتن و دزی و ناپاکی لە ئەمانەت...هتد. بەلأم هۆی بەرپرسیاریەتی مەدەنی زۆریەی جار قسەیەك یان کردارێکی رەوایە هەروەك لە مامەڵە دارایی‌یەکاندا هەیە، وە هەندێکجار کارێکی ناڕەوا دەبێت وەك بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمی، وەك حاڵەتی فەوتاندنی سامانی کەسێك بەبێ پاساوێکی شەرعی و یاسایی.

## پێنجەم: لە رووی بناغەوە:

بناغەی بەرپرسیاریی سزایی بریتیە لە لادانی مەترسییەك بە هۆکارە پارێزییەکان پێش روودانی، یان لابردنی بە هۆکارەکانی چارەسەر پاش روودانی، وەك تاوانی دەست بەسەرداگرتن. لە کاتێکدا بناغەی بەرپرسیاریەتی مەدەنی بریتیە لە دوورخستنەوەی زیان پێش روودانی، وەك نەکردنی ململانێی نادروست، یان لابردنی زیان پاش روودانی بە قەرەبوو کردنەوەی دادپەروەرانە، هەروەك ئەو زیانانەی لە ئەنجامی کارە ناڕەواکانەوە پەیدا دەبن.

## شەشەم: لە رووی شیاویەتی یەوە:

شیاویەتی بەرپرسیاریەتی سزایی بریتیە لە شیاویەتی لە ئۆبالگرتنی ئەنجامی کارە نادروستەکان. دەستپێکردنی مێژووی ئەم بەرپرسیارێتییە یاساکان تیایاندا جیاوازن، لە هەندێکیاندا ئەم شیاویە لە سەرەتای حەوت ساڵییەوە دەست پێدەکات:

وەك یاسای لە (یاسای مەدەنی ئێستای میسر، ماددەی ٤٥).

لە هەندێکیشیاندا بە تەواوکردنی حەوت ساڵیە وەك یاسای مەدەنی کومیتی: بە تەواوکردنی حەوت ساڵ(ماددەی ٤٤).

هەشیانە پاش نۆ ساڵی دەست پێدەکات وەك

هەشیانە پاش نۆ ساڵی دەست پێدەکات وەك یاسای چاودێری نەوجەوانانی عێراقی: بە تەواوکردنی ٩ ساڵ(ماددەی ٤٧).

وە لە هەندێك یاسای تردا تەمەنی گەورەتر بە مەرج گیراوە. بەپێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنیەوە کە هەمان شیاویەتی پێویستبوونی(وجوب) کاملی بەرپرسیاری یە، کە بریتیە لە گونجان و بەکارهاتنی مرۆڤ بۆ ئەوەی مافی هەبێت و پابەندبوونی لەسەر بێت، وە ئەم ئەهلیەتەش لەگەڵ لەدایکبووندا دەست پێدەکات .

## حەوتەم: لەرووی سروشتی (پابەندبوو)ەوە:

پابەند بوو کەسێکی ئاسایی یان مەعنەوی یە، بەڵام بەرپرسیاریەتی سزایی بۆ کەسی مەعنەوی هێشتا جێگای مشتومڕی زانایانی یاسایە. بەڵام یەکدەنگی هەیە لای زانایانی یاسا کە بەرپرسیاریەتی مەدەنی هەیە بۆ کەسی مەعنەوی وەك دەوڵەت و کومپانیا و زانکو..هتد. وە بۆ کەسی سروشتیش وەك مرۆڤ [1]

---

[1] بۆ زانیاری پتر سەیری نووسینمان(موانع المسئولية الجزائية في الشريعة الاسلامية والتشريعات الجزائية العربية) لا ٢٧ و پاشتر .

## هەشتەم: لە ڕەی دیاریکردنی(پابەند بۆکراو)ەوە:

زۆر جار پابەندبۆکراو لە بەرپرسیاری سزاییدا کۆمەڵگەیە، چونکە تاوانکار یان دەستدرێژی دەکاتە سەر مافێکی گشتی یان مافێکی هاوبەشی نێوان تاك و کۆمەڵ وەك دزی، کە زیاترلایەنی گشتی زاڵترە. بەڵام لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا دەکرێت تاك بێت و دەشکرێت کۆمەڵێکی دیاریکراو بێت و دەشکرێت کەسێکی مەعنەوی بێت وەك دەوڵەت .

هەروەها پێویستە پابەندی بۆکراو لە بەرپرسیاریی سزاییدا هەمیشە (هەبوو) بێت و دیاریکراو بێت کە بریتی یە لە تاوان لێکراو، بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنی یەوە کە ڕەنگە پابەندبۆکراو هەبێت وەك (زەید ) ناوێك لە نێو خەڵکیدا ببێتە کرێاری سامانێکی دیاریکراو، ڕەنگە لە دۆخی نەبوونیشدا بێت وەك بیمەی ژیان بۆ منداڵێك کە لەدایك نەبووبێت.

## نۆیەم: لە رووی توخمی زیانی کردەکی یەوە:

بۆ بەدیهاتنی بەرپرسیاریەتی سزایی ڕوودانی توخمی زیان مەرج نیە، بەڵکو بوونی ترسی زیان بە مەرج گیراوە، بۆیە هەندێجار بەرپرسیاریەتی سزایی دروست دەبێت بە بێ ڕوودانی زیانێك لە تاك و کۆمەڵگە، وەك رێککەوتنی تاوانکارانەی پێش دەستپێکردنی تاوان، هەروەها وەك دەستپێکردن بە چوونەناوبۆزە تاوانکارییەکان کە تاوان هەیە بە بێ ڕوودانی زیانێك. بەڵام لە بەرپرسیاریی مەدەنیدا توخمی زیان پایەیەکی گرنگە بەتایبەت لە بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمیدا.

## دەیەم: لە رووی نیازی تاوانکارییەوە:

ئەمەش پایەیەکی گرنگە لە تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر ئازایی و ئاسایشی خەڵك، لە بەرپرسیاریەتی سزاییدا. هیچ تاوانێکی ئەنقەستی نیە لە یاسادا ئەگەر توخمی نیازی تاوانی تێدا نەبێت کە پێی دەوترێت پایەی مەعنەوی، جگە لە تاوانی کەسەکان، وەك تاوانەکانی تۆڵەی کوشتنەوە و بڕاندنی ئەو زیانانەی بە لەشی مرۆڤ دەگات کە توخمی نیەتی تاوانکاری بەمەرج نەگیراوە، بەڵام لە تاوانەکانی تردا هەمووی بە ئەنقەست ئەدەنرێت. بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنیەوە کە بە بێ نیازی تاوانکاری دەبێت وەك ئەوەی کەسێك ئازایی کەسێکی تر بە کەمتەرخەمی بفەوتێنێت، یان بە بێ هەبوونی نیازی تاوانکاری وەك ئەوەی کەسێکی بێ ئاوەزی وەك منداڵی بێ تەمیز و شێت یان کەسێك حوکمی ئەوانی بۆ ئەدرێت، سامانی کەسێك بفەوتێنێت، ئەم فەوتێنەرە پێویستە زیانەکە

ببژێرێت، چونکە بناغەی مەسەلەکە زیانەکەیە، ئیتر نیازی تاوانکاری هەبێت یان نا. بۆیە تـوخمەکانی بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمی بریتییە لە(کاری نادروست + زیان + هۆکارە پەیوەندی).

## یازدەهەم: لە رووی مافی جوولاندنی داواوە:

لە بەرپرسیاریەتی سزاییدا ئەگەر تاوانلێکراو داواکەی نەجوولاند ئەوا دەستەی داواکاری گشتی دێتە جێی و داواکە دەکات، بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنی کە کەس دژی پابەند داوا ناجولێنێ جگە لە (پابەندییۆکراو) یان بریکارەکەی بە رێکەوتن یان بەهۆی دادگاوە یـان لـە رێـی یاسـاوە، جـا ئەگـەر ئەوکەسەی ماف جولاندنی داوای مەدەنی هەیە لایەنی بێدەنگی هەڵبژارد ئیتر کەس بۆی نیە ئەو داوایە بجولێنێت دژی قەرزار. وە نهێنی ئەم جیاوازیە ئەوەیە کە مافی ئەو کەسەی دەستدرێژی کراوەتە سـەر لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا مافێکە تایبەتە بە تاك یان بە کۆمەڵێکی دیاریکراو، بەڵام لە بەرپرسیاریەتی سزاییدا بابەتی پابەندبوون مافێکی گشتی یە یان مافێکی هاوبەشە و لایەنە گشتی یەکەی زاڵترە .

## دوازدیەم: لە رووی سروشتی پاداشتەوە:

پاداشت لە بەرپرسیاریی سـزاییدا یـان لەسێدارەدانە یـان زینـدانی یـان بەنـد کردنـە یـان دەست بەسەرداگرتنە یان غەرامەی دارایە. بەڵام پاداشت لە بەرپرسیاریی مەدەنیدا بریتیە لە قەرەبووکردنەوە بە دارایەکی هاوونە لەو شتانەدا کە هاووێنەیان هەیە یان بە (نرخ)بۆ ئەو شتانەی دەنرخێنرێن.

## سیازدیەم: لە رووی فەلسەفەی پاداشتەوە:

فەلسەفەی سزا لە بەرپرسیارێتی سـزاییدا بریتیـە لـە نەهێشـتنی تـاوان بـە چـاککردنی تاوانکـار و ترساندنی تایبەت(تاوانکار وەهای لێبکرێت کە جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ تاوان )

وە ترساندنی گشـتییش ئەوەیە(خـەڵکی وەهـا لـێ بکـەیت کـە چـاو لـە تاوانبـار نەکـەن). بـەڵام فەلسەفەی پاداشت لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا بریتیە لە بژاردنی زیانێك کە تووشی ئەو کەسـە بـووە کە(پابەندبوونێکی بۆ کراوە) یـان قەرەبـووکردنەوەی قازانجێك لـە کارەکەیدا کـە بـە هـۆی کەسـی پابەندەوە.

## چواردەیەم: لە رووی بیمەوە:

لە بەرپرسیاریەتی سزاییدا، بیمەکردن دژی تاوانی دەستدرێژیکردنەسەر ژیانی (بیمە بۆ کرلو) دروست نیە، یان ژیانی ئەوکەسەی بیمەکە بە قازانجی دەکرێت، چونکە سروشتی بابەتەکە بیمە ناگرێتە خۆی. بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنیەوە، بیمە کردن دروستە بەرانبەر زیان، وەك بیمە کردن لە بەرانبەر ئاگرکەوتنەوە یان کارەساتی سروشتیدا.

## پازدەیەم: لە رووی دیاریکردنی کارە نادروستەکانەوە:

لە بەرپرسیاری سزاییدا یاساکانی تاوان لە هەموو ولاتاندا کردەوە تاوانکاریەکانیان بەپێی ئەم بنەمایە دیاری کردووە(تاوان و سزا تەنها بە دەق دیاری دەکرێت). کەواتە قازی و موجتەهید بۆیان نیە لە رێگای تەفسیر و پێوانەکردن(قیاس)ەوە دەقەکانی تاوان فروان بکەن بە شێوەیەك کە تاوانێکی نوێ بدۆزنەوە کە یاسا بە دەقێك دیاری نەکردبێت یان سزایەکی نوێ کە لە یاسای سزاکانا دیاری نەکرابێت. بەڵام لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا ئەو کردەوە نادروستە زیانبەخشانەی دەبنە هۆی پێویستبوونی قەرەبووکردنەوە سنوردار نین لە یاسادا، کەواتە هەرکەس کارێکی زیانبەخش بکات کە پاساوێکی نەبێت ئەوا یاسا پابەندی دەکات بەوەی کە جێگرەوەیەکی دارایی بدات، هاووێنە بێت لەو شتانەدا کە هاووێنەیان دەدرێت و نرخ بێت لەو شتانەدا کە دارایە نرخییەکانن.

## شازدەیەم: لە رووی ئەندازەی سزای کەسی پابەندەوە بەهۆی جێبەجێنەکردنی ئەرکێکی یاساییەوە:

سزا لە بەرپرسیاریەتی سزاییدا پێشتر دیاریکراوە بە چەند سزایەکی تایبەتی دیاریکراو لە یاسای سزاکاندا، بەڵام ئەم پاداشتە رەنگە لە لایەن یاساوە لانی کەم و لانی زۆری ئەو سزایە دیاری بکرێت و دەسەڵاتێکی خەمڵێنراو دەدات قازی کە لانیکەمی حوکم یان نزیکەی بەکار بهێنێت ئەگەر دۆخی پەیوەند بە تاوانەکەوە یان تاوانبارەوە مەترسییەکی تێدا بێت بە قازانجی تاوانکار . یان قازی حوکم دەردەکات بە ئەوپەڕی حوکم یان نزیك لێوەی ، ئەگەر دۆخەکە دژی قازانجی تاوانکار بوو ، یان تەنها یەك ئاستی حوکم بەکاردەهێنێت . بە پێچەوانەی ئەندازەی پاداشت لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا ، کە ناتوانرێت پێش رووداني زیانەکە ئەندازەکەی دیاری بکرێت ، چونکە ئەم پاداشتە چ دارایەکی وێنەدار

بێت یان نرخێك بێت وەك دراییە نرخی یەکان ، ئەندازەکەی دەگۆڕێت بە پێی ئەندازەی زیانەکەی پاش رووداني و پاش خەملاندنی لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە.

## حەڤدەیەم: لە رووی پەیوەندگەی داواوە:

ئاشکرایە کە پەیوەندییوون بە دواوە لە بەرپرسیاریەتی جەزاییدا(کە کەسی دوا لە سەرتۆمارکراوە) کەسە تاوانکەرەکەیە، جا ئەگەر شایستەیەتی نەما بە مردن یان بە شێتبوونی هاوکات لەگەڵ تاوانەکەدا، ئەوا دواکە هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر شێتییەکە پاش تاوانەکە بوو، ئیتر کارەداگاییەکانی لە مێژووی شێتبوونەکەوە رادەگیرێت. وە ئەگەر شێتیەکە هەمووکات و بەردەوام بوو تا کاتی مردن، ئەوا دواکە هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام ئەگەر شێتیەکە تاوتاو بوو ئەوا کارەداگاییەکان لەو خاڵەوە دەست پێدەکات کە راوەستاوە. بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنیەوە کە زەمانەتی بابەتی پابەندبوونەکە بریتیە لە دارایی قەرزارەکە و پاش مردنی دەگوازرێتەوە بۆ میراتەکەی و پێویستە پێش دابەشکردنی داراییەکەی ئەو قەرزەی لێدەربکرێت. سەرەڕای ئەوەی ئەومیراتیەی قەرزی لەسەرە دەبێتە سامانی میراتبەرەکان، بەڵام هەر بەکارهێنانێکی ئەو دراییە دەبێ پاش دانەوەی قەرزەکان بێت یان پاش مۆڵەتی خاوەن قەرزەکان.

کەواتە ئەو بنەمایەی کە دەڵێت(تا قەرزەکان نەدرێتەوە میرات نیە) واتای ئەوەیە کە نابێت میراتی بەکار بهێنرێت تا قەرزەکان دەدرێتەوە.

## هەژدەیەم: لە رووی هەڵەی (گریمانەکراو)ەوە:

لە بەرپرسیاریەتی سزاییدا حساب بۆ هەڵەی گریمانکراو ناکرێت، بۆ نموونە هیچ کەسێك ناخرێتە ژێر پرسیارەوە بە هۆی تاوانی شوێنکەوتەیەکیەوە بە پێی بنەمای(کەسایەتی سزا لە یاسادا) کە قورئان سەدان ساڵ پێشتر بە روونی لە چەندین ئایەتدا باسی کردووە، بۆ نموونە﴿ولا تزر وازرة وزر أخرى﴾ الانعام ١٦٤ . واتە کەس باجی تاوانی کەسێکی تری ناکەوێتە سەر . بە پێچەوانەی بەرپرسیاریەتی مەدەنییەوە، بۆ نموونە بە پێی یاسای مەدەنی خاوەن کارگەیەك بەرپرسە لەو زیانەی یان تێکچوونە جەستەییە هەمیشەییەی تووشی کرێکارێك دەبێت لەکاتی کارکردنیدا لە کارگەکەیدا. بە هەمانشێوە ئەگەر شوێنکەوتوویەك لە کاتی کارکردنیدا بۆ خاوەنکارێك زیانی گەیاند بە کەسێکیتر ئەوا خاوەنکارەکە لە زیانەکە بەرپرسە، بۆ نموونە وەزارەت بەرپرسە لەو زیانەی کە لە سەردەستی یەکێك

لە کارمەندەکانی رووداوەکان لە کاتی دەولەمدا، بـەپێی بنـەمای(الغرم بـالغنم، واتـە: لەکاتێکدا قازانجـت دەوێت لەکارێکدا، دەبێت ئەو زیانەش قبوول بکەیت کە لـەو کـارەوە تـووشت دەبێـت)، چـونکە لـە کاتێکدا قازانج بۆ خاوەن بێت، پێویستە زیانیش بگرێتە ئەستۆ. دیارە ئێمە ئەو هەڵـە گریمـانکراوە بـە راست نازانین کە یاسای دادوەری فەرەنسی پاش شۆڕشی پیشەسازی ئەوروپا هێنایە کایەوە و بڕیاری داوە کە هەڵەیەکی گریمانکراو لە لایەنی خاوەنکارەوە لەئارادایە گەرچی لە راستیدا بوونی نیە. ئـەوەی شایانی باسە بنەمای(الغرم بالغنم او الغنم بالغرم) لە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامە کە بـە سـەدان سـاڵ پێش یاسا هێناویەتیە ئاراوە.

## نۆزدەیەم: لە رووی پسپۆڕیی دادوەریەوە:

دەسەڵاتی سەیرکردن و یەکلاکردنەوەی دۆزە سـزاییەکان تـەنها لـە لایـەن دادگـای تاوانەکانـەوە دەبێت. بە پێچەوانەی دۆزە مەدەنیەکانەوە، کە لە دادگا مەدەنیەکاندایە. کەواتە دادگـای تاوانەکان بۆیان نیە سەیری ئەو دۆزانە بکەن کە بەرپرسیاریەتی مەدەنی هەیە مەگەر سەر بە بەرپرسیاریەتێکی سـزایی بێت، وەك ئەو تاوانانەی پەیوەندی بە داراییەوە هەیـە، لـە نموونـەی دزی و دەگیرکـردن و ناپـاکی لـە ئەمانەت ...هتد. لەم حاڵەتەدا دادگای تاوانەکان بۆی هەیە سەیری بکات وەك پاشکۆی سەیرکردنی لـە رووی تاوانەوە. (بەڵام بێتاوانناسـاندنی تاوانکـەر لـە تۆمـەتی تاوانکـاری ئـەوە ناگەیـەنێت کـە بڕیـاری بێتاوانبـوونی لە تۆمەتی مەدەنی بۆ دەرچێت)، لەسەر داوای کەسـی (پابەندیـو بـۆکراو) لـە هەنـدێك یاسادا وە بە بێ داوای ئەویش لە هەندێك یاسای تردا...

## بیستەم: (بەسەرچوونی کات)ی هەڵوەشێنەرەوە:

لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا داوای یاسایی هەڵدەوەشێتەوە پـاش تێپەڕبـوونی مـاوەی سـاڵێك تـا پانزەساڵ بەسەر مافی داواکراودا(بابەتی داواکە) بە بێ ئـەوەی قـەرزدەر یـان بریکارەکـەی ئـەم داوایـە بکەن. بەڵام بەرپرسیاریەتی تاوانکاری جیاوازە لە بەرپرسیاریەتی مەدەنی هـەم لـە رووی ماوەکـەوە و هەم لە رووی فراوانی بواری بەکارهێنانی ئەم بەسەرچوونەوە. بۆ نموونە لە یاسـای ئێسـتای سـزادانی عێراقیدا لە بابەتی تاوانی زینای یەکێك لە هاوسـەران(ناپاکی هاوسـەری) لـە دەقـی مـادەی (٣٧٨) دا دەڵێت: ئەو شکاتە وەرناگیرێت کە سێ مانگ تێپـەڕ بـووبێت بـە سـەر ئـەو رۆژەدا کـە سـکاڵاکار بـە تاوانەکەی زانیـوە. هەندێکیش لە یاسا جەزاییەکان ئەم جۆرە تێپەڕبوونەیان بەکارهێناوە، وەك یاسای

ئێستای ڕێوشوێنی سزایی میسری، کە لە مادەی (١٥) دا دەڵێت( لە مادە تاوانیەکاندا بە تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر ڕوودانی تاوانەکەدا، وە بە تێپەڕبوونی سێ ساڵ لە تاوانە بچووکەکاندا، وە لە مادەکانی سەرپێچیدا بە تێپەڕبوونی ساڵێك، بە مەرجێك دەقێکی یاسایی دژی نەبێت).

وە هەڵوەشاندنەوەی سزا بە تێپەڕبوونی کات لە مادەی(٥٢٨) باس کراوە کە دەڵێت(حوکمی ئەو سزایەی کە دەرکراوە پاش تێپەڕبوونی بیست ساڵ هەڵدەوەشێتەوە، جگە لە سزای لەسێدارەدان، کە بە تێپەڕبوونی سی ساڵ هەڵدەوەشێتەوە و حوکمی سزای تاوانی بچووکیش بە پێنج ساڵ وحوکمی سزای سەرپێچیش بە تێپەڕبوونی دووساڵ هەڵدەوەشێتەوە).

یەکێکیش لەو یاسا سزاییانەی بە هیچ شێوەیەك بەسەرچووندا هەڵوەشێنەرەوەی سزای قبووڵ نەکردووە، چ لە دوای سزایدا و چ لە سزاکاندا، یاسای ئینگلیزی یە و باوەڕی بە فەلسەفەی بەسەرچوون نیە، کە لە سەر لەبیرکردنی تاوان و حوکمی تاوان بونیادنراوە.[1]

## بیست و یەکەم: لە ڕووی دەسەڵاتی دادگاکان و بەڵگەبوونی فەرمانەکان:

یاسادانەر سەرپشکییەکی زۆرتری بەخشیوەتە دادگا سزاییەکان بۆ گەڕان بە شوێن ڕاستیەکاندا کە ئەم ئەندازە زۆرەی سەرپشکیەی بە دادگاکانی بەرپرسیارییەتی مەدەنی نەداوە، وە بڕوای وەهایە کە ئەو بەرپرسیارییە داوەرییانەی لە بڕیارەکانی دادگا سزاییەکاندا هەیە لە ڕاستی یە واقیعیەکانەوە نزیکترە و دادگا مەدەنیەکان لەم ئاستەدا نین، بۆیە بەڵگەبوون(حوجییەت)ی بەخشیە فەرمانی دادگای تاوانکاری لە داوا مەدەنیەکاندا لەو ڕووداوانەدا کە سەلماندوویەتی و سەلماندنەکانی ئەم دادگایەی بەپێویست داناوە بۆ یەکلاکردنەوەی داوا گشتییەکان، بەڵام هیچ بەڵگەبوونێکی نەبەخشیە حوکمی دادگا مەدەنیەکان لە داوا گشتیەکاندا. بۆ نموونە: ئەگەر دادگای تاوانەکان تاوانباربوونی گومانلێکراوی دەرکرد ئەوا پێویستە لەسەر دادگای مەدەنی کە هەڵەکەی بە نەگۆڕ بزانێت، وە پێویستی دەکات لەسەر تاوانکار کە قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە لەسەری جێگیر بووە، بەڵام ئەگەر دادگایەکی

---

[1] سەیری نوسراوی دوکتۆر محمود محمد مصطفی، شرح قانون العقوبات المصري، القسم العام چاپی یەکەم، ساڵی ١٩٨٣، لا ٦٩١ و دواتر، الالتزام في ضوء الفلسفة القانون، نوسەر، لا١٠٢ و پاشتر.وە یاسای (چاودێری نەوجەوانان)ی ئێستا، مادەی ٤٧، یاسای ئێستای سزادانی عێراقی، مادەی ٢٥.

مەدەنی حوکمی کرد بە سەر کەسێکدا کە قەرەبوو بدات، حوکمەکەی دادگای تاوانەکان ناچار ناکات بە هەمان حوکم.

راجیاییەکیش هاتۆتە ئاراوە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە ئەگەر دادگای تاوانەکان بریاری بێتاوانی بۆ کەسێك دەرکرد لەبەر نەبوونی هەڵەی تاوانکاری یان بەسنەبوونی بەلگەکان، ئایا ئەمە دەبێتە بەلگە بەسەر دادگای مەدەنییەوە کە ئیتر نەتوانێت شکاتلێکراو ناچار بکات بە قەرەبووکردنەوە یان نا؟

یاسادانەری میسری ئەم راجیاییەی یەکلا کردۆتەوە بە دەقی یاسایی لە مادەی(٤٥٦)دا و بریار دەدات کە پێویستە حوکمی بێتاوان بوون لە دوا تاوانکاریەکاندا هێزی حوکمێدراوی هەبێت لە بەردەم دادگا مەدەنیەکاندا، چ لەسەر نەبوونی گومان بوونیات نرابێت یان لەسەر بەسنەبوونی بەلگەکان.[1]

## بیست و دووەم: لە رووی سروشتی توخمەکانی هەڵەوە:

أ ـ هەڵە لە بەرپرسیاریەتی تاوانکاریدا بریتی یە لە بەجێنەهێنانی ئەرکێکی یاسایی کە یاسای تاوانکاری دیاری کردووە و لە دوو توخمی مادی و مەعنەوی پێك دێت:

١ ـ توخمی مادی بریتیە لە بەجێنەهێنانی ئەو ئەرکەی کە یاسای تاوانکاری دیاریکردووە.

٢ ـ توخمی مەعنەوی بریتیە لە تێگەشتن لە کەسی (ئەرك بەجێنەهێن) بەوەی کە ئەرکێکی یاسایی بەجیٚ نەهێناوە.

ب ـ بە پێی فیقهی رۆژئاوایی و ئەو یاسایانەی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەو، وەك یاسای میسری و یاسای تریش، هەڵە لە بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا لە دوو توخمدا دەبینینەوە:

١ ـ توخمی مادی کە بەجێنەهێنانی ئەرکێکی یاساییە.

٢ ـ توخمی مەعنەوی کە بریتیە لە تێگەشتن لە کەسی (ئەرك بەجێنەهێن) بەوەی کە ئەرکێکیاسایی بەجیٚ نەهێناوە.

---

[1] بۆ وردەکاری زیاتر لەم بارەوە سەیری پەرتووکی(الوافي في شرح القانون المدني المصري (٩/٢)لە بەشی (پابەندبوونەکانەوە)بەرگی دووەم، لە کردەوەی زیانبەخشدا لە بەرپرسیاریەتی مەدەنی، بەشی یەکەم لە حوکمە گشتیەکاندا، نووسینی سلیمان مرقس. لا ٧ و پاشتر .
هەروەها سەیری (اصول الاثبات وأجرائاته) بەرگی ٢، لا ٩ و پاشتر، هەمان نووسەر.

بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی لەژێر کاریگەری ئەودان، وەك یاسای عێراقی[1] ئەوا بوونی هەڵە لە سەر ئەو دووتوخمە نەوەستاوە و تەنها توخمی مادی بەسە، بە واتای بەجێنەهێنانی ئەرکێکی یاسایی کەهاووڵاتای(مرلف) کردنی کارێکی نادروستە، جا ئەوکەسەی نادروستیەکەی کردووە بزانێت یان نەزانێت.

گرنگی جیاکردنەوەی هەڵەی تاوانکاری و هەڵەی مەدەنی بۆ بەڵگە بوونی فەرمانی تاوانکاریی لە بەردەم دادگای مەدەنیدا دەردەکەوێت، ئەگەر ئەم فەرمانە دەرچێت پێش ئەوەی دادگای مەدەنی بڕیاری یەکلاکەرەوە بدات لەم بابەتەدا، ئەگەر دادگای تاوانەکان گومانلێکراوی بە تاوانبار ناساند، ئەوا ئەو حەکمە رووبلنی هەڵەیەکی تاوانکارانەی خستۆتە سەری، چونکە هەڵەی تاوانکارانە دژە لەگەڵ دەقێك لە دەقەکانی یاساکانی سزادانا.

بەڵام ئەگەر دادگا گومانلێکراوی بە بێتاوان دەرکرد لەبەر ئەوەی کە هەڵەیەکی تاوانکارانەی نەکردووە، ئەوە ناگەیەنێت کە هەڵەکەی بە هەڵەیەکی مەدەنی نەزانرێت، لەبەر ئەو هۆکارەی کە پێشتر وتمان کە ئەو ئەرکانەی جێبەجێنەکردنیان هەڵەی مەدەنیە زۆرتر و گشتیترن لەو ئەرکانەی کە جێبەجێنەکردنیان بە خراپەکارییەکی تاوانکارانە دادەنرێت[2].

سروشتی ناوەرۆکی ئەم بەشە دابەش نابێت بەسەر چەند باسگەیەکدا، بۆیە تەنها یەك بەشمان کردە ناونیشانی.

[1] هەروەك لە مادەی ١٩١ لە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقیدا هاتووە.

[2] دوکتۆر سلیمان مرقس، الوافی فی شرح القانون المدنی،هەمان سەرچاوە ٢٧٨/٢ و پاشتر.

# بەندی دووەم:
# ناساندنی ئەرەستۆ و بۆچوونە فەلسەفیەکانی

توێژینەوە لەسەر ئەم بابەتە دابەش دەکرێت بە سەر سێ باسدا، یەکەمیان بۆ ناساندنی ئەرەستۆ، دووەم بۆ فەلسەفەی سۆکرات و سێهەم بۆ دە وتەزا(کاتیگۆری)کانی ئەرەستۆ.

## باسگەی یەکەم:
## ناساندنی ئەرەستۆ[1]

ئەرستۆ (Aristot l.s)یان (Aristot lis) 384 _ 322 پ.م

لە شارۆچکەی ستاجیرا(یان ستاغیرا) لە تراقیای باکووری یۆنان لە دایك بووە و کوڕی پزیشك(نیکوماخۆس (Nicomachus/بووە، کە پزیشکی ئەمینتاسی دووەم پاشای مەکدۆنیا بووە. ئەرەستۆ لە تەمەنی منداڵیدا بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە و لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا رۆشتووە بۆ شاری ئەسینا و بووەتە قوتابی ئەفلاتون(گەورە

---

[1] دەربارەی ئەرەستۆ سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

١ ـ النجاة لابن سینا لا ١٥٧ ـ ١٦٦.

٢ ـ الموسوعة الفلسفیة المختصرة، وەرگێڕانی لە ئینگلیزیەوە، فوئاد کامل و جەلال العشری و عبدالرشید الشادق. وە دوکتۆر زەکی نەجیب مەحمود پێیدا چۆتەوە و سەرپەرشتی کردووە و هەندێك کەسایەتی ئیسلامی بۆ زیاد کردووە، لا ٣٢ و پاشتر.

٣ ـ الموسوعة الفلسفیة _ لیژنەیەك لە زانایانی ئەکادیمی سۆڤیەتی دایان ناوە و مرووزنتال.ب یودین سەرپەرشتی کردووە و سەمیر کەرەم وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی _ دار ال، بەیروت لا ١٩ و پاشتر.

٤ ـ الموسوعه الفلسفیه، د.جەمیل صلیبا.

٥ ـ الفلسفة الاخلاقیة الافلاطونیة عند مفکري الاسلام. د.ناجي التکریتي لا ٨١ و پاشتر.

فەیلەسوفی یۆنان٤٢٧–٣٤٧پ.ن) لە ئەکادیمیادا. لەوێ سەرنجی ئەفلاتوونی مامۆستای ڕاکێشا، بۆیە ناوینا (ژیری) لەبەر زۆر زیرەکی و بە ( خوێنەوار) لەبەر زۆر شارەزایی.

وە تا کاتی مردنی ئەفلاتون لەو ئەکادیمیایەدا مایەوە، پاشان پێی خۆش نەبوو لەو ئەکادیمیایەدا بمێنێتەوە کە برازایەکی ئەفلاتون سەرەڕای ئەوەی کە فەیلەسوفێکی لێهاتوو نەبوو سەرۆکایەتی گرتە دەست. بۆیە ئەسینای بەجێهێشت بەرەو ئەسۆس لە ئاسیای بچووك و چوویە ناو کۆمەڵێك لە قوتابیانی ئەفلاتون و ژنی هێنا و سێ ساڵ لەوێ مایەوە،پاشان رۆشت بۆ میتیلینا لە لیبۆس و لە دەوروبەری ٣٤٢ پ.م دا پادشای مەکۆنیا (فیلیپ) بانگی کرد بۆ ئەوەی ببێت بە مامۆستای پەروەردەی کوڕەکەی(کە لە مێژوودا بە ئەسکەندەری گەورە ناسراوە) و بۆ ماوەی سێ ساڵ مایەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی(ستاغیرا) و پێنج ساڵ مایەوە. لە ساڵی ٣٣٥ پ.ز دا گەڕایەوە بۆ ئەسینا و بە یارمەتی قوتابی و هاوڕێی خۆی(تیۆفراستۆس) قوتابخانە بەناوبانگەکەی کردەوە کە ناوی(lyeeum )بوو و بە(لووکیەکان) یان (بریباتۆس) ناسراوە و بە ناوی خۆیەوە ناونراوە و لەوماڵەدا پیادەڕێیەکی سێبەر هەبوو کە لەوێدا بەدەم هاتووچووکردنەوە وانەی بە قوتابیەکانی دەوت، تا ئەو رادەیەی قوتابخانەکە بە قوتابخانەی(هاتوچۆکەران) ناونرا و ئەرەستۆ و شوێنکەوتوانی هەمان ناویان بە سەردا برا. سەرەڕای ئەوەی ئەرەستۆ خەریکی رامیاری نەدەبوو و لە مەکۆنیەکانیش نەدەچوو، بەڵام هەر بوختانی بێباوەڕییان بۆ هەڵبەست، ئیتر قوتابخانەکەی دایە دەستی تیۆفراستۆس و ئەسینای بە خەمباری بەجێهێشت وتی(نامەوێت هەلێکی تر بە ئەسینابیەکان ببەخشم کە تاوان دژی فەلسەفە بکەن) وەك ئاماژەیەك بۆ تاوانی لە سێدارەدانی سۆکراتی (٤٦٩ ـ ٣٩٩ پ. م)مامۆستای ئەفلاتون، کە فەیلەسوفی یۆنانی خەڵکی ئەسینا بوو.

دوای ئەوە رۆشت بۆ (خلقیس) لە دوورگەی (ئوبا) و پاش ساڵێك لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا وەفاتی کرد و سامانێکی گەورەی فەلسەفی بۆ مرۆڤایەتی بەجێهێشت، زۆربەی دانراوەکانی سەردەمی لاوی فەوتاوە جگە لە ناوەکانی و هەندێك کۆپلەی وەرگیرلو، کە وادیارە ئەفلاتوونی بووە و لە سەر شێوازی گفتوگۆ بووە. بەڵام زۆربەی دانراوەکانی سەردەمی پیری ماوون.

هەندێك لە لێکۆڵەران[1] گەشەی فەلسەفی و زانستی سۆکراتیان کردووە بە سێ بەشەوە:

١- پێش ساڵی ٣٤٧ پ.ز. ئەوکاتەی زۆر دلگەرمی هەبوو، بەلای ئۆگمایدا دەڕۆشت بە گەرمی بەرگری لە بۆچوونەکانی ئەفلاتوون دەکردوو باوەڕی بە تیۆریی ( ئایدیاکان ـ نموونەکان یان وێنەکان) هەبوو، وە باوەڕی بە تێگەشتنی ئەفلاتون هەبوو دەربارەی رۆح پێش ساڵی ٣٤٧ پ.ز. ئەوکاتەی زۆر حەماسەتی هەبوو، بەلای ئۆگمادا دەڕۆشت بە گەرمی بەرگری لە بۆچوونەکانی ئەفلاتون دەکردو باوەڕی بە تیۆری ئایدیاکان هەبوو، وە باوەڕی بەتێگەشتنی ئەفلاتون هەبوو دەربارەی رۆح و بە شێوازی مامۆستاکەی مامەڵەی لەگەڵ بابەتە فەلسەفیەکاندا دەکرد. دانراوەکانی سەردەمی لاوی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم سەردەمە کە بۆ جەماوەری دەنووسی و لەسەر شێوازی گفتوگو دایدەڕشت.

٢- قۆناغی دووەم لە گەشەسەندنی فیکری(٣٤٧ _ ٣٣٥ پ.ز) کە لە بەرانبەر ئەفلاتونی مامۆستای وەستایەوە و بە توندی رەخنەی لێگرت و بە تایبەتی لە تیۆری ئایدیاکاندا و لەم قۆناغەدا پەرتووکی (دەربارەی فەلسەفە) ی نووسی.

٣- لە قۆناغی پاش ٣٣٥ پ.ز دا رووی لە توێژینەوەی زانستیی ئەزموونی کرد و بە تەواوی تۆزی ئەفلاتوونی میتافیزیکی لەخۆی تەکاند. ئەوەی شایانی باسە کە ئەرەستۆییەت لەسەر ئەنجام و رێنوماییەکانی نەوەستاوە، بەڵکو نرخی باڵای ئەرەستۆییەت لە میتۆدە شیکاریەکەیدایە.

وا لە بەشی داهاتوودا بە کورتی رلو تیۆریەکانی باس دەکەین وەك سەرەتایەك بۆ خستنە رووی ئەو بابەتانەی لە سەر فەلسەفەکەی بونیاد دەنرێت.

---

[1] موسوعة الفلسفة والفلاسفة/د.عبدالمنعم الحفني١/١٢٤.

# باسگەی دووەم:
# بۆچوونەکانی ئەرەستۆ

لێرەدا بە کورتی گرنگترین بۆچوونە فەلسەفیەکانی ئەرەستۆ باس دەکەین:

## یەکەم: هیولا و فۆرم:

فەیلەسووفەکان لەسەر دیاریکردنی سروشتی پێکهێنەرەکانی بوونەوەرەکانی گەردوون. هەندێکیان رایان وایە کە لە دووبەش پێك دێت: هیولا(هەویری بوون) و فۆرم(شێوە). هەندێکی تر پێیان وایە کە لە گەردیلەی دابەشنەبوو پێك دێن. وە زانستی نوێ رای دووهەم پەسەند دەکات، بەلام فەیلەسووفە کۆنەکان _ ئەرەستۆش لە پێشیانەوە_ لەسەر رای یەکەم بوون.

وشەی هیولا وشەیەکی یۆنانیە و مەبەست بناغە(ئەسڵ) یان بە واتای مادە دێت.

لە زاراوەی فەلسەفیدا (تواناکە)جەوهەرێکە لە تەندا توانای وەرگرتنی دۆخی پێکەوە بوون و جیابوونەوەی پێ دەبەخشێت.

## دووەم: هەبوو لە دۆخی هێزەکی ( القوه) و لە دۆخی کردەکی (الفعل)دا:

هەبوو(الموجود) لە دۆخی هێزەکی -(بالقوه/بالامکان)دا (نەبوو)ە، بەلام زەمینەی ئەوەی تێدایە کە بێتە بازنەی بوونەوە و بە کردار ببێتە بوونەوەر. ئەرەستۆش هەبووەکانی گەردوونی بۆ ئەم دوو جۆرە دابەش کردووە، بوون لە دۆخی توانای بووندا و بوونی داکەوتەیی(واقعی)، بۆ نموونە ناوکی خورما درەختی خورمایە گەر لە دۆخی (هێزەکی)ەوە ببینیت، بە هەمانشێوەش تۆوی درەختی بەروو، وە منداڵیش پاش لەدایکبوونی تا ماوەیەك هۆشمەند و قسەکەرە، بەلام نەك بە کردار بەڵکو لە دۆخی (هێزەکی)دا، واتە ماوەیەکی دەوێت تا دەگاتە قۆناغی کردار.

کەواتە کاغەزی سپی هێزی ئەوەی تێدایە کە ببێتە نامەیەك، بۆیە دەتوانین بڵێین کە لە توانای بووندا نامەیە، بەڵام پاش نووسین لە ناویدا نامەیەکی ئامادەیە. بەم شێوەیە هەموو بوونەوەرە دروستکراوەکانی ئەم گەردوونە کە پاش نەبوون دێنە بوونەوە، پاڵپشت و لوان و توانستی بوونی واقیعییان تێدایە. وە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان ئەو دوو رووبەرانبەرەی(تقابل) کە لایەکی هێزی توانای بوونە و لاکەی تری بوونە بە کردار، هەروەها ئەو دوو رووبەرانبەرەی کە لایەکی هیولایە و لایەکەی تری شێوەیە.

هیولا ئەو شتەیە کە لەبارەیدا هەیە کە شێوە لە خۆ بگرێت و شێوەش بریتی یە لە کرداری بوونی ئەم توانایە کە ئەمانج و بەرهەمی هێزی توانای بوونە. هەموو تەکنەلۆجیا نوێکان و ئەو داهێنانانەی کە بەدیهاتووە لە سەردەمی نوێدا و لە داهاتوودا لە سەر ئەم تیۆریە بونیادنراوە.

## سێهەم: چوار بایسەکە (العلل الاربع):

ئەرەستۆ باوەڕی وەها بوو ـ لەم بۆچوونەشیدا راست بوو ـ کە هەموو ئەو رووداوە خۆویستانەی مرۆڤی هۆشیار و بە ئاگا و ئامانجدار بەرهەمی دەهێنێت لە کایەی تواناوە بۆ کایەی کردار، چوار هۆکاری هەیە: بکەرە بایس(العلة الفاعلة) ، مادديیە بایس (العلة المادية)، شێوەییە بایس (العلة الصورية)، ئامانجە بایس (العلة الغائية).

بۆ نموونە ئەو کورسیەی مرۆڤ لە سەری دادەنیشێت، بکەرەبایسەکەی دارتاش یان دروستکەرەکەیەتی و مادییەبایسەکەی تەختە یان کانزایە و شێوەییەبایسەکەی بریتیە لەو شێوەیەی پاش دروستبوونی وەریدەگرێت و ئامانجە بایسەکەشی دانیشتنە لە سەری.

کەواتە ئەو یاسایەی کە یاسادانەر دایدەنێت: بکەرەبایسەکەی دەسەڵاتی یاسادانەرە و مادییەبایسەکەی وشەکانیەتی و شێوەییەبایسەکەشی ئەو فۆرمەیە کە لە پاش پێکەوەنانی وشەکانی و دارشتنی لە شێوەی مادە و بەندی یاساییدا دەردەکەوێت، ئامانجەبایسەکەشی بەدیهێنان و رێکخستن و پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەو کۆمەڵگەیە کەوا ملکەچی ئەم یاسایە.

## چوارەم: پۆلێنکردنی زانستەکان:

ئەرەستۆ سروشتی زانستەکانی بۆ سێ جۆر دابەش کردووە:

١- زانستە تیۆریەکان: باس لەو شتە دەکەن کە ناکرێت پێچەوانەی خۆی بێت و تەنها ئەمانجیشی گەشتنە بە حەقیقەت،

٢- زانستە پراکتیکیەکان: باس لەو شتە دەکەن کە دەکرێت پێچەوانەی خۆی بێت. گرنگترینی ئەم زانستانەش زانستی رەوشت و زانستی رامیاری یە.

٣- زانستە بەرهەمیەکان: ئەو زانستانەیە کەوا گرنگی بە دروستکردنی شتەکان دەدات.

## پێنجەم: لۆژیک(المنطق):

ئەرەستۆ بە داهێنەری یەکەم و مامۆستای یەکەمی زانستی لۆجیك دادەنرێت.

وە دەکرێت زانستی لۆجیك پێناسە بکرێت بەوەی کە: (یاسایەکە لە کۆمەڵێك بنەمای گشتی پێکدێت، کە رەچاوکردنی دەبێتە هۆی پاراستنی مێشکی بیرمەندیی مرۆڤ لە هەڵەکردن لە کاتی بەدەستهێنانی نادیارەکان لە رێگەی ئەو زانیاریانەوە کە لە لای پاشەکەوت کراوە). شارستانیەتی مرۆڤایەتی  چ تیۆری و چ کرداری و چ بەرهەمی، لە لۆجیکەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە هەر نەوەیەك لە نەوە یەك لە دوابیەکەکانی مرۆڤ کاتێك شتێك بۆ یەکەمجار دروست دەکات، سەرەتاییە و پەرەنەسەندووە و نەگەشتۆتە پلەی تەواویەتی و پێگەشتن، بەڵام پاش ئەوەی نەوەی نوێتر دێت و سوود لەو زانیاریە سەرەتاییانە وەردەگرێت کە بۆی ماوەتەوە و بەکاریدەهێنێت بۆ بەدەستهێنانی هەندێك لەو نادیارانەی پەیوەندی بە بەبابەتەکەوە هەیە(دروستکراوە پێشوەکە) و پاشان دەیگۆرێت بۆ زانیاریگەلێك و دەیخاتە سەر کۆگای زانیاریەکانی پێشوو و ئەم بەرهەمەش بە هەمان پرۆسە دەگەیەنرێتە نەوەی نوێتر. ئیتر بەم شێوەیە ئەو بیرۆکە یان ئەوکارە یان ئەو دروستکراوە دەگاتە پلەی کەماڵ و گەشتن لە پێشکەوتن و پەرەسەندندا و ئەم راستیەش لە جیهانی تەکنەلۆجیا و ژیانی هاوچەرخماندا ئاشکرایە.

## شەشەم: فیزیک(سروشت) :

سروشت بریتیە لە لێکۆڵینەوە لە شتە زیندووەکان، ئەرەستۆش ئەم بابەتەی لە پەرتووکی(سروشت)دا باس کردووە و لەوێدا گفتوگۆ و شیکردنەوەکانی دەربارەی ئەو بابەتە فیکریانەی پەیوەندی بە سروشت و گۆڕان و رێکەوت و کات و شوێن و پەیوەندی و ناکۆتایی و گەشە و بابەتی تری لەم چەشنە کردووە. لەم پەرتووکەدا بەڵگەی فەلسەفی و لۆجیکی باس کردووە لەسەر ئەوەی کە (جووڵە) بێسەرەتایە و جووڵێنەرێکی یەکەم و بێسەرەتا هەیە کە گۆڕانی بەسەردا نایەت و توخمی هیولا و شێوە و (بوون لە بارەدا بوون)ی تێدا نیە، چونکە لە خۆیدا جەوهەرێکی رووتی وەهایە کە بە کردەیی هەیە(محقق بالفعل).

## حەوتەم: زانستی ژیان :

ئەرەستۆ باوەڕی وا بوو کە پێویستە تیۆرەکان پشت بە رووداوەکان ببەستن و دەڵێت: ئێمە بە پێی پێویست دڵنیابوونەوەمان لە روودلوەکان بە دەست نەهێناوە، هەرکات لە داهاتوودا کارێکی وەهامان کرد پێویستە متمانەی خۆمان ببەخشینە گەواهیدانی (شایەتی) هەستە راستەوخۆکان پتر لە تیۆرەکان.

## هەشتەم: تیۆری دەروون :

ئەرەستۆ پێی وایە کە رووەکەکانیش وەك مرۆڤ و ئاژەڵ گیانیان هەیە، چونکە زیندوون.

پلەبەندی بوونەوەرە زیندووەکان لە رووی رۆحەوە و بە پێی هێزەکانیان بەم شێوەیە دابەش دەکات:

**١- رۆحی رووەکی کەوا سێ هێزی جیاوازی هەیە:**

أ - هێزی خواردن: کە رووەك لە رێگەی ئەم هێزەوە خۆی خواردن دەخوات.

ب - هێزی گەشە بەخش: رووەك خۆی گەشە بە خۆی دەبەخشێت.

ج - هێزی داینەمۆ: رووەکەکانیش هێزی بەدیهێنانی هاووێنەیان هەیە.

**٢- رۆحی ئاژەڵی:**

لە پلەبەندی زیندووەکاندا ئاژەڵ پلەیەك بەرزترە لە رووەك، چونکە جگە لەو سێ هێزەی پێشوو دوو هێزی دیکەی هەیە و چەندین لقەهێزیش لە ناخیاندا هەیە:

ﻟ- هێزی جوولێنەر: کە هێزی پاڵنەر و هێزی بکەری لێ دەکەوێتەوە:

هێزی پاڵنەریش هێزێکی ئارەزووکارانە و حەزلێکردنە و وا لە خاوەنەکەی دەکات کە ئەگەر لە مێشکیدا وێنەیەکی خوازراو یان ترسێنەر دروست بوو، جووڵەیەك بەرهەم دێت بۆ چێژ وەرگرتن یان راکردن لە زیان و ترسناکی. لە حاڵەتی یەکەمدا پێی دەوترێت هێزی شەهوانی و لە حاڵەتی دووەمیشدا پێی دەوترێت هێزی تووڕەیی.

وە هێزی بکەریش ئەو هێزەیە کە لە دەمار و ماسولکەکانەوە هەڵدەقوڵێت و دەبێتە هۆی ئەوەی خاوەنەکەی کارێك بکات یان نەیکات.

ب - هێزی پەیبەر(المدرکة) : پەیبردنی ئاژەڵیش هەروەك پەیبردنی مرۆڤ یان دەرەکی یان ناوەکییە:

١- پەیبردنی دەرەکی: کە بەهۆی یەکێك لە پێنج هەستە ئاشکراکەوە دروست دەبێت، بینین و بیستن و بۆنکردن و تام و بەرکەوتن(لمس). بەهۆی بەرکەوتنەوە مرۆڤ و ئاژەڵ دەتوانن تەڕی و وشکی و رەقی و نەرمی زبری و لووسی لێکجیا بکەنەوە.

٢- پەیبردنی ناوەکی : بریتیە لە دەرك کردنی روخساری هەستپێکراوەکان یان دەرکی واتاکانیان.

**٣- رۆحی مرۆیی :**

لە رۆحی رووەك و ئاژەڵ بەرزترە و هەموو هێزەکانی ئەوانی تێدایە، سەرەڕای ئەم سێ هێزە ئەقڵیانەی خوارەوە:

ﻟ- هێزی هیولایی رەها(ئەقڵی هیولایی): لەم قۆناغەدا هێز تەنها ئامادەییەکی رەهایە و لە بازنەی ئیمکان و ئامادەیی دەرنەچووە بۆ بازنەی کرداری، وەك توانای خوێندنەوە و نووسین لای منداڵ پێش فێربوونی. وە مرۆڤ لەم قۆناغەدا لە زاراوەی یاساییدا پێی دەوترێت: بێ تەمییز.

ب ـ هێزی توانایی بەخش(ئەقڵی مەلەکە): مرۆڤ کاتێك پێی دەگات کە بتوانێت بنووسێت و بخوێنێتەوە (بۆ نموونە). لەم قۆناغەدا مرۆڤ لە رووی یاساییەوە بە پێگەشتوو(ممیز) دادەنرێت، بەڵام هێشتا شیاوییەتی تەولوی نیە.

ج ـ هێزی کەماڵ(ئەقڵی کردەیی ) کە قۆناغی ئامادەیی تەواوە و لە یاسادا زاراوەی (کەسی تەواو ئەهلیەت) بۆ دانراوە.

مرۆڤ پاش بەکارهێنانی تولناکانی، هێزی تیۆریی بیرکردنەوەی دەبێتە (ئەقڵی بەرهەم هاتوو) و هێزی تیۆریی ئەقڵیی رۆحی مرۆڤ دەگاتە بەرزترین پلەکانی[١].

## نۆهەم : ئەودیوی سروشت (میتافیزیکا):

ئەرەستۆ لە پەرتووکی(میتافیزیکا)دا ئەم بابەتەی بە شیکردنەوە فیکریەکانی تایبەت بە خۆی باس کردووە، وە لە ژێر تیشکی بنەما کۆتاییەکانی حەقیقەتی بووندا رەخنەی لە فەیلەسووفەکانی پێش خۆی گرتووە لە لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەودیوی سروشت. وە بۆ پشتیوانکردنی رای تایبەتی خۆی بروای بەو چوارهۆکارە هەبوو کە پێشتر باسمان کرد. وە لە پەرتووکی سێهەمیدا: هەندێك لە کێشەکانی میتافیزیکای باس کردووە. وە لە پەرتووکی چوارەمیدا گفتوگۆی لە سەرپاسای هاودژ(تناقض) کردووە و لە پەرتووکی پێنجەمدا گرنگترین زاراوە فەلسەفیەکانی باسکردووە و لێکی جیاکردوونەوە، لە پەرتووکی شەشەم و حەوتەم و هەشتەمدا بیرۆکەی جەوهەر، ماهیەت، رەگەز، گشتگیر(کلی)، هیولا، شێوە. لە پەرتووکی نۆهەم و دەیەم و یازدەهەمدا باسی لە بوونی کرداری، بوون لە دۆخی تولنای بووندا، یەکبوون، چەندییەتی و شتی نزیك لەم بابەتانە کردووە. لە پەرتووکی دوانزەهەمدا باوەڕی وەهایە کە پێویستە جووڵێنەرێکی یەکەم هەبێت کە مادده نەبێت و مەبەستیشی خودای پەروەردگارە و کاریگەری خودا هەمووکات بێ ئەنگ و بێ خەوش و تەواوە و لە هەموو شتێك مەزنترە.

---

[١] تەماشای ـ إبن سینا ـ ألنجاة / لا ـ ١٦٦.

وە لە پەرتـووکی سیازدە و چـواردەدا گفتـوگۆ لە سەر هەندێك لەو بۆچـوونانە دەكات كە دەربارەی جەوهەری رووتی نامادی (الجوهر المجرد اللامادی)ە ، كە هەندێك لە ئەندامانی ئەكادیمیا باوەڕیان پێی هەبوو و لە ئەنجامدا هەڵیاندەوەشێنێتەوە .

## دەهەم: ڕەوشت :

بە دڵنیاییەوە پەرتـووكی رەوشت(نیقۆماخیە) بە رەهایی بە یەكێك لە باشترین پەرتـووكەكانی دادەنرێت دەربارەی رەوشت، دەوڵەمەندە بە شیكردنەوەكانی بۆ مانا رەوشتی و دەروونیەكان و بەڵگەی زۆر بەهێـزیش دەهێنێتەوە بۆ راكانی خۆی.

وە رەوشتیش دابەش دەكات بۆ:

ئـ ژیانی باش(چاكە خـوان) : ئەرەستۆ پێی وایە گرنگی ئەقڵ تەنها لەوەدا نیە تـوانای بیركردنەوەی هەیە، بەڵكو لەوەدایە كە دەتـوانێـت كۆنترۆڵی بیر و بنەماكانی بیری بكات لە ئارەزوو و هەڵسـوكەوتەكانیدا. بۆیە ئەم رۆڵەی ئەقڵ تەنها پلەیەكی بەرزی ئەقڵ نیە، بەڵكو پلەیەكی بەرزی رەوشتیشە.

ب ـ ئەرەستۆ پێی وایە كە پلەی بەرزی رەوشت بە راهێنان و خەریك بـوون بەدەست دەهێنرێت. بۆ نمـوونە مرۆڤ دەتـوانێت ببێتە كەسێكی بەخشندە ئەگەر راهێنان و كاری بەردەوام بكات لەسەر ئەو رەوشتانەی مرۆڤی بەخشندە بە ویستی خۆی دەیكات دەیكات.

ج ـ فەزیلەتی ئەقڵی یان (فەلسەفەی پراكتیكی) : ئەو رەوشتەیە كەوا مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو پلەیەی بتـوانێت وەڵامی راست بە دەست بهێنێت بۆ كێشەكانی رەوشتی كرداری و چاكەی رەوشتی. فەلسەفەی پراكتیكی و فەزیلەتی ئەقڵی پێكەوە گرێـدراون و ئاوێنەی یەكین.

د ـ شكۆی ئەقڵی(فەلسەفەی تیۆری) : بەرزترین پلەی رەوشتە كە مرۆڤ دەتـوانێـت بەدەستی بهێـنێت و نـوێـنەری بـەشی خـودلوەندێتیە لە دەروونی مرۆڤدا، چـونكە تەنها بكەرییەك كە بدرێـتە پاڵ پەروەردگار بریتیە لە بیركردنەوەی رووت. ئەرەستۆ پێی وایە كە باشترین و خۆشترین ژیان كە مرۆڤ بە دەستی بهێـنێت بریتیە لە ژیانی فەلسەفەی تیۆری و ژمارەیەكی كەم لە مرۆڤـەكان تـوانای ئەم كارەیان هەیە و ئەوانەش بە چەند كاتێكی جیاواز

دەتوانن بەم کارە هەستن. بەڵام کەسانی تر بە شێوەژیانێکی تر دەژین کەوا پلەیەك لەو ژیانەی پێشتر نزمترە و رێگای بەرزیی رەوشت و کاریەجێیی کرداری (پراکتیکی)یە[1].

## یازدەهەم: رامیاری:

ئەرەستۆ لە پەرتووکی رامیاریدا هەوڵی داوە سروشتی دەوڵەت (دەوڵەتی شار) روون بکاتەوە، مەبەستیشی ئەوە بووە باشترین دەستوور و یاساکان بدۆزێتەوە کە لە کۆتاییدا دەگەڕێنەوە سەر رامیاری.

نرخی فەلسەفی سەرەکی پەرتووکی سیاسەت لەو شیکردنەوانەدایە کە بۆ واتا رامیاریەکان دەیکات(دەوڵەت، هاووڵاتی، یاسا، پەیوەندی و تەولوکەرەکانی تری رامیاری)[2].

ئەرەستۆ پێی وایە کە ئەو باڵاترین چاکەیەی کە بۆ هەموولایەك گرنگە بریتیە لە بەڕێوەبردنی شارەکان یان(بەدیهێنانی زانستی رامیاری)، چوونکە ئامانجی ئەم زانستە، چاکەی تایبەت بە مرۆڤە.

چاکە کردن بەرانبەر بە شار گەورەتر و تەواو ترین کارێکە کەوا بە قانجازی تاك تەولو دەبێت و مەبەست لە بەڕێوەبردنی شاریش بەخشینی بەرزترین چاکە یە بە مرۆڤ ، وە ئەوانەی سوود لە مەعریفە وەردەگرن و لە چێژ و ئارەزوو دوور دەکەونەوە و بە پێی بیرکردنەوە و رای ئازاد کاردەکەن، دەتوانن بەم کارە هەستن.[3]

## دوازدەهەم: دە وتەزاکە :

وتەزاکانی ئەرەستۆ بوونی ناو گەردوون پۆلێن دەکات و پێی وایە کە هەموو بوونەوەرێك دەکەوێتە ژێر یەکێك لەم وتەزایانەوە. چونکە یان جەوهەرە یان رواڵەت(عرض)ە، هەروەك لە بەشی داهاتوودا باسی دەکەین.

---

[1] الموسوعة الفلسفية المختصرة ـ سەرچاوەی پێشوو/لا ٤٠ و پاشتر.

[2] هەمان سەرچاوە/ لا ٣٤.

[3] ئەرەستۆ تالیس: الاخلاق ، وەرگێرانی اسحاق بن حنین ـ تحقیق عبدالرحمن بدوی ـ بە وەرگرتن لە د.ناجي التكريتي ـ الفلسفة الاخلاقية الافلاطونية عند مفكري الاسلام/ چاپی ٣/ ١٩٨٨/لا ٨١.

# باسگەی سێهەم:

# پێناسی وتەزاکانی[1] ئەرستۆ

وتەزا بریتیە لە هەڵگیراو(محمول)، چونکە لە قەزیەدا وتراوێکە دەربارەی بابەت (موضوع) ، وە بە وتەزاکان(المقولات) دەکرێتە کۆ، کە بریتیە لەو رەگەزە باڵایانەی کە رەگەز و جۆرەکان لەخۆ دەگرێت و هەموو هەبووەکان لە ناویدایە، چونکە هەڵگیراوی بناغەیین و دەکرێت هەریەکیان بدەینە پاڵ ئەو بابەتەی کە لەگەڵی دەگونجێت. لای ئەرەستۆ ئەم وتەزایانە لە دە دانەدا کۆکراونەتەوە:

جەوهەر ، کردار ، کارتێکران ، چۆنیەتی ، چەندییەتی ، شوێن ، کات ، حاڵ ، دۆخ ، موڵکایەتی(خاوەنداری).

## یەکەم : جەوهەر:

بریتیە لەو هەبووەی کە لەسەر خودی خۆی راوەستاوە و پشتی بە هیچ هەبوویەکی تر نەبەستووە.

لە بازنەی فەلسەفەدا روخسارەکان(اعراض) لە بەرانبەر جەوهەردان و لە یاساشدا شتە بەرجەسستەکان(اعیان) لە بەرانبەریدان.

وە لە لای فەیلەسوفەکان بۆ چەند واتایەك بەکاردەهێنرێت:

١- ئەو هەبووەی لەسەر خودی خۆی راوەستاوە و لە بەرانبەردا روخسار هەیە کە بوونی لە سەر هەبوویەکی تر راوەستاوە.

٢- ئەو زاتەیە کە زەمینەی بەرهەمهێنانەوەی سیفەتە دژەکانی تێدایە.

---

[1] لە زمانی یۆنانیدا پێی دەوترێت (کاتیگوریا یان قاتیخوریا  قاتیگوریات Categoies و وشەی وتەزا Category لە عەرەبیدا (مقولە) ی بۆ دانراوە کە لە چاوگی (القول) وە وەرگیراوە.

٣ ـ ئەو هەبووەیە کە پێویستی بە جێگایەك نییە کە تێیدا بێت[1].

٤ ـ ئیبن سینا دەڵێت: ئەو هەبووەیە کەوا خۆی بوونی هەیە بە بێ بوونی لە جێگایەکدا.[2]

وە ئەگەر جەوهەر جێگای جەوهەرێکی تر بێت پێی دەوترێت هیولا و ئەگەر لە ناو جەوهەرێکی تردا تواپێتەوە پێی دەوترێت شێوە، کە پێشتر باسمان لێوە کرد.

## دووهەم و سێهەم: کردار و کارتێکران:

کردار بریتیە لە کاریگەریدانان لە سەر ئەو شتەی کەوا زەمینەی کارتێکرانی هەیە، وە کارتێکرانیش بریتی یە لە کاریگەربوونی شتێك بە شتێکی تر. ئەنجامی هەر یەك لەو دوو دۆخە پێی دەوترێت: کاریگەریی، لەگەڵیاندا بوونی هەیە و بە نەمانیان نامێنێت، وەك گەرمکردن و گەرمبوون، جا هەندێك کەس[3] لە نێوان شت و کاریگەرییەکەیدا تێکەڵبوونێکیان لا دروست بووە و گوتوویانە: کردار (بوونی شتێکە لە حاڵەتێکدا کە کار بکاتە سەر شتێکی تر لە دۆخی جیاجیای کاتدا).

## چوارەم و پێنجەم: چۆنیەتی و چەندیەتی:

ا– چۆنیەتی(الکیف): لە زمانی عەرەبیدا چاوگی (کیفَ)یە و (لە رێزمانی عەرەبیدا ناوێکی نادیارە و مەبنی یە لەسەر فەتحە و زۆربەی جار بۆ پرسیار بەکار دێت، وەك : کیف حالك؟واتە حاڵت چۆنە، وە کیف خال فلان؟ واتە حاڵی فلان چۆنە ؟).

لە زاراوەی زانایانی (اصول الفقه)یشدا لەو دەربڕینانەیە کە بۆ حاڵەتی گشتی بەکاردەهێنرێت وەك(کیفما تکونوا یول علیکم) واتە ئێوە چۆن بن بەو شێوەیە سەرۆکتان بۆ دەنێررێت. وە لە زاراوەی زانستی لۆجیکدا بریتیە لە : ئەرێنی لە دۆزی ئەرێنیداردا،وەك : هەموو مرۆڤێك زەمینەی فێربوونی تێدایە، وە نەگەتیڤ لە دۆزی نەگەتیڤدا، وەك: ئەو کەسەی باوەڕی نەبێت پابەندبوونیشی نابێت.

---

[1] المعجم الفلسفي، د . جميل صليبا، ٤٢٤/١ و پاشتر .

[2] النجاة لابن سينا /لا ١٢٦ .

[3] وەك د. عبداللطيف محمد العبد: التفكير المنطقي – دار الثقافة العربية/چاپی٣/١٩٧٧/لا ٤٣ .

وە لە زاراوەی فەلسەفیدا چەند پێناسەیەکی شوێنکەوتەییانەی(تەقلیدی) بۆ کراوە کە زاناکان لە پێشینانی خۆیانەوە بەبێ هیچ گۆڕانێك گواستویانەتەوە، وەك دەڵێن: ئەو روخسارەیە کە لە خۆیدا دابەشنابێت و نیسبەتیشی نادرێتە پاڵ هیچ شتێك[1].

من پێشنیاری ئەوە دەکەم کە بەم شێوەیە پێناسەی بکرێت:(سیفەتێکی سروشتی[2] روخساری شتەکانە کە دابەشبوونەکانی لەسەر بونیاد دەنرێت لە سەر ئاستی رەگەزەکان و جۆرەکان و پۆلەکان یان کەسەکان) هەر لەم بابەتەیە گونجاندنی هەڵسوکەوتی یاسایی و رووداوی یاسایی بۆ دیاریکردنی ئەو یاسایەی کە پیادەکردنی پێویستە. بۆ نموونە بابەتی کوشتن پێویستی بەوە هەیە کە چۆنیەتی و سروشتی کوشتنەکە بزانین، ئایا ئەنقەستە یان هەڵەیە، ئەگەر ئەنقەست بوو، بزانین لەسەر هەق بووە یان ناهەق. گەر ناهەق بووە، ئەیا سادە بووە یان هاوکات بووە لەگەڵ دۆخێکی ئاسانکراودا یان دۆخێکی توندکراودا.

ب ـ چەندێتی: لە عەرەبیدا بە (الکم) ناونراوە و بە چەند واتایەك هاتووە، وەك( الكم للقميص)قۆڵی کراس بە اکمام دەکرێت بە کۆ، وە لە زاراوەشدا وشەی پرسیارکردنە دەربارەی شتەکان و کاتەکان.

لە زاراوەی لۆژیکیدا (کەرەستەیەکە بۆ روونکردنەوەی ئاستی گرتنەخۆی هەڵگیراوە لە دۆزدا بۆ ئەو تاکانەی لە بابەتەکەدا هەیە، جا ئەگەر حوکمەکە هەموو تاکەکانی بابەتەکەی دەگرتەوە، پێی دەوترێت گشتگیر(کلي)، وەك: هەموو مرۆڤێك ئەنجامی نەمانە. وە ئەگەر حوکمەکە هەندێك لە تاکەکانی دەگرتەوە، پێی دەگوترێت، جوزئی، وەك: هەندێك مرۆڤ فەیلەسوفە.

خۆ ئەگەر حوکمەکە بەسەر تەنها کەسێکدا درا، دۆزەکە ناو دەنرێت تایبەتکراو(مخصوصة) یان کەسی(شخصية) هەروك بوترێت: خالید راگری کۆلێژی یاسایە، لە کاتێکدا گوێگر خالید بناسێت.

---

[1] شرح المواقف، دلنراوی سید شریف الجرجانی ٣/٢-٣.

[2] چونکە سروشتی بێگیانەکان جیاوازە لە سروشتی بوونەوەرە زیندووەکان و سروشتی رووەك جیاوازە لە سروشتی ئاژەڵ و سروشتی ئاژەڵیش جیاوازە لە سروشتی مرۆڤ ...هتد .

وە لە زاراوەی فەلسەفیشدا: بریتی یە لەو شتەی لە خودی خۆیدا یەکسانی و نایەکسانی و بەشبەشبوون لە بارەیدا بێت.

وە بە پێی رەچاوکردنی جیاوازەوە دەکرێت بە چەند بە چەندین بەشەوە:

**ا ـ لە رووی سنووری هاوبەشەوە، پێکەوەلکاو و لێکجودان:**

**١- چەندییەتی پێکەوەلکاو:** ئەو شتەیە کە دەتوانرێت گریمانەی چەند بەشێکی تێدا بکەین کە لە سنوورێکی هاوبەشدا پێك دەگەن. ئەوەتا دۆخی ئێستا سنوورێکی هاوبەشە لە نێوان دۆخی رابوردوو و داهاتوودا، چونکە پێکگەبوون بریتیە لە یەکگرتنی دووئەندازە لە هێڵێکی هاوبەشدا کە دەبێتە لایەك لە هەریەکەیان.

**٢- چەندییەتی لێکجودا:** ئەو شتەیە کە لە نێوان تاکەکانیدا سنوورێکی هاوبەش نیە، بۆ نموونە: ژمارە ٣ و ٤ کە لە نێوانیاندا ژمارەیەکی هاوبەش نیە کە ببێتە کۆتایی ژمارەی یەکەم و سەرەتای ژمارەی دووهەم.

**ب ـ وە لە رووی جێگیربوون و ناجێگیریەوە چەندییەتی هاوبەش دەکرێت بە دوو بەشەوە:**

**١- وەستاو (القار):** ئەو شتەیە کە نوێبوونەوەی نیە لەگەڵ نوێبوونەوەی ساتەکاندا، وەك بێگیانەکان.

**٢- نەوەستاو (غیر القار):** ئەو شتەیە کەوا هەموو ساتێك نوێ دەبێتەوە، ئەمەش بریتیە لە کات.

**ج ـ لە رووی قابیلیەتی دابەشبوونەوە (وەستاو یان ناکات) دەکرێت بە سێ بەشەوە:**

١ – **هێڵ(الخط):** کە پێك دێت لە خاڵەکان و تەنها لە رووی درێژییەوە قابیلیەتی بەشبەشبوونی تێدایە کە درێژی یە.

٢ – **رووبەر:** کە لە هێڵەکان پێك دێت و قابیلیەتی دابەشبوونی بۆ ئاراستەی درێژی و پانی تێدایە.

٣ – **تەنی فێرخوازی(الجسم التعلیمی):** لە رووبەرەکان پێك دێت و قابیلیەتی بەشبەشبوونی تێدایە لە سێ لای یەکتربڕەوە، درێژی و پانی و قووڵی. خاڵ کۆتایی هێڵە و

هێڵ کۆتایی رووبەرە و رووبەریش کۆتایی تەن. خاڵ قابیلیەتی دابەشبوونی تێدا نیە، چونکە کۆتایی بریتیە لەوەی کە ئەگەر گریمانەی ئەوە بکرێت کە لەوێدا راوەستین، ئەوا لە پاش ئەو شتێکی تر نیە کە لایەکی هەبێت.

## شەشەم و حەوتەم: بوون لە شوێندا و بوون لە کاتدا.

### ١- بوون لە شوێندا( الاين):

وشە عەرەبیەکەی بۆ پرسیار کردن دەربارەی بوونی شتێکە لە شوێنێکدا[1].

لە زاراوەی زانستی (نەحو)ی عەرەبیدا بۆ پرسیار کردن بەکار دێت دەربارەی بوونی شتێك لە شوێندا، وەك دەوترێت: اين الموقع الجغرافي للعراق في قارە اسيا؟ شوێنی جوگرافی عێراق لە کوێی کیشوەری ئاسیادایە؟ وە دەشبێتە (اسم الشرط) واتە دەبێتە ناوێك کە واتای مەرجی تێدا بێت لەگەڵ (ما)دا و بە بێ (ما)ش، وە دەچێتە سەر دوو (فیعل) و هەردوویان (مەجزووم) دەکات، یەکەمیان وەك(شرط/مەرج) دووهەمیان وەك(جزا /پاداش)، وەك ئەم ئایەتەی کە دەفەرمێت(اينما تكونوا يدرككم الموت ولو كنتم في بروج مشيدة)[2] لەم ئایەتەدا کرداری(تکونوا) مەجزووم بووە و نیشانەی مەجزووم بوونەکەشی نەمانی پیتی نوونە، وە نیشانەی مەجزوومیش لە کرداری(یدرککم)دا (سکون)ی کۆتاییەکەیەتی.

لە زاراوەی ئوصولی فیقهیشدا دارشتەیەکە بۆ گەیاندنی واتای دۆخی گشتی بوونی شوێن، چ لەگەڵ پیتی (ما)دا بێت یان بە بێ ئەو، وەك ئەوەی کڕیار بە فرۆشیار بڵێت: اين/اينما تسلمني المبيع اسلمك الثمن، واتە لە هەر شوێنێك فرۆشراوەکەم رادەست بکەیت، لەوێدا نرخەکەت پێ دەدەم.

وە لە زاراوەی فەلسەفیشدا: ئەو حاڵەتەیە بە هۆی بوونی شتێك لە شوێنێکدا دروست دەبێت بۆی، وە چەند بەشی هەیەو پشت بە خودا لە جێگای خۆیدا باسی دەکەین.

---

[1] الصحاح في اللغة والعلوم ٦٢/١ وفيه: أين سؤال عن مكان اذا قلت أين زيد؟ فأنما تسأل عن مكانه

[2] سورەتی النساء /٧٨ .

**ب. کەی (المتى):**

لە زمانی عەرەبیدا (متى) بە چەند واتایەك دێت، بۆنموونە، درێژکردنەوە، وەك لە عەرەبیدا دەڵێن: متى الشيء، واتە شتەکەی درێژ کردەوە، هەروەها بە واتای لێدان، کاتێك دەوترێت: متاه بالعصا واتە بە عاسایەك لێی دا.

لە زاراوەی زانستی (نەحو)ی عەرەبیدا کەرەستەی پرسیارکردنە دەربارەی  روودانی شتێکە لە کاتدا ، وەك دەپرسن: متى تبدأ العطلة الصيفية للدراسة؟واتە: کەی پشووی هاوینەی خوێندن دەست پێ دەکات؟ وە لە رێزمانی عەرەبیدا ناوی مەرجە و کار دەکاتە سەر دوو فرمان(فعل) و یەکەمیان مەرج و دووهەمیان وەڵامی مەرجە، وەك دەوترێت: متى استوعب الطالب موضوع دراسته نجح في الامتحان فيه، واتە چ کاتێك قوتابی بە باشی لە بابەتی وانەکانی گەشت،لە تاقیکردنەوەدا سەردەکەوێت.

وە لە زاراوەی زانستی (اصول الفقه/بناغەکانی فیقهی ئیسلامی)دا بەکاردەهێنرێت بۆ پرسیارکردن لەسەر حاڵەتی گشتیی کات، چ لەگەڵ (ما) ا بێت یان بەبێ (ما). وەك ئەوەی یەکێك لەو دوو کەسەی مامەڵە دەکەن بڵێت: متى ما تنفذ التزامك، انفذ التزامي[1] هەرکات پابەند بووی بە مەرجی مامەڵەکەوە، منیش پابەند دەبم.

لە زاراوەی فەلسەفیدا: ئەو حاڵەتەیە روو دەکاتە شتێك بەهۆی (کەی)ەوە، (بوونی لە کاتدا)[2] کە فەیلەسوفان کردوویانە بە دوو بەشەوە:

**١- (کەی)ی راستەقینە، المتى الحقيقي:** ئەو کاتەیە کە تەنها بەشی کارێك دەکات. وەك رۆژوو لە مانگی رەمەزاندا کە تەنها ئەو رۆژووەی تێدا دەگیرێت و رۆژووی تری وەك نەزر و سوننەتی تێدا ناگیرێت. هەروەها  کاتی دیاریکراو بۆ پێشکەشکرنی  وانەیەکی زانکۆ یان وتاری کۆنگرەیەك، وە لە زاراوەی فیقهی ئیسلامیدا پێی دەوترێت: کاتی تەنگکراوە(الوقت المضيق).

**٢- (کەی)ی نارلستەقینە یان مەجازی:** بریتیە لە روودانی کردارێك لە ناو کاتێکدا کە جێگای بۆ کرداری تری هاوێنە هێشتبێتەوە. وەك کاتەکانی دەوامی فەرمی لە دامەزراوە

---

[1] سەیری نوسراومان  أصول الفقه في نسيجه الجديد /٢ /٣٣٥

[2] التعريفات للجرجاني/ لا ١٩٩ .

گشتیەکاندا کە بۆ سوودی گشتیە، هەروەها وەك ئەو مامۆستایەی لە زانکۆدا وانەی لە چەند کاتێکی دیاریکراودا هەبێت دەتوانێت لە دەرەوەی ئەو کاتانەدا و هەر لە کاتی دەوامدا وانەی تر بڵێتەوە، چونکە کاتی دەوامەکە لە کاتی وانە سەرەکیەکان فراوانترە. وردەکاری پتر بۆ ئەم بابە تە لە جێگای خۆیدا باس دەکەین بە یارمەتی خودا.

## هەشتەم و نۆهەم و دەهەم : خستنەپاڵ(الاضافة)، حاڵ(الوضع)، خاوەنداری(الملك):

**أ– الاضافة:** لە زمانی عەرەبیدا بە واتای خوارکردنەوە و دانەپاڵ و خستنەپاڵ.

وە لە زاراوەی (نەحو)دا دانەپاڵێکی ناتەواوە لە نێوان دووناودا کە دەبێتە هۆی لابردنی (نون و تەنوین)لە یەکەمیاندا کە (مضاف)ەکەیە و کەسرە بەخشین (یان جێگرەوەی کەسرە)بە دووهەمیان.

وە لە زاراوەی فەلسەفیدا چەند پێناسەیەکی تەقلیدی ناڕوونیان بۆ کردووە، وەك: حاڵەتێکە روو دەکاتە جەوهەر بە هۆی بوونی غەیری خۆی لە بەرانبەریدا بە شێوەیەك کە بوونی ناچێتە ئەقڵەوە مەگەر بەهۆی ئەو شتەوە کە لە بەرانبەریدایە، وەك باوکبوون و کوڕبوون[1]. هەندێکیش دەڵێن بریتیە لە وەپاڵدان(نیسبەت)ی دووبارەیی، واتە ئەو وەپاڵدانە ناچێتە ئەقڵەوە بە بەبێ پێوانی بە وەپاڵدانێکی ئەقڵانی ترەوە کە پێوانە بکرێت لەگەڵ وەپاڵدانی یەکەمدا[2].

ئەم جۆرە پێناسانە و هاووێنەکانی جگە لەوەی کلاسیکی و ناروونن، دووبارەبوونەوە و شتی ناپێویستیان تێدایە، بۆیە پێشنیار دەکەم لە رووی فەلسەفییەوە بەم شێوەیە پێناس بکرێت:( حاڵەتێکە لە نێوان دوو پۆلی بەرانبەردا کە تێگەشتن لە هەریەکیان بە بێ تێگەشتن لەوی دیکەیان نابێت). وەك باوکایەتی و کوڕایەتی لە حاڵەتی کوڕ و باوکدا، وە قەرزاریەتی لە حاڵەتی قەرزدار و قەرزدەردا، حاڵەتی یاسایی یان پەیوەندی یاسایی لە نێوان کەسی پابەند و کەسی پابەندی بۆکراودا.

---

[1] التعريفات للجرجاني / ل ٢٠ .

[2] المقولات للسجاعي / ل ٤٩ .

**ب ـ حاڵ ـ وەزعییەت ـ (الوضع)** : الوضع لە زمانی عەرەبیدا بە چەندین واتا هاتووە: کاتێك دەڵێن وضعه، واتە نزم و کزی کرد، یان دەڵێن: وضع عنقه، واتە لە ملی دا، یان دەڵێن: وضع الحدیث، واتە: حەدیسی درۆی هەڵبەست، یان دەوترێت: وضع الکتاب، واتە پەرتووکەکەی نووسی، یان دەڵێن: وضع الجنایة عن فلان، واتە، تاوانەکەی لەسەر فلانکەس لابرد.

وە لە زانستی رەوانبێژی و مەعانیدا (وضع) بریتیە لە کردنی شتێك بە نیشانە لەسەر واتا، چ قسە بێت وەك (زەید) چ ئاماژە بێت وەك (ئاماژەکانی هاتوچوو).

لە زاراوەی فەلسەفیدا بە چەند دەربڕینێك پێناس کراوە، وەك: حاڵەتێکە بۆ تەن دروست دەبێت بە هۆی وەپاڵدانی بەشەکانی بۆ یەکدی کە لە سروشتی ئەو تەنەدایە، وەك، نزیکی و دووری و بەرانبەریوون و یان بەهۆی نیسبەتی بەشەکانیەوە لەگەڵ شتێکی تری دەرەوەی ئەم بەشانە[1] .

هەروەها لە پێناسەیدا گوتراوە: هەڵکەوتنی تەن بەشێوەیەك کە نیسبەتی بەشەکانی بۆ یەکدی یان لادانە یان (هاوکێش)ە بە پێوانە بە لاکان و بەشەکانی جێگاکەوە، گەر لە جێگادا بێت، وەك هەستان و دانیشتن.

**ج ـ خاوەندارێتی/ الملك** : لە زمانی عەرەبیدا بە چەند واتایەك هاتووە، کە نزیکترینیان لە واتای زاراوەییەکەیەوە: کۆنترۆڵکردنی شتێك و توانای بەکارهێنانی تەنها لە لایەن خۆیەوە.[2]

وە لە زاراوەی فەلسەفەیدا چەند دەربڕینێکی لە بارەوە وتراوە، وەك: دۆخێکە بۆ شتێك درووست دەبێت بە سەبارەت بەوەی دەوریداوە و بە جوڵانی دەجوڵێت، وەك ئەو جلوبەرگەی مرۆڤ دەیپۆشێت، وەك مێزەر و کراس و مستیلە و چەك[3]، کە مەبەست کاتی بەکارهێنانیانە[1].

---

[1] هەمان سەرچاوە، لا ٥٦ .

[2] النجاة لابن سینا / لا ١٢٨ .

[3] زانای هەڵکەوتوو ( الحلی ) لە لێکدانەوەی (تجرید الاعتقاد) الطوسی (لا ٢٥٧ و پاشتر) دەڵێت: وتەزای خاوەندارێتی وەك نیسبەتی تەنێك ولیە بۆ دەورویەری یان بۆ هەندێك لە بەشەکانی کالتغنم، ←

ئەوەی شایانی باسە لە نزیکەی سێ سەدسالّ پێش زاینەوە ئەم پێناسە تەسکە کراوە و لە پێشینانەوە تا ئێستا هەروا ماوەتەوە بە بێ ئەوەی کەس بوێرێت ئەم پێناسە دواکەوتووە بگۆڕێت بە پێناسەیەکی گونجاو لەگەلّ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و فراوانبوونی چێوەی خاوەندارێتیدا، کە یەکێکە لە پێداویستیەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، بۆیە ئەم پێناسە فەلسەفییە پێشنیار دەکەم:

تایبەتمەندییەکە لە نێوان مرۆڤ و ئەو شتانەی تایبەتن بە مرۆڤەوە، ئەم تایبەتمەندیەش گشتی یان جوزئیە و مرۆڤ سەرپشک دەکات لە هەموو جۆرە بەکارهێنانێك و سوودلێوەرگرتنێکی و گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.

---

هەندێکی زلتی یە وەك پشیلە لە کاتی ترسانیدا و هەندێکی عەرەزی یە، وەك لەشی مرۆڤ لەکاتی پۆشینی کراسدا.

[1] التعريفات/ للجرجاني، القاسي عبدالنبي بن عبدالرسول الاحمد النكري ـ دستور العلماء او جامع العلوم في اصطلاحات الفنون/٣/٢٢٤.

# دەروازەی دووەم

## فەلسەفەی بەرپرسیاریەتی جەزایی لە ژێر تیشکی کردار و کارتێکرانی فەلسەفیدا

لـە دەروازەی پێشـوودا باسـی بەرپرسـیاریتی و بەشـەکانی و جیاوازی نێوان بەرپرسیاریەتی سزایی و مەدەنی. لێرەشدا باس لە کاریگەریی بارودۆخ و ئەو شتانەی دەکەونە ژێر کاریگەریی لە پایەی شەرعی و پایەی مەعنەوی و سزادان، لە ژێر کاریگەریی کردار و کارتێکرانی فەلسەفیدا .

وە لەبەر ئەوەی کارتێکەر بریتیە لە بارودۆخ، بە پێویستمان زانی پێناسەی بکەین و لە سەرەتای ئەم دەروازەیەدا بەم شێوەیە باس لە جۆرەکانی بکەین:

(الظرف) لە زمانی عەرەبیدا،

بە وڵاتای دەفر، وە هەر لەو وشەیەوە (ظرف زمان) و (ظرف مكان) وەرگیراوە لای زاناپانی زانستی نەحو.

لە زاراوەی یاسای سزاییدا پێشهاتوویەکی خودی یان دەرەکی یە کەوا کاریگەری دادەنێت لە سەر دۆزە جەزاییەکان لە رووی قەبارەی تاوان و سزاکانەوە.

بۆ زانینی کاریگەریەکانی باروتۆخ، پێویستە هەموو جۆرەکانی بناسین، چونکە کاریگەریەکانی بە پێی جۆرەکانی دەگۆڕێن:

## جۆری بارودۆخە کاریگەرەکان[1]

ئەو باروتۆخانەی کاریگەریان هەیە لەسەر دۆزە جەزاییەکان لە چەند رووی جیاوازەوە دابەش دەکرێن:

### یەکەم: لە رووی سەرچاوەکانیەوە: یاسایی و دادوەری:

١- باروتۆخە یاساییەکان: ئەو باروتۆخانەیە کەوا یاسا بە دەق دیاری دەکات.

٢- باروتۆخە دادوەریەکان: ئەو باروتۆخانەیە کەوا دادوەر لە دۆکۆتەکانی دۆلای سزاییدا(وقائع الدعوى الجزائيه) هەڵیدەهێنجێت.

لە گرنگترین جیاوازیە سەرەکیەکانی نێوان ئەم دوانە بریتیە لە:

---

[1] د. محمود نجيب حسني ـ الموجز في شرح قانون العقوبات القسم العام لا ٢٨ و پاشتر، وە د. محمود محمود المصطفى ـ المرجع السابق لا ٤١ و پاشتر.
الدكتور حميد السعدي: شرح قانون العقوبات العراقي الجديد، جرائم الإعتداء على الأموال ١٩٢/٢ و پاشتر.
المحامي محسن ناجي: الأحكام العامة في قانون العقوبات على متون النصوص الجزائية ص٣٨٩ و پاشتر.
الدكتور رؤوف عبيد: مبادئ القسم العام في التشريع العقابي ص١٥٨ و پاشتر.

ا — باروئۆخە(یاساوە) یاساییەکان یاسادانەر سەرپەرشتی دەکات و یاسا دەقی بۆ دادەنێت، بە پێچەوانەی باروئۆخە دادوەریەکان کە ملکەچی خەملاندنی دادوەرین کە لە دلکەوتەکانی دوای سزایی و خەملاندنەکانین.

ب — لە بەر ئەوەی باروئۆخە یاساییەکان دروستکراوی یاسان، ئەوا تەنها یاسادانەر لە رووی ئەو ئۆخەی تێیدایە و لە رووی ئاستی کاریگەرییەوە دیاری دەکات، بە پێچەوانەی باروئۆخی قەزاییەوە کە دیاریکردنی لەو رووانەوە تەنها ملکەچی خەملاندنی دادوەرە .

ج — باروئۆخی یاسایی یان سەختگیری یە یان سووککراوە یان بەخشراوە، بە پێچەوانەی باروئۆخی دادوەریەوە کە بەخشراو نابێت، چونکە دادوەر دەسەلاتی لێبووردنی نیە لە سزا، گەر دەقێکی یاسایی لەسەر نەبێت، هەروەك چۆن ناتوانێت تاوان و سزایەکی نوێ دابهێنێت[1].

## دووهەم : لە رووی چێوەی پراکتیزەکردنیەوە بە گشتی و بە تایبەتی:

١— باروئۆخە کاریگەرە گشتییەکان : ئەمانە دەکرێت پیادە بکرێت لە گەڵ هەموو جۆرەکانی تاواندا و هەموو یان زۆریەی تاوانەکان دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە، وەك باروئۆخی گەڕانەوە بۆ تونکردنەوە، کە هەموویەشەکانی تاوانی گەورە و بچووك دەگرێتەوە.

٢ — باروئۆخە کاریگەرە گشتییەکان: تەنها لەتاوانێك یان چەند تاوانێکی دیاریکراودایە، وەك (لێوردبوونەوەی تاوانبار لە تاوانەکەی پێش تاوان) بۆ تونکردنەوەی تاوان یان بریندارکردن یان لێدان یان پێدانی مادەی ژەهراوی و هاوێنەکانی، یان وەك باروئۆخی خزمایەتی و هاوسەریەتی لە نێوان دز و دزلێکراودا لە سووك کردنی سزای دزیدا.

## سێهەم: لە رووی تاوانکارەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١— باروئۆخە بابەتی و مادیەکان: ئەو بار و ئۆخانەیە کەپەیوەندی بە باروئۆخی تاوانکردنەوە هەیە، لە ئۆخی زەماندا وەك(وەك شەو) یان شوێن(وەك شوێنی نیشتەجێبوون لە تاوانی دزیکردندا کە دەبێتە هۆی توندترکردنەوەی سزای دزی). دەستەواژەی(باروئۆخە عەینیەکان) بۆ مادیەکان بەکاردەهێنرێت، ئەم جۆرەش پەیوەندی بە لایەنی ماددی تاوانەوە هەیە، وە

[1] مامۆستا عبدالملك الجندي ـ الموسوعة الجزائية/ ٤ /٦٤٢ .

هەندێك جاریش بارودۆخی ماددی پەیوەندی بە ئەنجامەوە هەیە وەك ئەوەی لێدان و بریندادی ببێتە هۆی سەقەت بوون یان مردن.

٢- بارودۆخی کەسیی(الظروف الشخصية): پەیوەندی بە کەسی تاوانکار و ویست و هەڵسوکەوتەکانیەوە هەیە، وەك بارودۆخی لێوردبوونەوە پێش تاوان بۆ توندکردنەوەی سزای کوشتن و لێدانی ئەنقەست، هەروها وەك ئەوەی دزێك لەوماڵەدا دزی بکات کە خزمەتی تێدا کردووە .

وە بارودۆخی کەسیش دوو وێنەی هەیە:

**یەکەم:** گریمانەی زۆربوون و کەمبوونەوەی مەترسیی ویستی تاوانکاری تێدا هەیە، وەك پێشینەی سووربوون لە سەر تاوان(سبق الاصرار) و وروژاندن(استفزاز).

**دووەم:** گریمانەی سیفەتێك دەکرێت لە تاوانکاردا، وەك سیفەتی خزمەتکار لە دزیدا و سیفەتی پزیشکی لە لەباربردندا.

ئاشکرایە منداڵی و شێتی کە لە بەربەستەکانی بەردەم بەرپرسیاریەتی سزایین بەشێکن لە بارودۆخی کەسیی.

**چوارەم: لە رووی کاریگەریی بارودۆخ لەسەر سزاو کاریگەربوونی بە سزا :**

بارودۆخەکان یان سووك کراون یان توندکراونەتەوە یان بەخشراون(بووراون).

١- بارودۆخی توندکەرەوە: ئەو بارودۆخەیە تەعبیر لە مەترسیی تاوانکار و تاوانەکەی دەکات و ئەم مەترسیەش پاش بوونەکردنی تاوان ڕووندەبێتەوە، وەك بارودۆخی گەڕانەوەی چەندجارەی تاوانکار بۆ تاوانەکەی و هەروەها لێوردبوونەوەی پێش تاوان لە کوشتن یان لکاندنی تاوانێك لەگەڵ تاوانێکی تردا وەك ئەوەی: دز ئەو کەسە بکوژێت کە دزییەکەی لێکردووە تا دزیکردنەکەی ئاسان بێت.

٢ – بارودۆخی سووککەرەوەی سزا: وەك ئەوەی تاوانلێکراو تاوانلێکراو بوروژێنێت یان کوشتن بۆ شتنەوەی ئابڕووچوون و کردنی تاوان بە هۆی زۆرلێکردن یان لەبەر ناچاری زەرورەت و هاووێنەکانی، لەو تاوانانەی کە بۆمان دەردەخات کە تاوانەکە بە ڕێکەوت ڕووی داوە یان ئەو بارو دۆخەی کاریگەری هەبووە لەسەر دەروونی تاوانکارەکە مەترسیدار نەبووە. .

٣ — ئەو بارودۆخانەی دەبێتە هۆی بەخشینی تاوان: وەك بارودۆخی بەرگریی شەرعی، بارودۆخی ئەرك بەجێهێنان، بارودۆخی بەکارهێنانی ماف.

**پێنجەم: لە رووی پابەستی( الزام ) و دروستی یەوە:**

لەم رەوەشەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١ — بارودۆخە پابەستکراوە توندکراوەکان:

ئەو بارۆخەیە پێویستی دەکات لە سەر دادوەر کە سزا توند بکاتەوە لەسەر تاوانکار، وەك پێشینەی سووربوون لە سەر تاوان لە کەیسی کوشتندا و هاوکاتبوونی دزی و توندوتیژی. وە نموونەش لە دۆخی سووککردنی پێویست ئەوەیە کە تاوانکار شایستەیی(ئەهلیەت)ی ناتەواو بێت.

٢ — بارودۆخە دروستە توندکراوەکان: ئەو بارودۆخەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی خەملێنراوی دادوەر و دیاریکردنی دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکی دادوەر، وەك رەچاوکردنی ئەو ناووناوبانگە خراپەی تاوانبار هەیەتی. هەروەها پیریەتی تاوانبار، یان بەخێوکەری خێزانێکی هەژار، یان ناووناوبانگی باشی لە ناو خەڵکیدا هەبێت.

**شەشەم: لە رووی سروشتی بارودۆخەکەوە:**

هەندێك جار بارودۆخەکە لە خودیخۆیدا تاوانە و هەندێکجاریش کارێکی رەوایە:

١ — ئەوەی کە خۆی لە خۆیدا هەر تاوانە، وەك شکاندنی دەرگا و مۆری ساختە بۆ ئاسانکاری لە دزیدا، جا هەریەك لە دوو تاوانە گەر لەگەڵ دزیکردنەکەدا کەوتنە یەك، ئەوا پێویستە دادوەر سزاکە توندتر بکاتەوە.

٢ — ئەوەی کە لە خۆیدا تاوان نیە و ئەمەش زۆرینەی بارودۆخەکانە و نموونە کرداریەکانی زۆرن. گەر هاوکات بوون لەگەڵ تاوانەکەدا کاریگەریان لەسەری هەیە، گەرچی لە خۆیدا رەوایە، وەك ئەوەی تاوانکار خزمەتکار بوو بێت بۆ توندکردنەوەی سزاکەی، خزمەتکردن لەماڵێکدا لە خۆیدا تاوان نیە، بەڵام ئەو خزمەتکارە گەر لەو ماڵەدا دزیی کرد یاسا ئەو دۆخە بە توندکەرەوە دادەنێت.

کەواتە لەسەر بناغەی ئەم ئامادەسازی یە سروشتی بابەتەکە وا دەخوازێت کە لە رووی شێوەوە بکرێت بە سێ بەشەوە، یەکەمیان باس لە کاریگەری بارودۆخەکان دەکات لەسەر پایەی شەرعی تاوان، دووەهەم باس لە کاریگەریی بارودۆخەکان دەکات لەسەر پایەی مەعنەوی، سێهەمیش باس لە کاریگەری بارودۆخ دەکات لەسەر سزا.

# بەندی یەکەم:
# کاریگەریی بارودۆخەکان لەسەر پایەی شەرعیی تاوان

تاوان کارێکی ناڕەوایە کە لە تاوانەخـواستێکەوە(ارادة جنائیـة) پەیدا دەبێـت و یاسا سزایەك یان ڕێوشـوێنێکی ئاگریریی(تدبیر احترازی) لە بەرانبەردا دەگرێتە بەر، چ ئەو کارە چالاکیەکی کردەیی بێت وەك کوشتن بە بێ هۆی رەوا، یـان چـالاکیەکی نـەکردەیی بێـت وەك نەکردنی کارێك کە یاسا فەرزی کردووە؛ وەك شاهێدی نەدانی شایەت بە بێ پاساو لـە شایەتیەکدا کە پێویستە لە سەری.

بە شێـوەیەکی گشتی تاوان لە سەر سێ پایە راوەستاوە:

١- پایەی شەرعی ٢ – پایەی مادی ٣ – پایەی مەعنەوی.

**پایەی شەرعی**: سیفەتێکی ناڕەوایە بۆ کارێك کە ئەم دوو مەرجەی تیابێت:

یەکەم: ئەو کارە ملکەچ بێت بـۆ دەقێکـی تاوانـوێن(نـص تجریمـي) کـە یاسـا تێیـدا سزایەك بۆ تاوانکار دیاری دەکات.

دووەم: لەم کارەدا هۆیەك لە هۆکارەکانی ڕێپێـدرانی تێدا نەبێت.

**پایەی ماددی**: ئەو رواڵەیە کە لە رێگایەوە دێتـە رووی جیهـان و ئـەم سـێ تـوخمەی تێدایە:

١ – چالاکیەکی کردەیی بێت یان هەڵوێستێکی نەکردەیی بێت و بدرێتە پاڵ تاوانکار.

٢ – ئـەو تاوانـە ئەنجامـەی کـەوا بەرهـەمی چـالاکیەکی دەرەکـی وەهایـە کـە تێیـدا دەستدرێژی دەکرێتە سەر مافێك کە یاسا دەیپارێزێت.

٣ – پەیـوەندی هۆکاریەتی(العلاقة السببية) لە نێـوان کردار و ئەنجامدا بە شێـوەیەك کە دەیسەلمێنێت کە ئەنجام دەگەرێتەوە بۆ کردار.

**پایەی مەعنەوی:** بریتیە لە ویستی گوناهکاریی(الارادة الآثمة) لکاو بە کردارێکی تاوانکارانە لە وێنەی مەبەستی تاوانکردن[1] یان وێنەی هەڵەکردن[2].

ئەوەی شایانی باسە کە ئەم سێ پایە گشتییە و هەموو تاوانەکان تییاندا هاوبەشن و بۆ خۆشیان پایەی تایبەتی خۆیانیان هەیە.

وە کاریگەری باروبۆخ لە سەر پایەی شەرعی واتە داماڵینی تاوانەکردار(الفعل الجرمی) لە سیفەتە تاوانکاریەکەی و گەڕاندنەوەی بۆ ئەو حاڵەتەی کە هەبیووە لە پێش بەتاوان داناندا کە حاڵەتی رەوا بوونە.

گرنگترین ئەو باروبۆخانەش کە کاردەکەنە سەر پایەی شەرعی سیانن:

١ ـ بەرگریکردنی شەرعی: دەقی یاساکانی سزای جەزایی هەموو وڵاتانی جیهانی لە سەرە ولەوانە و یاساکانی سزای ئێستای عێراقی[3] کە لە مادەی (٤٢) دەڵێت:(ئەگەر تاوانێك ماق بەرگریکردنی شەرعی بێت بە تاوان دانانرێت).

٢ ـ بەکارهێنانی ماف: لە مادەی (٤١)ی هەمان یاسادا ئەم دەقە دەڵێت:(ئەگەر کارێك بەکارهێنانی ماف برِیار لەسەر دراو لە لایەن یاساوە بێت، بە تاوان دانانرێت).

٣ ـ ئەرك بەجێهێنان(اداء الواجب): لە دەقی مادەی(٣٩)دا دەڵێت:(ئەگەر کارێك بۆ بەجێهێنانی ئەرکێك بێت کە یاسا فەرزی کردووە، ئەو کارە بە تاوان ئەژمار ناکرێت).

کەواتە ئەم بابەتە بەسەر سێ باسگەدا دابەش دەکرێت: یەکەم بەرگریکردنی شەرعی و دووەم بۆ بەکارهێنانی ماف و سێیەم بۆ راپەڕاندنی ئەرك.

---

[1] لەم حاڵەتەدا تاوانەکە بە ئەنقەست پێناس دەکرێت.

[2] لەم حاڵەتەشدا تاوانەکە بە (هەڵە/نا ئەنقەست) ئەژمار دەکرێت . تەماشای د. محمود نجیب حسنی ـ الموجز فی شرح قانون العقوبات المصری ـ القسم العام چ ١٩٦٧ لا ٢٤..وە د. محمود محمد مصطفی ـ شرح قانون العقوبات المصری ـ القسم العام چ ١٩٨٢ لا ١٧٩ پاشتر.

[3] ژمارە ١١١ ی ساڵی ١٩٦٩.

# باسگەی یەکەم:
# بەرگریکردنی شەرعی

بەرگری شەرعیانەی کاریگەر لەسەر پایەی شەرعی بریتیە لە: وەستان بە هۆکارێکی گونجاو دژی خەتەرێکی هەنووکەیی کە هەڕەشە لە مافێکی پارێزراو لە لایەن شەریعەت و یاساوە دەکات.

پایەکانی بەرگری شەرعی بریتین لە:

مەترسی و مافێك رووبە رووی مەترسی بوویێتەوە و وەڵامی گونجاو.

وە هەر یەك لەم پایانە مەرجی تایبەت بە خۆی هەیە بەم شێوەیە:

**أ ـ مەترسی: پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێت بۆ ئەوەی کاریگەریی هەبێت لەسەر پایەی شەرعی:**

١ ــ پێویستە سەرچاوەی مەترسییەکە کارێکی نارەوا بێت: کەواتە سەرباز مافی ئەوەی نی یە دژ بە فەرمانی گەورەکەی بەرگریبکات کاتێك فەرمانی پێدەکات بۆ بەرەو پێش چوون لە شەڕدا بەرانبەر بە دوژمن، چونکە مەترسی چاوەڕوانکراو سەبارەت بە فەرمانپێکراوەکە لە خودیخۆیدا و لە سەرچاوەشدا رەوایە، لەبەر ئەوەی کە بەرگرییەکی شەعی و یاسایی یە لە ناموس و سامان و گیان و وڵات.

٢ ــ پێویستە مەترسیەکە هەنووکەیی بێت: ئەمەش لە دوو حاڵەتدا دەبێت:

یەکەمیان ئەوەیە کە زۆر نزیك بێت کە بێتەدی بەڵام هێشتا نەهاتۆتە دی، گەر هاتیشەدی بەڵام بەردەوام نەبوو ئەوا تاوانەکاری دەستدرێژیکارەکە لە ژێر دەسەڵاتی گشتی یە.

٣ ـ پێویستە ویستی دەسدرێژیکار جیددی بێت: گەر دەسدرێژیکار بەگاڵتەوە وەهای دەنواند یان بە جیددی بوو بەڵام ئیمکانی روودانی نەبوو لەبەر هەبوونی نێوانێکی وەك رووبار یان قەڵاو شتی لەم شێوە، ئەوا لەو کاتەدا نابێت هێز بەکار بهێنرێت بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم مەترسی یە.

٤ ـ پێویستە ترسناکییەکە راستەقینەبێت: کەواتە هیچ حسابێك بۆ خەیاڵ و گومان ناکرێت، گەر لەسەر بناغەیەکی ئەقڵانی نەبوون.

٥ ـ پێویستە مەترسیەکە پێش دەستپێکردنی بەرگری و بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژییەکە تەواو نەبێت.

٦ ـ نابێ دستدرێژییەکە لە ئەنجامی کەمتەرخەمی دەستدرێژکارەوە بێت، گەر وەها بوو دەستدرێژیکار مافی بەرگری شەرعی نی یە، چونکە خۆی دەستپێشخەری لە دەستدرێژییەکەدا کردووە.

جا گەر کەسێك کوتوپڕ ژنەکەی یان ژنێکی تری مەحرەمی لە حاڵی زینادا بینی و پیاوەکەش هەوڵی کوشتنیانیدا، ئەوا هیچکامیان مافی بەرگری شەرعییان نیە.

٧ ـ پێویستە دەستدرێژییەکە تاوان بێت: کەواتە ئەو بازرگانەی کە کەلوپەلی ماوەبەسەرچووی هێناوەتە ناوەوەی وڵات بۆی نیە بەرگری بکات گەر دەسەڵاتی گشتی ویستی ئەو کەلوپەلە لەناو ببات، چونکە بۆ پارێزگارکردنە لە ژیانی بەکاربەر.

**ب ـ هەر لە مەرجەکانی پایەی دووەم ئەوەیە کە ئەو مافەی دەستدرێژی کراوەتە سەر** لەو مافانە بێت کە بە پێی یاسا پارێزراون، چونکە گەر مافەکە هیچ نرخێکی یاسایی نەبوو، ئەوا دروست نیە بەرگری لێ بکرێت، وەك ئەوەی کەسێك سزایەکی شایانی بەسەردا سەپێنرابوو، رێگری لە جێبەجێکردنی بکات و بەرگری لە خۆی بکات بە بیانووی ئەوەی بەرگری شەرعی دژی مەترسیەك دەکات.

ج ـ لە مەرجەکانی پایەی سێهەم:

١ ـ دەبێ بەکارهێنانی هێز بۆ لابردنی دەستدرێژیەکە پێویست و لازم بێت.

٢ ـ پێویستە هێزی بەکارهێنراو بۆ بەرگری تەنها هۆکارێت بۆ گەشتن بە ئامانجی لابردنی مەترسی.

بۆیە مافی بەرگری شەرعی بوونی نیە گەر هەرکات دەتوانرا لە کاتی گەنجاودا پشت ببەستین بە دەسەڵاتی گشتی یان بە هەر لایەنێکی تر کە مەترسیەکە لاببات.

٣ ـ پێویستە هۆکاری بەرگرییەکە گونجاوبێت لەگەڵ ئەندازەی مەترسی دەستدرێژییەکە: خۆ ئەگەر بەربەرچدانەوەکە بەهێزتر و توندتر بوو، ئەوا بەرگریکارەکە لە سنوور دەرچووە و بەرپرسە لەو ئەندازە سنووریەزاندنە.

کەواتە بەرگریکردنی شەرعی ئەگەر پایەکانی و مەرجەکانی تێدابوو و هیچ بەربەستێکی لە بەردەمدا نەبوو، کاردەکاتە سەر تاوانەکردار و دەیگۆڕێت بۆ دروستەکردار(الفعل المباح) و رزگاری دەکات لەوەی کە بە کارێکی تاوانکارانە دابنرێت.

وە یاسانوێکانی سزادان لە وڵاتەعەرەبیەکاندا باسی باروئۆخی بەرگری شەرعی کاریگەر لە تاوانەکرداردا و گۆڕینی بۆ دروستەکردار و گێڕانەوەی بۆ دۆخی پێش بە تاواندانان(التجریم).

هەندێك لەو یاسایانە:

یاسای ئێستای سزادانی عێراقی(م.٤٢)، میسری(م.٢٣٢)، سوری(م.١٨٣)، لوبنانی(م.١٨٤)، ئوردونی(م.٦٠)، جەزائیری(م.٣٩)، تونسی(بەندی ٣٩)، مەغریبی(م.١٤٢).

بەڵام زۆربەی ئەم یاسایانە خەوشدارن، چونکە هۆکانی رێپێدان(اسباب الاباحه) و بەربەستەکانی بەرپرسیاری سزاییان تێکەڵ کردووە، بۆیە هەندێك لە بەربەستەکانیان کردۆتە هۆکانی رێپێدان. هەروەها بەرپرسیارنەبوونی سزاییان تێکەڵ کردووە لەگەڵ نەبوونی سزادا و زاراوەی دووەمیان لەبری یەکەم بەکارهێناوە[1]

## بناغەی بەرگری شەرعی :

بناغەی هەموو شتێك بریتیە لەوەی کە بونیاتی ئەو شتەی لەسەر دەنرێت، بناغەی بەرگری شەرعیش لە سەرچاوە و توخمەکانیدا نیە، بەڵکو پاساوی فەلسەفی رەوابوونیەتی و لەوێشەوە کردنیەتی بە هۆیەك لە هۆکانی گۆڕینی تاوانەکردار بۆ دروستەکردار بە داماڵینی لە ئاکار(سیفەت)ە تاوانکارییەکەی و دەرهێنانی لە بازنەی ئەو دەقەی کە بە

---

[1] بۆ درێژەی پتر سەیری نوسراومان: أسباب باحه الاعمال الجرمیه، لا ٧٦ و پاشتر.

تاوانی داناوە، لەسەر بنەمای(قاعدە)ی تایبەتکردنی گشتی(تخصیص العام) یان سنووردارکردنی رەها(سنووردارکردنی رەها).

گەلێك تیۆری لەبارەی دیاریکردنی بناغەی بەرگریکردنی شەرعییەوە هەیە کە هیچکامیان خاڵی نیە لە کەلێنێك یان ناتەواویەك یان نەگونجانی لەگەڵ واقیع و راستیدا. وا لێرەدا بە کورتی بەناوبانگترین و گرنگترین ئەو تیۆریانە باس دەکەین:

**یەکەم ـ تیۆری زۆرلێکردنی مەعنەوی[1]:**

ناوەرۆکی ئەم تیۆرە ئەوەیە کە بەرگری شەرعی پشت دەبەستێت بە چەند ئیعتیباراتێکی کەسیی، کە لە نەفسییەتی تاوانلێکراو وەرگیراوە و کاریگەریوونی بە فشارێکی ناڕەوا لە کەسێکی ترەوە کە ترس و لەرزێك لە دڵیدا دروست دەکات و پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەو شتەی کە پێی خۆش نییە کە بیکاتنەگەر زۆرکاریی تێدا نەبێت.

پێی وایە ئەو کارەی بەرگریکار دەیکات دژی دەستدرێژکار هەڵقوڵیوی ئەو حاڵەتی ترسەیە کە توشی دەبێت و لە پێداویستییەکانی غەریزەی خۆنەویستی یە، کەواتە هیچ بوارێك نامێنێتەوە بۆ بەرپرسبوونی مادام بە بژاردەی خۆی تاوانەکەی نەکردبێت، بەزۆر پێی کراوە و بەبێ ویست و هێزی خۆی بۆ ئەم تاوانە راکێشراوە، کەواتە کارەکەی پشتنەستوور نیە بەو هەڵەیەی، کە گرنگترین پایەی بەرپرسیارێتیە و ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی سەردەمی نوێی ئەڵمانیا لەگەڵ ئەم تیۆریەن[2]

وە ئەم تیۆریەش لە چەند روویەکەوە رەخنەی لێگیراوە وەك:

١ ـ بێگومان بەرگریکار ئەوەی کە دەیکات بە بژاردە و ویستی ئازادانەی خۆی و تێگەشتنی هۆشمەندانەی خۆیەتی و ئەو کاتەی بڕیار دەدات مەترسی دەستدرێژیەکە چەندە خاوەنی هێزە عەقڵیو جەستەییەکانیەتی سەرەڕای بەرتەسکی بواری بژاردەی بۆ لابردنی دەستدرێژییەکە هۆی گونجاو هەڵدەبژێرێت.

٢ ـ زۆرلێکران چ مەعنەوی یان مادی بێت خۆی لە خۆیدا بەربەستێکە لەبەردەم بەرپرسیاریەتی سزاییدا، وە ئەم بەربەستەش بە شێوەیەکی رەها گشتی ترە لە هۆی بە

---

[1] لە فیقهی ئیسلامیدا بە (الاکراه الملجئ) ناودەبرێت.

[2] مامۆستای دوکتور محمد مصطفی القللي لە پەرتووکی : المسؤلیة الجزائیة، لا ٣٠٥ .

رەوادانان(ئیباحە)، ئیتر چۆن دەکرێتە بناغەی بەرەوادانانی بەرگری شەرعی و داماڵینی کردار لە ئاکارە تاوانییەکەی و لەوێشەوە بەرەو لابردنی بەرپرسیاریەتی سزایی و مەدەنی؟

٣ ـ گریمان بناغەکە زۆرلێکرانە لە حاڵەتی بەرگری شەرعی لە ژیان و ناموس وسامانی، ئیتر چۆن دەکرێت ببێتە بناغە لە حاڵەتی بەرگریکردن لە ژیانی کەسی تر لەگەڵ ئەوەشدا لەم حاڵەتەدا بە بژاردە و ویستی ئازادانەی خۆی بەم کارە هەستاوە.

٤ ـ قبوڵکردنی ئەم تیۆر یە دەبێتە هۆی لێنەپێچینەوە لەو تاوانبارەی کە لە دادگەری هەڵاتووە و بەرهەڵستی دەستگیربونی دەکات لە لایەن دەسەڵاتی گشتیەوە، چونکە لەم حاڵەتەدا خۆی بە ناچارکراو دەزانێت لەو بەرهەڵستیەدا بە پێی غەریزەی خۆی و بەرهەڵستی ئەو شتە دەکات کە لە قازانجی نیە.

کەواتە لە سەر بناغەی ئەم رەخنەو تێبینیانە زۆرلێکران بە کەڵکی ئەوە نایەت کە بکرێت بە بناغەیەك بۆ بەرگری شەرعی.

**دووهەم ـ تیۆری پاداشتی خراپە بە خراپە:**

ناوەرۆکی ئەم تیۆریە ئەوەیە( ئەو کارەی بەرگریکار پێی هەڵدەستێت کارێکی تاوانکارانەیە کە بەهۆیەوە تاوانی دەستدرێژکار لە سەر خۆی لا دەبات).

ئەمەش لە کرداری هەڵوەشاندنەوەی دووقەرزی بەرانبەر(مقاصە) دەچێت لە بابەتی (قەرزەکان و پابەندبوونی مەدەنیدا)، بناغەکە ئەوەیە کە لابردنێکە لە نێوان خراپەی دەستدرێژیکار و خراپەی دەستدرێژلێکراودا، خۆ ئەگەر بەم شێوە یان بە سزادان لاچوو ئیتر هیچ پاساوێك نامێنێتەوە بۆ لێپێچینەوە لە بەرگریکار، چونکە پاداشتی خراپە بە خراپە نابێتە هۆی پاداشتی سزایی(الجزاء العقابي) و پاداشتی مەدەنی(الجزاء المدني)، بۆیە بەرپرسیارێتی مەدەنی و سزایی رووبەرووی بەرگریکار نابێتەوە.

ئەم بناغەیەش لە چەند روویەکەوە قسەی لەسەر دەکرێت:

١ ـ بێگومان لە هەڵوەشاندەوەی دوو قەرزی بەرانبەردا(مقاصە) دەبێ هەردولاکەی یەکسان بن و ئەمەش لە بەرگری شەرعیدا بەدینایەت کاتێك خراپەی دەستدرێژکار تەنها هەڕەشەکردن بێت بە مەترسییەکی هەنووکەیی و خراپەی دەستدرێژلێکراو رەنگە کوشتن بێت.

٢ – تێکەڵکردنی ئەم رایە لەگەڵ بەرگری شەرعی و مافی سزاداندا، یەکەمیان سزا نیە بەڵکو هۆیەکە بۆ لابردنی ترسناکیەکی نزیك.

٣ – ئەگەر ئەوقسەیە راست بێت کە بەرگری شەرعی پاداشتی خراپەیە بە خراپە، ئەوا دەسەڵاتی گشتی رەوا نەبوو بۆی کە سزای دەستدرێژیکار بدات لەسەر تاوانی دەستدرێژیکردنی پاش وەڵامدانەوەی بە بەرگریکردن ئەگەر بەرگرییەکە نەبووە هۆی تیاچوونی یەکجارەکی جەستەی، چونکە ناکرێت دووجار کەسێك لەسەر تاوانێك سزا بدرێت، لە کاتێکا ئەگەر بەرگریکار پاش دەستدرێژیکردنی و دوورخرانەوەی ئەگەر لە ژیاندا بوو دەدرێتە دادگا بۆ لێپێچینەوە و لێپرسینەوەی.

### سێهەم ـ تیۆری پێکدادانی بەرژەوەندیەکان و تەرجیحدانی مەسلەحەتی بەرگریکار:

ئەم تیۆرە لەسەر بناغەی بیرۆکەی هاوسەنگی نێوان مەسڵەحەتە دژیەیەکان دەوەستێت، چونکە یاسا هەروەك مافی دەستدرێژی لێکراو دەپارێزێت مافی دەستدرێژیکاریش دەپارێزێت، بەڵام دەستدرێژیکەر بە دەسپێشخەریکردنی بە تاوان مافی خۆی لەدەست داوە، بۆیە یاسا بە رەوای دەزانێت کە مافی کەمنرخ(مەسڵەحەتی دەستدرێژیکار) بکاتە قوربانی بۆ پاراستنی مەسڵەحەتی نرخدارتر و گرنگتر(مەسڵەحەتی دەستدرێژی بەسەرداکراو).

ئەم تیۆریەش لە چەند روویەکەوە رەخنەی لێدەگیرێت:

١ – ئەسڵ لە یاسادا ئەوەیە کە مافی هەمووکەس دەپارێزێت بە بێ سەرنجدان لە پلەی گرنگیی ئەو کەسە، کەواتەپلەبەندی بۆ گرنگی کەسەکان نیە لە رووی پاراستنی یاساییەوە.

٢ – ئەگەر ئەوە راست بێت کە دەستدرێژیکار هیچ نرخێکی یاسایی نەمێنێت وەك ئەو مافەی کە دەستدرێژی کردۆتە سەر، ئەوا ئەنجامی لۆجیکی ئەوەیە کە سامانی دز هیچ نرخێکی یاسایی نامێنێت بە هۆی دەستدرێژیکردنە سەر سامانی کەسانی ترەوە و ئەو کەسەی تاوانی ناموسی دەکات نرخێکی یاسایی بۆ ناموسی نامێنێت و...هتد. ئەمەش لە لۆجیکی شەرع و یاسادا نیە.

٣ ـ ئەم بایسسازییە بۆ پاساودانی بەرگری شەرعی و ئەژمارکردنی بە یەکێك لە هۆکانی بە رەوادانان و لابردنی زەمانەتی سزایی و زەمانەتی مەدەنی، گەر بوونی سەلمێنرا بۆ ئەو

دەستدرێژکارانەی کە شیاویان هەیە، ئەوە پاساوی بەرگری شەرعی نییە دژ بەو کەسانەی شیاوییان نیە لە حاڵەتی دەستدرێژییان بۆ سەر مافی کەسی تر، چونکە ناتوانین ئەوەیان بدەینە پاڵ کە مافی کەسێکیان خواردووە بە ویستی خۆیان و مافی بەیاساپارێزراوی خۆیانیان نەهێشتووە.

### چوارەم ـ تیۆری سەرکەوتنی یاسا:

لایەنگرانی ئەم تیۆریە پاساوی بەرگری شەرعی ئەدەن و بە هۆیەك لە هۆکانی بە رەواداانی دەزانن، چونکە لایان وایە کە دەستدرێژیکردنی تاوانکارانە بەهیچزانینی فەرمانی یاسایە و لابردنی ئەم بەهیچزانینەیە و بەهیچزانینی بەهیچزانینیش لە خۆیدا جێگیرکردن و دانپێدانانە، کەواتە لابردنی دەستدرێژی بە دەستدرێژی پشتیوانکردنی یاسا و سەرخستنیەتی.

یەکێك لەو رەخنانەی دەکرێت لەم تیۆریە بگیرێت ئەوەیە کە ئەگەر ئەم بیرۆکەیە راست بێت ئەوا هەمووکەس دەتوانێت ببێتە نوێنەری دەسەڵاتی گشتی مادام ئاکارەکانی یاسا سەربخات و پشتیوانی لە یاسا بکات، بەڵام ئەمە قبووڵکرلو نیە، چونکە بەرگریکردن لە تاك و کۆمەڵگە لە دیاردەکانی باڵادەستی دەوڵەتن، بەڵام دەستخستنە ناو کاروباری تاك و دەوڵەتەوە بە بێ پاساوێکی یاسایی، ئەوە دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ئەم باڵادەستییە.

### پێنجەم: بیرۆکەی گەڕانەوە بۆ ئەسڵ:

ئەم تیۆری یە دەڵێت: ئەسڵ ئەوەیە کە هموو تاکێك بەرگری لە خۆی بکات، وەك ئەوکاتانەی کە دەوڵەت بوونی نەبووە. بەڵام پاش دامەزراندنی دەوڵەت مافی بەرگریکردن لە تاك دەگوازرێتەوە بۆ ئەو کۆمەڵگەیەی کە دەولت نوێنەرایەتی دەکات، چونکە کۆمەڵگە(دەوڵەت) لەم بەرگریکردنەدا بەتواناترە :خۆ ئەگەر ئەو دەسەڵاتی گشتی یەی کە نوێنەری کۆمەڵگەیە نەیتوانی فریای تاکێك بکەوێت کە رووبەرووی مەترسیەکی زۆر نزیك بۆتەوە لەوکاتەدا کەدەستدرێژی دەکرێتە سەر ی ئەوا ئەو تاکە دەتوانێت مافی سەرەکی خۆی بسەنێتەوە و پارێزگاریی لە خۆی و ناموسی و سامانی بکات، چونکە کۆمەڵگە ناتوانێت بیپارێزێت یان ئامادە نیە بیپارێزێت.

دیارە چەند تێبینییەك لەسەر ئەم بیرۆکە یەش:

١ – ئەم بیرۆکەیە تا ئەندازەیەکی زۆر کاریگەرە بە تیۆریی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ژانژاك رۆسۆ و هاوبیرەکانی لەو مەسەلەیەدا کە دەڵێت تاکەکان وازیان لە مافی خۆیان هێناوە لە بەرانبەر پاراستنیان لە لایەن کۆمەڵگەوە. بەڵام ئەم بیرۆکەیە تەنها لە خەیاڵدا بوونی هەیەو بەس، وە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بوونێکی واقیعی نییە. لە سەردەمێکدا کە پەیوەندی نێوان خێزانەکانی مرۆڤایەتی بە هۆی نەبوونی هۆکانی گواستنەوە و دووریيان لە یەکدیەوە بە شێوەیەك هەندێکیان جێگای هەندێکیان نازانن، ئەوە بە بیردا نایەت کە پەیمانێکی وەها لەگەڵ یەکدی ببەستن.

٢ – لەم بیرۆکەیەدا بەرگری و سزا تێکەڵ کراوە، چونکە کاتێك تاك پێش دەوڵەت بەرگری لە خۆی دەکرد، بەرگری یەکەی لەسەر بناغەی سزادانی دەستدرێژیکەر بووە.

٣ – ئەگەر ئەم بیرۆکەیەشمان بە ناچاری سەلماند بە پاساوی بەرگریکردن لە مافێکی کە کەوتوەتە مەترسیەوە، هێشتا نابێتە پاساوێك بۆ بەرگریکردن لە مافی کەسێکی تر، لە کاتێکدا بەرگری شەرعی گشتییە و بەرگری لە مافی بەرگریکار و کەسی تریش دەگرێتەوە گەرچی ئەو کەسەش پەیوەندی پێوەی نەبێت.

### شەشەم ـ بیرۆکەی نیازپاکی (الباعث الشریف):

ئەم بیرۆکەیە دەڵێت: دەستدرێژیی دەستدرێژکار بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی کەسانی تر نیشانەی مەترسی ئەو کارەیە لەسەر کۆمەڵگە و بەرگریکاریش کاتێك دژی دەوەستێت تەنها ئەو کارە ئەنجام دەدات کەخزمەت بە کۆمەڵگە دەکات و ترسی ئەو دەسدرێژکارە دوور دەخاتەوە. کەواتە کارەکەی لە بابەتی دادگەری کۆمەڵایەتیە و قازانجی کۆمەڵگە لەوەدایە رەگەکانی ئەم ترسناکی یە هەڵبکەندرێت. کاری بەرگریکاریش لەم واقیعەوە هەڵدەقوڵێت، بۆیە بە یەکێك لە هۆکانی بەرەوادانان (اباحە) ئەژمار دەکرێت هەموو جۆرە بەرپرسیارییەکی لەسەر لادەبات.

تێبینی ئەوە لە سەر ئەم بیرۆکەیە دەکرێت کە هەردوو لە دەستدرێژیکار و دەستدرێژیلێکراو بە کەسانی خراپ و ترسناك بۆ کۆمەڵگە دانانێت، کۆمەڵگەش هیچ بەرژەوەندیەکی نیە لە هێشتنەوەی یەکیان و لەناوبردنی ئەوی دی.

## حەوتەم ـ پاراستنی مەبەستەکانی شەرعدانەر و بەرژەوندیەکانی خەڵک:

ئەم بنەمایەی بەرگریی شەرعی ئەو بنەمایە کە هەر لە سەرەتاوە شەریعەتی ئیسلام دانیپێدا ناوە، چونکە مەبەستەکانی شەریعەت و یاسا بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی تاك و کۆمەڵگەیە. دەقی قورئانی پیرۆزیش ئەم راستی یەی نواندووە کاتێك دەفەرموێت﴿وما ارسلناك الا رحمة للعالمين﴾. ئەوەش ئاشکرایە کە لە زانستی رەوانبێژی عەرەبیدا دەربڕینێك کە هەڵاوێردن پاش نەفی( الاستثناء بعد النفي) تێدا بێت بۆ (حصر )بەکاردێت، کە مەبەستی دەربڕینەکە تەنها روو لەو مەسەلەیە دەکات کە پاش وشەی (هەڵاوێردن ـ استثناء) دێت. خودای مەزن مەبەست و ئامانجی لە ناردنی پەیامی ئیسلام تەنها بەدیهێنانی قازانجی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی یە، چونکە رەحمەت بە واتای قازانج و بەرژەوەندی مرۆڤەکانە، چ مەسڵەحەتی ئەرێنی بێت( بەدیهێنانی سوود) چ بەرژەوەندی نەرێنی بێت(لابردن و دوورخستنەوەی زیان) چ مادی بێت چ مەعنەوی، یان دونیایی یان پەیوەندی بە دوارۆژەوە بێت.

کەواتە بەرگریکردن لە بەرژەوەندیی رەوا بە ئەرك دادەنرێت، چ لە لایەن دەسەڵاتی گشتی یەوە بێت یان لە لایەن تاکەوە، چونکە هەمووکەس بەرپرسە لەم پاراستنە، هەروەك پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت(كلكم راع وكلكم مسئول عن رعيته) واتە: هەمووتان شوان و سەرپەرشتیارن وبەرپرسی ئەوانەن کە لە بەردەستاندایە).

ئەگەر مافی بەرگریکردن بسێنینەوە لەو کەسانەی تووشی مەترسیەکی واقیعی دەبنەوە، ئەمە دەبێتە هۆی هەڵنانی خراپەکاران کە بەردەوام بن لە دەستدرێژیکردنە سەر گیان و ناموس و سامانی بێتاوانەکان، چونکە بە تەنها دەسەڵات ناتوانێت تاوانەکان قەڵاچۆ بکات. لەسەر ئەم بناغەیە بەرپرسیارێتی مەدەنی و تاوانکاریی روو لەو کەسە ناکات کە رۆڵی هەیە لە بەدەستهێنانی سەقامگیری و ئاسایش و دوورخستنەوەی مێردەزمەی ئاژاوە و خراپە لە تاك و کۆمەڵگە.

## باسگەی دووەهەم:
## بەکارهێنانی مافی کەسیی

ئەو مافەیە کە یاسا دانی پێدا دەنێت ئەگەر پایە و مەرجە یاساییەکانی تێدا بوو و بەربەستیشی لە بەردەمدا نەبوو.

لە گرنگترین مەرجەکانی:

١ – بوونی مافێکی بڕیاردراو بە پێی یاسا: مەبەستیش لە یاسا لەم مەرجەدا بنەمای یاسایی یە بە رەهایی و مەرج نی یە لە دەسەڵاتی یاسادانانەوە دەربچێت.

٢ – بەکارهێنانی ماف: پێویستە کارەکەی زەروور بێت بۆ بەکارهێنانی ئەم مافە.

٣ – پێویستە بەکارهێنانی ماف لە لایەن خاوەن مافەکەوە بێت. کەواتە تا یاسا سەرپشکی نەکات کەس ناتوانێت بەکاری بهێنێت.

٤ – پێویستە کارەکەی لەو سنوورەدا بەکاربهێنێت کە بۆ مافەکە دیاری کراوە.

ئاشکرایە کە هەموو مافێك سنووری خۆی هەیە و تێپەڕاندنیشی یان خراپ بەکارهێنانی وەك بەکارنەهێنانی ئەو مافە وەهایە.

٥ –پێویستە نییەتی باش بێت: گەر بەکارهێنانی ماف زیانی بە کەسانی تر گەیاند، ئەوا بەکارهێنانی رەوا نیە.

٦ – پێویستە مافەکە هیچ کێشەیەکی لەسەر نەبێت: گەر مافەکە کێشە و راجیایی لەسەر بوو ئەوا ئەو کەسەی بە هی خۆی دەزانێت بۆی نیە بەکاری بهێنێت و دەبێ ئەو رێگایە بگرێتە بەر کە یاسا دایدەنێت بۆ ساغکردنەوە و روونکردنەوەی مافەکان کە رێگای دادوەری یە.

### لە گرنگترین ماف بەکارهێنان:

ا ـ تەمبێکردنی ژن لە لایەن مێردەوە بە پێی فەرمانەکانی شەریعەتی ئیسلام.

ب ـ تەمبێکردنی منالّی نارەسا(القاصر) لە لایەن سەرپەرشتیارەکەیەوە، کە تەمەنی نەگەشتبێتە پازدە ساڵ، یان گەشتبوو بەڵام کرابوویە سەرپەرشتیاری پەروەردەکردنی تا تەمەنی بالّغبوونی.

ج ـ مافی وەرزشکردن: بە مەرجێك یاریزان پابەند بێت بە مەرجەکانی وەرزشکردنەوە بە پێی ئەو یاساکانی وەرزش کە لەو وڵاتەدا هەیە یان بە پێی ئەو یاسا گشتیە نێودەوڵەتییانەی پەیوەندی بە رێکخستنی ئەم یارییانەوە هەیە.

د ـ مافی دەرمانکردنی نەخۆشەکان لەگەڵ رەچاوکردنی ئەم مەرجانەی خوارەوە:

١ — مۆڵەتی یاسایی هەبێت بۆ چارەسەر.

٢ —کارەکەی بە مەبەستی چارەسەر بێت.

٣ — نەخۆش یان کەسوکاری بەم چارەسەرە رازی بن.

٤ — هیچ کەمتەرخەمی یەك لە لایەن پزیشکەوە لە ئارادا نەبێت.[1]

کاریگەری ئەو بارودۆخەی باسمانکرد لە سەر پایەی شەرعی ئەوەیە کە تاوانەکار دەگۆڕرێت بۆ کارێکی رێپێدرلو وەك ئەوکاتەی کە بە تاوان ئەژمار نەکرابوو، ئەوکەسەش بەم کارە هەڵدەستێت روو بە رووی بەرپرسیاریەتی جەزایی و مەدەنی نابێتەوە.

لەو یاسا جەزاییە عەرەبیە نوێیانەی باسی لە بەکارهێنانی ماف بە باس و چارەسەر کردوە و یەکێك لە هۆکانی بەرەوادانان و دۆخێك لە دۆخە کاریگەرییەکان لە پایەی شەرعیدا:

یاسای ئێستای سزاکانی عێراقی (م.٤١)، سوریا(م.١٨٢)، لوبنانی(م.١٨٣)، ئوردونی(م.٥٩)، کوەیتی(م.٢٨)، تونسی(بەندی ٤٢)، میسری(م.٦٠)، جەزائیری(م.٣٩).

کەچی یاسادارێژی عێراقی سەرکەوتوو نەبووە لە(م٤١/٤)، (ئەو کارە توندوتیژانەی دەکرێت بەرانبەر ئەو کەسەی تاوانێکی گەورە یان بچووکی کردووە بە مەرجی کۆنترۆڵ و چواچێوەداربوونی رێگای پێ دەدرێت).

ناوەرۆکی ئەم بەندی چوارەمە لە بابەتی بەکارهێنانی مافدایە، بەڵام لە راستیدا لە بابەتی بەجێهێنانی ئەرکدایە.

[1] د. مەحمود مەحمود مصطفی ـ سەرچاوەی پێشوو. لا ١٦٠ و پاشتر.

## باسگەی سێیەم:
## ئەرک بەجێهێنان یان (بەکارهێنانی دەسەڵات)

یەکێك لەو بارودۆخانەی کار دەکەنە سەر تاوانەکردار بریتیە لە بەجێهێنانی ئەرك و بەکارهێنانی دەسەڵات بێت بۆ سەڵاحیەتەکانی جا ئەو دەسەڵاتە یاسادانان بێت یان دادوەری یان راپەڕاندن.

ئاشکرایە کە پێویستە لە هەموو وڵاتێکدا ئەم سێ دەسەڵاتە هەبێت کە دەستوور سەڵاحیات و تایبەتکاریی دیاری دەکات، بەڵام بەکارهێنانی ئەم سەڵاحیەتانە رەنگە هەندێك جار زیان بە کەسانی تر و مەسڵەحەتی خۆشی بگەیەنێت کە یاسا دەیانپارێزێت.

وە لەبەر ئەوەی مەبەست لەم بەکارهێنانەی دەسەڵات پاراستنی قازانجی گشتی یە(پاراستنی گیان و نامووس و سامان و ئاسایش) ئەوا پێویستە رەچاو بکرێت و پێش بخرێت بەسەر پاراستنی قازانجی تایبەتیدا گەر دژ بەیەك وەستانەوە، بە پێی ئەو بنەما گشتی یەی کە یاسا و شەریعەت یەکدەنگن لە سەری(ئەگەر قازانجی گشتی و تایبەتی تێکگیران، ئەوا پێویستە گشتی پێش بخرێت بەسەر تایبەتیدا).

مەبەستیش لەو دەسەڵاتەی کە بۆی هەیە دەستکاری بەرژەوەندی کەسانی تر بکات لە سنوورە یاساییەکاندا هەرکاتێك قازانجی گشتی بخوازێت: ئەو کەسەیە کە داوای لێکراوە خزمەتی قازانجی گشتی بکات بە شێوەیەکی هەمیشەیی یان کاتی.

لە گرنگترین مەرجەکانی بارودۆخی بەکارهێنانی دەسەڵاتی گشتی بۆ کاریگەریدانان لەسەر تاوانەکردار و گۆڕینی بۆ رێپێدراو ئەمانەیە:

١ ـ دەبێ ئەوکەسەی کە هەندێك دەسەڵاتی گشتی بە دەستە چ هەمیشەیی بێت یان کاتی ئەم سیفەتەی بە پێی یاسا و گەڵاڵەنامەکان و رێنوماییە وەزارییەکانەوە وەرگرتبێت یان لە لایەنێکی فەرمی ترەوە دەرچووبێت، چ مووچە وەربگرێت لە سامانی گشتیەوە وەك کارمەندە دامەزراوەکانی فەرمانگەکانی دەوڵەت بە شێوەیەکی یاسایی فەرمی، یان خۆبەخش بێت هەروەك چۆن فەرمان بە چاکە

دەکات و ئامۆژگاری خەڵك دەکات بۆ دوورکەوتنەوە لە خراپە، کاتێك مەرجەکانی ئەم کارە گرنگەی تێدا بێت[1].

٢ – لەلایەن سەرۆکەکەیەوە فەرمانی بۆ دەربکرێت بۆ کردنی ئەم کارە گەر کارمەند بوو لە سنووری دەسەڵاتی یاساییدا گەر گوێڕایەڵی سەرۆك واجب بێت یان کارمەندەکە باوەڕی وابوو کە گوێڕایەڵی سەرۆك واجبە، گەر ئەم باوەڕە پاساوی عەقڵی هەبوو.

٣ – پێویستە نیازی پاك بێت، جا ئەگەر کردەوەکە لە کارمەندێکی ئاساییەوە بوو بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی سەرۆکەکەی و کارەکە پێچەوانەی یاسا بوو، ئەوا پێویستە نیەتباشی کارمەندەکە ئەم دوو توخمەی تێدا بێت:

یەکەم: پێویستە ئەو کارمەندە لە دۆخێکی وەهادا بێت کەیاسا داوای گوێڕایەڵی سەرۆکەکەی لێ بکات یان بە چەند هۆکارێکی مەعقول باوەڕی وابێت.

دووەم: باوەڕی وەهابێت کە ئەو کارەی کە دەیەوێت بیکات ڕەوایە، چونکە گوێڕایەڵی لە ژێردەستێکەوە بۆ سەرۆکەکەی لە سەرپێچیکردنی یاسادا دروست نیە، مەگەر ئەم سەرپێچییە لەبەر بەرژەوەندی گشتی بێت.

٤ – دڵنیابوون و پشکنین و نەبوونی گومان لە ڕەوایی و دروستیی ئەو ئیجرائاتەی ئەو کارمەندە دەیکات لە حاڵەتەکانی بەکارهێنانی دەسەڵاتدا.

بۆ نموونە ڕەوا نیە کە بچێتە ناو حەرەمی ماڵێك بە بێ مۆڵەتی پێشینەی خاوەنەکەی یان لایەنی پەیوەندیدار.

وە ڕەچاوکردنی ئەو ڕێوشوێن و رووکەشکارییانەی یاسا فەرزی دەکات لە حاڵەتی دەستدان لە مافی کەسێکی تر پێویستە لە سەر هەرکەسێك کە دەسەڵاتی بەکاردەهێنێت بۆ ئەرك ڕاپەڕاندن. وە ئەگەر ئەو مەرجانەی ناویران و مەرجەکانی تریش هاتە دی کە یاسا داوای دەکات، هەڵسوکەوتی کارمەندەکە بە پێی یاسا دروستە و ڕێگا پێدراوە و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەرپرسیاریەتی سزایی و مەدەنی نەبێت[2].

---

[1] سەیری نووسراومان (الاباحة في موضوع الدفاع الشرعي العام الدلخلي).

[2] د. نجيب محمود حسني، سەرچاوەی پێشو لا ١٧١ و پاشتر.

لەو یاسا سزاییە نوێیانەی لە وڵاتە عەرەبیەکاندا کە چارەسەری بابەتی ئەرك بەجێهێنان باس دەکات وەك هۆیەك لە هۆکانی رێگاپێدانو نۆخێکی کاریگەر لە پایەی شەرعیدا: یاسای ئێستای سزادانی عێراقی(م.٣٩)، میسری(م.٦٣)، کوەیتی(م.١٣٧)، مەغریبی(بەندی ١٢٤)، لوبنانی(م.٢٢٦)، سوری(م.٢٢٢)، لیبی(م.٦٣ – ٦٩)، ئوردونی(م.٦١)، بەحرەینی(م.٢٢).

هەموو ئەو پراکتیزە یاساییانەی لە بەندی یەکەمدا باسکرا لە بابەتی کاریگەریی ئەو نۆخە کاریگەرانە دادەنرێت کە کاردەکاتە سەر پایەی شەرعیی تاوان و دەشکەوێتە ژێر کاریگەریەوە. ئەنجامی ئەم کاریگەریی و کارتێکرانەش لە رووی فەلسەفیەوە بریتیە لە گۆڕانی تاوانەکردار بۆ رێگاپێدراو(مباح) وەك ئەو کاتەی کە بە تاوان دا نەنرابوو .

# بەندی دووەم:
# ئەو بارودۆخانەی
# کاردەکەنە سەر پایەی مەعنەوی

ئەو بارودۆخانەی کار دەکەنە سەر پایەی مەعنەوی تاوان یان کەسیی نائارەزوومەندانە یان ئارەزوومەندانەیە یان دەرەکی نائارەزوومەندانەیە، وە (کەسیی)ش یان خودی(ژاتی) یە یان رواڵەتیە (عرج)ی یە.

لەسەر ئەم بناغەیە لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەم بارودۆخانەوە لە رووی فۆرمیەوە دابەشدەکرێت بەسەر بە پێنج باسگەوە، یەکەم بۆ منداڵی، دووهەم بۆ شێتی، سێهەم بۆ سەرخۆشی، چوارەم بۆ زۆرلێکران، پێنجەم بۆ زەرورەت.

## باسگەی یەکەم:
## بارودۆخی منداڵی

ساوایی(بچووکی): دۆخێکی ناوەکی زاتی یەو خۆویست نیە. بەوەش دەبێتە ئاکارێکی زاتیی لکاو بە مرۆڤەوە و لەگەڵ لەدایکبوونیدا پەیدا دەبێت و بە هیچ دەسکاریکردنێك لێی جیا نابێتەوە تا تەمەنێکی دیاریکراو لەگەڵی بەردەوام دەبێت. ئەم دۆخەش تاوانەکردار ناگۆڕێت بۆ رێگاپێدراو بەڵکو سیفەتە تاوانیەکەی دمێنێتەوە بەڵام لەگەڵ پایەی مەعنەویدا کۆنابێتەوە تا ئەو کاتەی منداڵەکە دەچێتە تەمەنی هەراشیەوە(التمیین)، کە لە دۆزە مەدەنی و یاسادانراوە عێراقیەکاندا تەواوکردنی حەوت ساڵو چوونە ناو هەشتساڵی یە.[1]

---

[1] یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێکراو ژمارە ٥ ساڵی ١٩٥٠. مادەی (٢/٩٧).

بەڵام لە دۆزە سزاییەکاندا تەواوکردنی تۆساڵی و چوونە ناو دەساڵی یە.[1] کەواتە هەر مرۆڤێك تاوانەکردارێکی کرد و لە خوار تەمەنی هەراشیەوە هیچ داوایەکی جەزایی لەسەر تۆمار ناکرێت و لە رووی جەزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت و سزا نادرێت، بەڵام لە رووی مەدەنیەوە دەبێ ئەو زیانانە ببژێرێت کە بە کارە نادروستەکەی بە سامانی خەڵکی گەیاندووە، ئەنجا ئەگەر خۆی پارەی هەبوو ئەوا لە پارەکەی قەرەبووەکە دەدرێتەوە، وەگەرنا سەرپەرشتیارەکەی(وەلی ئەمر) بۆی دەبژێرێت و پاشان کەی سامانی هەبوو لێی وەردەگیرێتەوە[2]

ئەمەش بە پێچەوانەی فیقهی رۆژئاوا و یاسا عەرەبیە کاریگەرەکان پێی وەك یاسای میسری و سووری کە ئەو کەسەی لە خوار تەمەنی هەراشیەوە بێت هیچ بەرپرسیارییەکی جەزایی و مەدەنی نی یە، نهێنی ئەم راجیاییە ئەوەیە کە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی پێی کاریگەرن وەك یاسای مەدەنی عێراقی مەرجی بوونی پایەی مەعنەوی لە هەڵەدا لە لا نیە کە یەکێکە لە سێ توخمە سەرەکییەکانی بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمی(المسؤلیة التقصیریة) یە، بەڵکو تەنها فەراهەمبوونی پایەی ماددی بەسە بۆ دڵنیابوون لەم بەرپرسیارێتیە کە تێکدانی ئەرکێکی یاسایی یان (شەرعی) یە .

کەواتە توخمەکانی بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمی ئەمانەن:

(کارێکی نارەوا ـ زیان ـ پەیوەندی هۆکارییەتی) بەڵام لە فیقهی رۆژئاواییدا توخمەکانی بریتین لە(هەڵە ـ زیان ـ پەیوەندی هۆکارییەتی).

جیاوازی جەوهەریش ئەوەیە کە هەڵە لە فیقهی رۆژئاواییدا ئەوەیە کە ئەرکێکی یاسایی تێك بدەیت لە کاتێکدا ئەو کەسەی بە کارە هەڵدەستێت بە تەواوی لەم کارەی خۆی

---

[1] مادەی ٤٧ لە یاسای رعایة الاحداث ژمارە ٧٦ بۆ ساڵی ١٩٨٣.

[2] مادەی (١٩١) لە یاسای مەدەنی عێراقی ئێستا کە دەڵێت:

١ـ ئەگەر کورێکی نێو تەمەنی جیاکەرەوە یان نەگەشتبێتە تەمەنی جیاکەرەوە یان شێت یان کەسێك حوکمی ئەمانی هەبێت سامانی کەسێکیان فەوتاند زامنی ئەو سامانە دەبێت و دەبێ لە سامانی خۆی بیبژێرێت.

٢ ـ وە ئەگەر نەتوانرا لە پارەی ئەو کەسەی زیانەکەی گەیاندووە ببژێررێت گەر کورێکی خوار تەمەنی جیاکردنەوە یان شێت بوو، ئەوا دادگا وەلی ئەمر یان سەرپەرشتیارەکە ناچار دەکات بیبژێرێت، وە دەبێ ئەو ئەندازە بژاردنە لە دواییدا لەو سامانە وەربگرێتەوە کە زیانگەیەنەرەکە دەبێت..

تێگەشتبێت(دەرکی کردبێت).

کەواتە پایەکانی هەڵە بریتیە لە:

١ – پایەی مادی: بریتی یە لە تێکدانی ئەرکێکی یاسایی.

٢ – پایەی مەعنەوی: بریتی یە لەوەی کەسی تێکدەر دەرکی ئەوە بکات ئەرکێکی یاسایی تێکداوە.

ئەم پایەی دووهەمە لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی پێی کاریگەرن بە مەرج نەگیراوە، بەڵکو تەنها پایەی یەکەم بە مەرج دانراوە کە کاری نارەوا یان نا دروست ناو دەبرێت.

**ئەو یاسا جەزاییە هاوچەرخانەی باسیان لە ساوایی کردووە:**

ئەسڵ لە مرۆڤدا ئەوەیە ژیریی(عەقڵ)ی تەواو بێت و هەڵاوێردراو(الاستثناء) پێچەوانەی ئەم راستیە یە و ئەمەش بەڵگە نەویستە و نایەوێت دەقی یاسایی لەسەر بێت. سەرەرای ئەمەش مادەی (٩١)ی یاسای سزادانی ئوردونی و مادەی(١٢)ی بەحرەینی و مادەی(١٤)ی قەتەری دەڵێن(وا گریمانە دەکرێت هەر مرۆڤێك کە کارێکی تاوانکارانە ئەنجام دەدات لەو کاتەدا خاوەنی عەقڵێکی تەواو بوو بێت، بە مەرجێك پێچەوانەی ئەم گریمانە نەسەلمێت).

وە لەو یاساسزاییانەی کە لە وڵاتە عەرەبی یەکاندا هەیە و باسی لەبابەتی منداڵی و شێتی کردووە لەو رووەوە کە بارودۆخی کەسیی کاریگەرن لەسەر پایەی مەعنەوی و بەرپرسیاریەتی جەزایی دەکەوێتە ژێر کاریگەری یەوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**بارودۆخی ساوایی:**

مرۆڤ بە بێ تێگەشتن و پەیبردن(ئیدراك) لە دایك دەبێت و ناتوانێت خاوەنی بیرکردنەوەیەکی تەواو بێت، پاشان تێگەشتنی پلە بە پلە سەردەکەوێت تا دەگاتە تەمەنی هەراشی.

بەڵام یاساکانی سزا لە وڵاتە عەرەبییەکاندا جیاوازن لە دیاریکردنی سەرەتای تەمەنی جیاکردنەوە. یاسای سودانی(م.٤٩) و قەتەری(م. ١٨) و لوبنانی(م.٢٣٧) و میسری(م. ٦٤) و کوەیتی(م. ١٨) و ئوردونی(م. ٩٤) دەڵێن ئەو منداڵەی حەوتساڵی لە تەمەنی تەواو نەکردبێت، لە رووی جەزایی یەوە پرسیاری لێ ناکرێت.

کەچی یاسای (چاودێری منداڵان)ی عێراقی لە (مادەی ٤٧) و یاسای سوڵتاننشینی عومان(م.١٠٤): دەڵێن: ئەگەر نۆ ساڵی تەواو نەکردبێت لە رووی ساسای جەزاییەوە بەرپرس نی یە.

بەڵام یاسای مەغریبی (بەندی ١٣٨) تەمەنی جیاکردنەوەی بە (١٢) ساڵ داناوە و جەزائیری لە (م.٤٩) و لیبی لە (م ٨٠) دا بە (١٤ )ساڵ دایان ناوە، بەڵام لەبەرانبەریشدا هەندێك نەخشەوپلان دادەنرێت بۆ پاراستن و رێكوپێك كردنی. وە لە یاسای بەحرەینیدا لە (م. ١٠)دا بە (١٠) ساڵ دیاری کراوە.

ئاشکرایە کە رەخنەیەکی زۆر لەو یاسایانە گیراوە کە بە(٧) ساڵ دیارییان کردووە و قۆناغی (١٠)ساڵی عەقڵانیترە هەروەك یاسادانەری عێراقیی هەڵیبژاردووە و کارێکی باشی کردووە.

## باسگەی دووەم:

## بارودۆخی شێتی[1]

وشەی (الجنون) لە زمانی عەرەبیدا: ئەوکەسەی بە وردی بەناو زمانی عەرەبیدا بگەڕێ دەبینێت کە هەموو ئەو وشانەی لە مادەی(ج - ن) وەرگیراون واتای شتی داپۆشراو و راستەوخۆ دەرك نەکراو بە پێنج هەستەکە، وەك (الجن و الجان و الجین و الجنین و الجنه) و هاووێنەکانیان.

لە زاراوەدا: بریتی یە لەو تێکچوونەی مێشك كەوا دەبێتە هۆی نەمانی تواناى جیاکردنەوەی هەڵەو راست.

شێتی دەبێتە هۆی نەهێشتنی مەبەستی تاوانکردن(قصد الجريمة) کە پایەی مەعنەوی تاوانە و ئەنجامەکەی ئەوەیە کە لە رووی سزاییەوە بەرپرسیاریەتی ناخرێتە

---

[1] یاسای لوبنانی(م. ٢٣١) و پاشتر، ئوردونی(م.٩١)و پاشتر، سوڵتاننشینی عومان(م.١٠١) و پاشتر، قەتەری(م. ١٩) و یەمەنی(م.٣٣) سوری(م.٢٣٠).

ئەستۆی شێتی تاوانکار.[1] وە ئەگەر لە رووی پزیشکی یەوە شێتی یەکەی سەلمێنرا، هیچ داوایەکی لە دژ تۆمار ناکرێت و نابرێتە دادگا.

**بەشەکانی شێتی:**

شێتی چەندین بەشی جیاوازی لە چەند رووی جیاوازەوە هەیە وەك:

١ ـ لە رووی پێکهاتنیەوە یان بنەڕەتی یە، یان لە ناکاودا سەرهەڵداوە.

ا ـ بنەڕەتی: ئەوەیە کە مرۆڤەکە بە شێتی باڵغ بوبێت و ئەم جۆرە شێتییەش وا باوە کە هیچ ئومێدێك نەبێت بۆ چاکبوونەوە چارەکردنی بە پێی عادەت.

ب ـ ناکاوی:ئەو شێتییە یە کە پاش باڵغبوون تووشی مرۆڤ دەبێت بە هۆی چەند هۆکارێکی خۆکردەوە وەك ئالودەبوون و ژەهراویبوون بە کحولەوە یان خۆنەکرد بێت وەك رووداوی کتوپڕ و پێکداڤان و برینداریی لە مێشکدا و هەر رووداوێکی لەم شێوەیە کە ئومێدی لاچوون و چاکبوونەوەی هەیە.

٢ ـ لە رووی کاریگەری یەوە یان گشتگیرە یان هەندەکی سنووردارە:

ا ـ گشتگر: ئەو جۆرەیە کە تووشبوو هەموجۆرە جیاکردنەوە و ئیدراکێکی لەدەست دەدات لە هەموو حاڵەتێکدا.

ب ـ سنووردار: ئەو ناتەواویە یە کە تەنها روو لە بەشێکی مێشك دەکات و بەشەکانی تری هێزی بیرکردنەوەی تەواوە.

٣ ـ لە رووی بەردەوامی یەوە، بەردەوام(مطبق) یان تاوتاوە(متقطع):

ا ـ بەردەوام: ئەو شێتییە یە کە بەردەوامە،چ هەمیشەیی و سەرەکی بێت چ سەرهەڵداوبێت پاش باڵغی. وە بە عەرەبی پێی دەوترێت (المطبق) چونکە هەموو کاتی خاوەنەکەی داگیر کردووە.

ب ـ تاوتاو: ئەو شێتیە یە کە هەندێك جار نامێنێت و پاشان دەگەڕێتەوە.

---

[1] سەیری مادەی (٦٠) لە یاسای ئێستای سزادانی عێراقی بکە.

**کاریگەریی بارودۆخی شێتی لە رووی پەیوەندی بە شێتەوە:**

## ١ ـ کاریگەریی شێتی لەو مەسەلانەدا کە یەکدەنگیی لە سەرە:

هیچ راجیابییەك نیە لەسەر ئەوەی کە شێتی کاریگەریی نییە لەسەر ئەمانە:

ا ـ شایستەیی ماف و پابەندی تەواو، هەموو مافە دارایی و نادارابیەکان(وەك هاوسەریی) دەمێنێتەوە و ماف وەرگرتنی مولکیەتی هەیە وەك میرات و وەسیەت و دیاری و بەخشین و شتی تریش کە پێویستی بە قبوولکردن نی یە.

هەندێك پابەندیش هەیە وەك نەفەقە دانی هاوسەرێتی و خزمایەتی گەر پارەی هەبوو.

ب ـ بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمی لە سەر دەمێنێت، بە نموونە ئەگەر سامانی کەسێکی فەوتان دەبێ لە سامانەکەی ببژێررێت.

ج ـ راجیایی لەسەر ئەوە نیە کە ئەم بارودۆخە کاریگەریی دەبێت لەسەر بەرپرسیاریەتی سزایی، چونکە پایەی مەعنەوی(مەبەستەتاوان)ی نی یە و ئیتر ئەگەر لەکاتی شێتیدا تاوانێك بکات تووشی بەرپرسیەتی جەزایی و سزا نابێت.

د ـ راجیایی لەوەدا نی یە کە شیاویەتی بەجێهێنان(اهلیة الاداء)ی نی یە بە هەردوو بەشەکەیەوە(تەواو ـ ناتەواو).

ه ـ راجیایی لەوەدا نیە کە ئەگەر شێتبوو پاشان شێتیەکەی نەما پێش تاوانکردنەکە، ئەوا هیچ کاریگەریەکی لەسەر پایەی مەعنەوی نابێت و بەرپرسیاریەتی یاسایی لەسەرە.

و ـ راجیایی لەوەدا نیە کە ئەگەر پاش تاوان کردن شێت بوو، هەموو ئیجرائاتە یاساییەکان دەوەستێنرێت دژی و ئەگەر بە شێتیش مرد، بەرپرسیاریەتی جەزایی دەوەستێت و ناگوێزرێتەوە بۆ میراتگرەکانی. بەڵام ئەگەر پێش مردن باش بوویەوە، هەموو ئەو ئیجرائاتە دادوەرییانەی کە لە دژی بوون دەست پێدەکات لەو خاڵەوە کە تێیدا وەستاوە.

ز ـ راجیایی لەوەدا نیە کە پێویستە دادوەر لە دوکتۆران و پسپۆڕەکان یارمەتی وەربگرێت بۆ زانینی شێتی و پلەکەی.

ح - راجیایی لەوەدا نیە کە پێویستە ڕێوشوێنی پارێزگاریانە و نەبادایی لە دژی بگیرێتە بەر لەدژی، بۆ ئەوەی نەهێڵن ئەو کارانە بکات کە زیان بە خەڵکی دەگەیەنێت.

## ٢ – کاریگەریی شێتیی لەو مەسەلانەدا کە را جیاییان لەسەرە:

أ - راجیایی لە واجب بوونی زەکاتدا لە پارەی مرۆڤی شێتدا، چونکە زەکات عیبادەتێکە کۆمەکی خۆراکیی تێدایە و ئەو کەسەی لایەنی عیبادەت زاڵ دەکات باوەڕی وەهایە کەدەبێ زەکات لە ماڵی شێت نەدرێت. بەڵام ئەو کەسەی لایەنی کۆمەکی خۆراکیی دەکات رای وایە کە پێویستە زەکات لە ماڵی شێت بدرێت.

بە دیدی من دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان بەرهەمی کشتوکاڵی و سامانی ئاژەڵی و پارەدا کە لە کاروباری بازرگانیدا وەبەردەهێنرێت و زەکاتی تێدا واجبە.

جا ئەگەر سامانی شێت پارەی وەستاو بوو ئەوا زەکاتی تێدا واجب نابێت، چونکە رێژەکەی بە زەکات کەم دەبێتەوە و شێتەکە زیانی پێ دەگات و زیانیش لە ئیسلامدا قبوڵ ناکرێت، وەك پێغەمبەر دروودی خوای لە سەر دەفەرمێت(لا ضرر و لا ضرار) واتە نە زیان بگەیەنە و نە زیانت پێ بگات.

ب - راجیایی لە بەرپرسیاری کەسێك کەوا کەسێکی ئاقڵ بەشداری شێتێك بوو بێت و هاوکاری کردبێت لە کردنی تاوانێکدا، هەندێك لە فەقیهەکان دەڵێن:[1]

ئەو کەسە سوود لە باروئۆخی شێتەکە وەردەگرێت هەروەك شێتەکە، بەڵام هەندێکی تر رایان وەهایە کە ناتوانێت سوود لە ئۆخی شێتەکە وەربگرێت و لەو تاوانەدا کە بەشدار و هاوکار بووە هیچ عوزرێکی نیە و بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت کە بە تەنها خۆی ئەو تاوانەی کردبێت.

بە رای ئێمە قسەی دووهەم راستە، چونکە شێتی سیفەتێکی کەسی یە و لەگەڵ خودی شێتەکەدایە و وەك هۆی بەرەوادانان(ئیباحە) نیە، چونکە سیفەتی بەرەوادانان لەگەڵ کرداردایە نەك بکەر کە بەشدار و هاوکار سوودی لێ وەربگرن.[1]

[1] وەك حەنەفیەکان و شافیعی لە رایەکیدا و حەنبەلییەکان لە رای پەسەندراویاندا.

**بارودۆخی شێتی لە یاساکاندا:**

یاسا عەرەبی یە جەزاییە هاوچەرخەکان نەخۆشی عەقڵی(شێتی)یان بە بارودۆخێك داناوە کە دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەهلییەتی جەزایی بەهۆی کاریگەری لە سەر پایەی مەعنەوی، کە دەبێتە هۆی ئەوەی شێت لە رووی جەزاییەوە هیچ پرسیارێکی لێنەکرێت، بەڵام ئەم یاسایانە لە دەربڕینەکانیاندا بۆ ئەم نەخۆشییە عەقڵییە جیاوازن.

یاسای جەزائیری(م ٤٧) و یاسای لوبنانی(م ٢٣١) و سوری(م ٢٣٠): وشەی شێتی(الجنون)یان بەکار هێناوە کە تەسکترین دەقە لە دەربڕیندا، چونکە هەموو نەخۆشیە عەقڵییەکان ناگرێتەوە.

وە یاسای عێراقی(م ٦٠) و میسری(م ٦٢) و سودانی(م ٥٠): دەستەواژەی (نەخۆشی عەقڵی) بەکار دهێنن لەگەڵ دەستەواژەی (شێتی). ئاشکرایە کە دەستەواژەی (نەخۆشی عەقڵی) حاڵەتەکانی نەخۆشی دەماری و دەروونی دەگرێتەوە کە عەقڵ و ئیدراك لە مرۆڤ دادەماڵن.

کەچی یاسای مەغریبی لە(بەندی١٣٤)دا دەستەواژەی (ناتەواوی لە تواناعەقڵییەکانیدا)ی بەکارهێناوە. یاسای ئوردونی (م ١/١٩٢) (تێکچوونی عەقل)دا و کووەیتی(م ٢٢) دەڵێت(نەخۆشییەکی عەقڵی یان ناتەواوی لە گەشەی زیهنی یان هەر حاڵەتێکی تری عەقڵی کە ناسروشتی بێت) وە یاسای لیبی(م ٨٣) دەڵێت(ناتەواویەکی سەرتاپاگیری عەقڵی کە لە نەخۆشییەوە دروست بوبێت)، دەستەواژەی یاسای بەحرەینی(م ١/١٥) باشترین و گەورەترین دەربڕینە کە دەڵێت(هەر نەخۆشی یان ناتەواوی یان حاڵەتێك کە کار بکاتە سەر عەقل)[1].

---

[1] بۆ زانیاری پتر بگەڕێنەوە بۆ پەرتووکمان ـ موانع المسؤولیة الجزائیة في الشریعة الاسلامیة و التشریعات الجزائیة العربیة. لا ٣٧ و پاشتر.

# باسگەی سێهەم:

## بارودۆخی سەرخۆشی[1]

سەرخۆشی بارودۆخێکی کەسیی ئارەزوومەندانیە و سەرخۆشبوون تەنها بە بەکارهێنانی ئەو مادانەوە پەیدا دەبێت کە مەستکەر(مسکر) و بێهۆشکەر(مخدر)ن، ئەگەر بەکارهێنانەکەی لەوێوە سەرچاوەی گرتبێت کە نەزانێت قەدەغەیە(حرام) یان گومانی وەها بێت کە مادەیەکی سەرخۆشکەر و بێهۆشکەر نی یە یان بە زۆر پێی خورابێت یان زەرورەتێك ناچاری کردبێت بە بەکارهێنانی.

لەم حاڵەتانەدا سەرخۆشی دەبێتە بارودۆخێکی کاریگەر لەسەر خاوەنەکەی و لێرەوە دەبێتە بەربەستێك لە بەربەستەکانی بەردەم بەرپرسیاریەتی جەزایی و پایەی مەعنەوی ناهێڵێت.

ئەو یاسا جەزاییانەی ئەم بابەتەیان تاوتوێ کردووە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

سەرخۆشی بارودۆخێکی سەرهەڵداوی خۆویستە کە تێیدا هۆشمەندی لە رێ لا دەدات یان هەژموونی بەسەر ویستدا نامێنێت بە هۆی بەکارهێنانی مادەیەکی مەستکەرەوە کە مرۆڤە مەستەکە بەکاریهێناوە کاریتێکردووە. کەواتە بارودۆخێکی کاتی یە. بەڵام ژەهراویبوون بە هۆی بەکارهێنانی مادەی سەرخۆشکەر و بێهۆشکەرەوە دەچێتە بابەتی بارودۆخی تێکچوونی عەقڵەوە.

یاسا جەزاییە عەرەبییە هاوچەرخەکان سەرخۆشی خۆنەویستانەیان بە هۆیەك داناوە بۆ نەبوونی پایەی مەعنەوی(تاوانەمەبەست) پاش مەستبوون و نەمانی شیاوییەتی جەزایی ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١ ـ دەبێ سەرخۆشی یەکە بە ویستی خۆی نەبووبێت، کە یەکێك لەم حاڵەتانەیە:

---

[1] دوکتۆر محمود نجیب حسنی، سەرچاوەی پێشوو لا ٤٤٣، د . رەئوف عبید سەرچاوەی پێشو لا ٦٤٤ و پاشتر، د . محمود محمود مصطفى، سەرچاوەی پێشو لا ٣٥٠ و پاشتر.

ا ـ بە بێ ڕەزامەندی خۆی مادەسەرخۆشکەرەکەی بەکارهێنابێت و لە ژێر فشاری زۆرلێکردنێکی ناچاریدا(الملجيء) بووبێت.

بەڵام ئەم یاسایانە دەستەواژەی جیاوازیان بەکارهێناوە . یاسای سودانی(م ٥٠/ب) دەستەواژەی (بە بێ ڕەزامەندی) بەکارهێناوە، قەتەری(م ١٩/ب) دەستەواژەی (رغم ارادتە)، ئوردونی (م ٩٣)دەستەواژەی(بە بێ ڕەزامەندی)، بەحرەینی (م ١٦/٢/أ) دەستەواژەی (بە بێ هاوڕابوونی)، عێراقی(م ٦٠) دەستەواژەی(بە زۆر)ن سوری (م ٢٣٤) و لوبنانی(م ٢٣٥) و لیبیی(م ٦٧) دەستەواژەی (هێزی ملکەچکەر)یان بەکارهێناوە.

هەموو ئەم دەستەواژە جیاوازانە یەك واتا دەگەیەنن کە نەبوونی ویستی هەڵبژاردنە(اختیار) لە بەکارهێنانی مادەی هۆشبەرەدا.

ب ـ زانیاری نەبێت لە سەر مادە سەرخۆشکەرەکە یان سروشتەکەی، وەك ئەوەی کە نەزانێت ئەو مادەیەی بەکاریدەهێنێت سەرخۆشکەرە یان بێهۆشکەرە.

ج ـ بەکارهێنانی سەرخۆشکەر وبێهۆشکەر لە حاڵەتی ناچاریدا(اضطراري):

لە یاساکانی سوری(م٢٣٤)، لوبنانی(م ٢٣٥)، لیبی(م ٨٧)دا دەستەواژەی (لە ئەنجامی ڕوودوایێکی کوتوپڕ و لە ناکاو) یان بەکار هێناوە.

٢ ـ نەمانی هەست و هێزی هەڵبژاردن: ئەمەش مەرجێکی سەرەکی یە بۆ نەمانی شیاوییەتی سزایی، ئەگەر هەست و هێزی هەڵبژاردنی بە تەواوی لەدەست نەدابوو ئەوا سەرخۆشی یەکە بە باروبۆخێکی سووککەر دادەنرێت بۆ ئەو تاوانەی لە کاتی سەرخۆشیدا کردوویەتی.

یاساسزاییەکانی وڵاتانی عەرەبی ئەم بابەتەیان باس کردووە و گرنگییان پێ داوە. وەك لە یاسای عیراقیدا(م ٦٠)، لیبی (م ٨٧)، سووری (م ٢٣٤)، لوبنانی (م ٢٣٥)، مسری (م ٦٢)، ئوردونی (م ٩٣)، بەحرەینی (م ١٦)، سودانی (م ٥٠)، قەتەری (م ٩١)، کوەیتی (م ٢٣)دا هاتووە.

٣ ـ دەبێ نەمانی هەست و هێزی هەڵبژاردن هاوکاتبێت لەگەڵ تاوانەکارەکەدا(العمل الجرمي)، وە ئەو یاسا جەزاییانەی باسمانکردن ئەم مەرجەیان لە ژێر سەرنێری( کەسەکە لە حاڵەتی سەرخۆشیی خۆنەکردیدا بێت لە کاتی تاوانکردنەکەدا).

# باسگەی چوارەم:
# بارودۆخی ناچارکردن[1]

لە گرنگترین ئەو بارودۆخە دەرەکیانەیە کە کار دەکاتە سەر پایەی مەعنەوی و لایدەبات و دەبێتە هۆی بەرپرسیارنەبوونی جەزایی بکەر لەو تاوانەی لە ژێر فشاری زۆرلێکران و زەروورەتدا کردوویەتی.

لەم باسگەیەدا بە کورتی بارودۆخی زۆرلێکران بەو ئەندازەیەی کە پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەبێت باس دەکەین:

وشەی (الاکراه) لە زمانی عەرەبیدا بۆ ناچارکردن بەکاردێت و لە (کره – یکره – کرها) وەرگیراوە، (کراهة الشيء) واتە رقبوون لە شتێك و پێچەوانەی خۆشویستنیەتی، یان لە (اکره فلانا علی الشيء) واتە بە نابەدڵی و بە زۆر فلانکەسی ناچار کرد بە شتێك. ئەم واتایەی کۆتایی نزیکترە لە واتا زاراوەییەکەیەوە کە بریتییە لە: فشارێکی نارەوایە لە کەسێکەوە بۆ سەر کەسێکی تر بۆ ناچارکردنی بە کردن یان نەکردنی کارێك کە رەزامەندی نی یە لەسەر کردنی یان نەکردنی.

پایەکانی ناچارکردن پێنجن کە بریتی یە لە:

ناچارکەر و ناچارکردن و ئەوبابەتەی زۆری بۆ بەکارهێنراوە و تۆقاندن(ترسی زۆر).

**مەرجەکانی ناچارکران:**

**ا ـ مەرجی ناچارکەر ئەوەیە کە:**

١ ـ پێویستە سەرچاوەی فشار یان هەڕەشەکە مرۆڤ بێت، کەواتە ئەگەر ئاژەڵ یان سروشت بوو پێی ناوترێت ناچارکردن.

٢ ـ پێویستە توانای جێبەجێکردنی هەڕەشە و ترساندنەکەی هەبێت.

**ب ـ مەرجی ناچارکراو ئەوەیە:**

[1] یاسای عێراقی (م ٦٢) و پاشتر. سولتانئنشینی عومان (م ٩٩). لیبیا (م ٧٥). یەمەن (م.٣٥). سوریا (م ٢٢٦). کوەیت (م٢٢٧) ، دوکتور عبید ، لا ٦٠٩ .

١ ـ پێویستە رووبەرووی هەڕەشەیەکی هەنووکەیی ببێتەوە کە ترسناك بێت بۆسەر ژیانی یان سەلامەتیی خۆی یان نامووسی یان سامانی، چ ئەو هەڕەشەیە روو لە خودی خۆی بکات یان لە کەسێکی خۆشەویستی.

٢ ـ نەتوانێت ئەو مەترسیە دووربخاتەوە بە رلکردن لێی یان بە یارمەتیخواستن لە دەسەڵاتی گشتی یان پەنا بردن بۆ کەسێك کە ئەم مەترسیەی یەی لیّ دوور بخاتەوە،

٣ ـ گومانی بەهێزی لەسەر ئەوە بێت کە ئەگەر ئەو کارەی کە زۆری لێدەکرێت لە سەری نەکات ئەوا ئەو هەڕەشەی لێی کراوە دەبێتە کردار.

٤ ـ هیچ نیشانەیەك لە ئارادا نەبێت کە پێمان بڵێت ئەو کارەی بە ئارەزوومەندانەی خۆی کردووە وەك ئەوەی تەنها شتی زۆرلێکراو دەکات و لەو ئەندازەیەش تێنەپەڕیّ کە داوای لێکراوە.

**مەرجەکانی بابەتی زۆرتێداکراو:**

یەکێك لە گرنگترین مەرجەکانی ئەوەیە کە کارێکی ناڕەوا نەبێت، واتە ئەگەر زۆری لیّ بکرێت بۆ راپەڕاندنی ئەرکێکی سەرشانی بە زۆرلێکردن دانانرێت و کاریگەری لەسەر نی یە و نابێتە هۆی لەدەستدانی پایەی مەعنەوی و نابێتە هۆی بەرپرسیارنەبوونی جەزایی، وەك زۆرکردن لە قەرزارێك کە هەنووکە قەرزەکەی بداتەوە یان زۆری لێبکرێت بۆ قبوولکردنی ئەو سزایەی شایانیەتی پاش دەرچوونی فەرمان بە سەریدا.

**مەرجەکانی زۆرپێکراو(هەڕەشە پێکراو):**

١ ـ مەترسیەك بێت کە هەڕەشە بێت بۆ سەر ناچارکراو یان خۆشەویستێکی وەك کوڕی یان ژنی، بە شتێك کە سەلامەتی یان ژیانی یان نامووسی یان سامانی و هەرشتێك لەم بابەتانەی کە یاسا دەیانپارێزێت.

٢ ـ پێویستە مەترسیەکە هەنووکەیی بێت و مەترسی دواڕۆژ نرخێکی نی یە، چونکە بۆی هەیە تائەو کاتە فریاگوزاری لە کەسێك بخوازێت بۆ نەهێشتنی ئەو ترسناکی یە.

٣ ـ پێویستە دڵنیابێت لە مەترسیەکە و نرخێك بۆ گومان و خەیاڵ دانانرێت کە لە سەر هۆکاری ناعەقڵانی بونیات نراوە.

٤ ـ پێویستە زۆر گەورە بێت و ترسناکیەکی لاواز هیچ نرخێکی نیە و خەملاندنی ئەو ترسناکیەش بە دەستی دەسەڵاتی دادوەریی خەملێنەرە(السلطة القضائية التقديرية).

٥ ـ دەبێ ناچارکراو هۆکارێکی تری نەبێت بۆ لابردنی ئەو ترسناکی یە جگە لەو کارەی کە ناچارکراوە بیکات.

٦ ـ نابێت مەترسی هەڕەشەپێکراوەکە لەو هەڕەشە لەسەرکراوە کەمتر بێت، بۆ نموونە بڵێت: فلانکەس دەکوژم یان کێلگەکەت دەسووتێنم، ئەوا نابێتە زۆرلێکردنێکی کاریگەر لە سەر پایەی مەعنەوی و ناشبێتە بەربەستێك لە بەرپرسیاریەتی جەزایی ئەگەر کارە تاوانکارەکەی ئەنجامدا.

و ـ لە گرنگترین مەرجەکانی ترس و تۆقان ئەوەیە لە ئاستێکدا بێت کە زۆرلێکراو ناچار بکات کە بە کاری زۆرلەسەرکراو هەستێت.

**جۆرەکانی ناچارکردن:**

یاسا و فیقهی ئیسلامی بەم شێوەیە رای جیاوازیان لە سەر جۆرەکانی زۆرلێکردن هەیە:

لە فیقهی ئیسلامیدا هەندێك لە زانایان[1] ناچارکردنیان دابەشکردووە بۆ ١ ـ ناچارکردنی تەواو. ٢ ـ ناچارکردنی ناتەواو. ناچارکردنی تەواو: بریتی یە لە هەڕەشەکردن بەو شتەی کە زیان بە سەلامەتی کەسەکە یان ژیانی یان ناموسی دەگەیەنێت و ئەویش هیچ بژاردە و رەزامەندییەکی نیە.

وە ناچارکردنی ناتەواو : بریتی یە لە هەڕەشەکردن بە شتێك کە زیان بە هیچیەك لەو بەرژەوەندیانەی وترا نادات، وەك لێدانی بێ زیان و زیندانیکردنێکی سووکەی کەم و هاووێنەی تریان، ئەمەش رەزامەندی هەڵدەوەشێنێتەوە و کاریگەری لەسەر بژاردە نابێت[2]

پێوەری جیاکردنەوەش لە نێوان ئەودووجۆرەدا دەگەڕێتەوە بۆ خەملاندنی دادوەری خەملاندن، چونکە ئەم پێوەرە کەسییە و بابەتی نییە و بە پێی نێر و مێیی و گەورە و بچووکی و سیفەتە خودییەکانی تر ئەم بابەتە دەگۆڕێت .

**یەکەم: ناچارکردن لە فیقهی ئیسلامیدا:**

هەموو مەزهەبەکانی فیقهی ئیسلامی یەکدەنگن لە سەر ئەوەی کە ئەگەر ناچارکردن مەرجەکانی هاتەدی ئەوا دەبێتە بەربەستێك لە رووی بەرپرسیاریەتی جەزاییدا چونکە پایەی مەعنەوی(مەبەستە

---

[1] وەك حەنەفییەکان، بەڵام هەندێکیان (وەك زاهیرییەکان) زۆرلێکرانیان کردووە بە دوو بەشەوە: زۆرلێکرانی کرداری و زۆرلێکرانی گوفتاری بگەڕێوە بۆ (المحلى) لە (باب الاكراه) .

[2] سەیری (بدائع الصنائع فى ترتيب الشرائع) بکە، العلامە علاو الدين ابى بكر بن مسعود الكاسانى الحنفى، چاپخانەی الامام ٩ /٤٤٧٩.

تاوان) ناهێڵێت بە نیسبەت ئەو تاوانانەی ناچارکراو دەیکات بۆ لابردنی ئەو ترسناکییانەی هەڕەشەی لێدەکەن، جگە لە تاوانی کوشتن و خوار کوشتن کە زانایان بەم شێوەیە رای جیاوازیان دەربارەیان هەیە[1]:

ا ـ تۆڵە لە زۆرلێکەر دەکرێتەوە چونکە بۆتە هۆکار و تۆڵەش لە زۆرلێکراو دەکرێتەوە چونکە راستەوخۆ تاوانەکەی ئەنجامداوە[2].

ب ـ تۆڵە لە هیچکامیان ناکرێتەوە، بەڵکو پێویستە بژاردن بکەوێتە سەر زۆرلێکەر لەبەر هۆکاربوونی و بەڵگەشیان ئەوەیە کە کەسی زۆرلێکەر بکوژی راستەقینە نیە و بکوژی حوکمیە[3]وە بکوژی راستەوخۆش کە زۆرلێکراوەکەیە بکوژی راستەقینەیە بەڵام بکوژی حوکمی نی یە. وە تەنها کاتێك تۆڵە لە بکوژ دەکرێتەوە کە لە هەمانکاتدا بکوژی راستەقینە و حوکمیی بێت.

ج ـ تۆڵە لە زۆرلێکەر دەکرێتەوە چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە تاوانەکە نەدەکرا. زۆرلێکراو تەنها وەك ئامێرێك لەلایەن زۆرلێکەرەوە بەکارهێنراوە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی[4].

د ـ تۆڵە لە زۆرلێکراو دەکرێتەوە چونکە بکەری راستەوخۆی تاوانەکەیە، بەڵام زۆرلێکەر سزایەکی تەمبێکەر (تعزيري) دەدرێت کە زیندانیکردنە تامردن.[5]

بە بۆچوونی ئێمە دەبێت سزای تۆڵە بەسەر زۆرلێکەردا جێبەجێ بکرێت ، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە تاوانەکە رووی نەدەدا.

بەڵام زۆرلێکراو تەنها دوو حاڵەتی هەیە:

ئەگەر باوەڕی وەها بوو کە جێبەجێکردنی فەرمانی زۆرلێکەر واجبە ئەوا سزا نادرێت، وەگەرنا پێویستە سزایەکی تەمبێیانە بدرێت لە سەر ئەوەی ژیانی خۆی بە گرنگتر دانا لە ژیانی تاوانبەسەردراو.

---

[1] بۆ ئاگاداری لەم وردەکاری یە سەیری: سەرچاوەی پێشو ٤٤٧٩/٩ و پاشتر بکە. هەروەها حاشییەی الدسوقی للامە محمد عرفە لە فیقهی مالکیدا ١٠١/٨ و پاشتر. هەروەها المهذب لابی اسحاق لابراهیم بن علی الشیرازی الشافعی ٢٦٧/٢ و پاشتر. هەروەها الخلاف فی الفقه للامام ابی جعفر محمد بن الحسن لە زانایانی ئیمامی ٤٧٧/٢. هەروەها پەرتووکی ئێمە موانع المسئولیە الجزائیە، لا ١٩٩ و پاشتر.

[2] بۆچوونی مالیکیەکان و حەنبەلییەکانە و رای راجیحە لە مەزهەبی شافیعیدا.

[3] ئەوەش رای ئەبوئەبویوسف لە حەنەفیەکانە.

[4] ئەوەش رای ئەبوحەنیفە و محمد الشیبانیی قوتابیی.

[5] رای ئیمامییەکان و زوفەرە لە حەنەفییەکان، بەڵام من سزای تەمبێکردنم لای زوفەر نەدۆزیوەتەوە.

**دووهەم: ناچارکردن لە یاسادا:**

فەقیهەکانی یاسا ناچارکردنیان بۆ مادی و مەعنەوی دابەش کردووە:

١ — زۆرلێکردنی مادی: هەندێك لە زانایانی یاسا[1] بەمشێوەیە پێناسەی دەکات: (سڕینەوەی ویستی بکەر جگە لە جووڵەی ئۆرگانی یان هەڵوێستی نەرێنی کە هیچ سیفەتێکی خولستیارانەی تێدا نەبێت، نادرێتە پاڵی).

چەند تێبینی یەك لە سەر ئەم پێناسەیە هەیە:

ا - پێناسەیەکی ناڕوونی دانراوە و گرنگترین مەرجی پێناسەش ئەوەیە کە لە پێناسکراوەکە ڕوونتر بێت.

ب - ناچارکردن سیفەتی ناچارکەرە وە سڕینەوەش سیفەتی خولستە(ئیرادە) و ئەم دوو باسکراو(موصوف)ەش جیاوازن و ئەم جیاوازییەش دەبێتە هۆی جیاوازی سیفەتەکانیان و لە گرنگترین مەرجی لۆجیکی پێناسە ئەوەیە کە پێناسە و پێناسەکراو یەك بن بە شێوەیەك کە هەریەکیان بدرێتەپاڵ ئەوی تر و لە ئیعتیباریشدا جیاوازین لەبەر ئەوەی پێناسەکردنی شتێك بە خودی خۆی دروست نەبێت.

ج - ویست بە ناچارکردن ناسڕێتەوە، بە بەڵگەی ئەوەی زۆرلێکراو کەمزیانترینی نێوان دوو خراپەی هەڵبژاردووە بە باوەڕی خۆی کە کرداری زۆرلەسەرکراوە لە بریتی ئەوەی تووشی ئەو مەترسیە ببێت کە هەڕەشەی پێکراوە.

د - ناچارکردن تاوانەکردار ناسڕێتەوە بەڵکو ئاکارە تاوانییەکەی دەمێنێتەوە، چونك لە هۆکانی بەرەواداتان نی یە بەڵکو بەرگرێکە لە بەردەم بەرپرسیاریەتی یاساییدا.

ئەو پێناسەیەی کەهەڵبدەبژێرین بۆ ناچارکردن بریتی یە لە: (بەکارهێنانی توندووتیژی یان هەڕەشەی توندووتیژی بۆ ناچارکردنی کەسێك بە کردنی کارێك کەوا ڕەزامەندی خۆی لەسەر نی یە).

لە حاڵەتی بەکارهێنانی توندووتیژیدا پێی دەوترێت زۆرلێکردنی مادی و لە کاتی هەڕەشەکردنیشدا پێیدەوترێت زۆرلێکرانی مەعنەوی.

[1] د . نەجیب حسنی . سەرچاوەی پێشو لا ٤٥٤ .

زانایانی یاسا نمونەیان بۆ جۆری مادی هێناوەتەوە بەوەی کە کەسێك بە زۆر دەستی کەسێك بگرێت و گرێبەستێك یان دۆکیومێنتێکی ساختەی پێ ئیمزا بکات یان زینـدانی بکات و رێگری لـێ بکات کە ئەرکێك بەجێ بهێنێت کە یاسا سزای داناوە بۆ نەکردنی.

## زۆرلێکرانی مەعنەوی:

ئـەم جـۆرە لـە فیقهـی ئیسـلامیدا یەکسـانە بـە جـۆری (ناچـارکردنی تـەواو) لـە رووی واتـا و مەرجەکانیشیەوە بۆیە پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە.

## تـوخمەکانی زۆرلێکردن لە یاسادا:

زانایانی یاسا تـوخمەکانی ناچارکردنیان(بەهەردوو جۆرەکەیەوە) بە دوو داناوە:

ا ـ تـوخمی مادی : لە ناچارکرانی مادیـدا بـریتی یـە لـە بـەکارهێنانی تـوندوتیژی. لـە زۆرلێکرانـی مەعنەویدا بریتی یە لە هەڕەشەکردن بـە مەترسـی دروسـتکردن لەسـەر بەرژەوەنـدییکی پـارێزراو بـە یاسا.

ب ـ تـوخمی مەعنەوی : بریتی یە لەو ترسەی لە دڵی ناچارکراودا هەیـە کەلـە پایـەی مـادی یـەوە پەیدا بووە و ئەم روکنە مەعنەوی یە یە کە ناتەواوی دەبەخشێتە ویست(ئیرادە) یان رەزامەندی.

وە تێبینی ئەوە لە سـەر ئـەم دابەشـکردنە دەکرێـت کـە ناتـەواوە، چـونکە تـوخمی هەرشـتێك ئەوەیە کە ئەو شتەی لە سەر دەوەستێت، جا گەر بەشێك بوو لێی پێـی دەوترێـت پایـە، وەگـەر نـا پێی دەوترێت مەرج.

ئەو پایانەی ناچارکرانی لەسەر راوەستاوە چ مادی بن چ مەعنەوی پێنج دانەن:

ناچارکەر، ناچارکراو، ناچارلەسەرکراو، ناچارکراو(هەڕەشەپێکراو)، تۆقان.

وە هەر یەك لەم روکنانـە مـەرجی هەیـە و بـە درێـژی لـە بابـەتی (ناچـارکران لـە دیـدگای فیقهـی ئیسلامی یەوە)دا باسمان کردن.

## کاریگەری ناچارکران لە یاسادا:

یاسا هاوچەرخەکانی سـزای وڵاتـانی عـەرەبی لـە دیاریکردنی ئـەم کاریگەرییـەدا لـە پشێـویدان، هەنـدێکیان بـە بەریەسـتی بـەردەم بەرپرسـیاریەتی جـەزاییان دانـاوە و هەنـدێکیان بـە هۆکـاری رێپێدراو(ئیباحە)یان داناوە، هەندێکیشیان بە رێگری بـەردەم سـزایان دانـاوە، هـەروەك لـە پاشـدا بـە

درێژی باس لەو پشێوی و راجیاییە نالۆجیکیانە دەکەین لە ئەنجامگیریەکانی کۆتایی باسگەی دلهاتوودا.

## باسگەی پێنجەم:
## بارووداۆخی پێویستی (زەرورەت)

پێویستی لە زمانی عەرەبیدا وشەی (الضرورة) ی بۆ دانراوە کە گەلێك واتای هەیە، یەکێك لەو واتایانە: شتێکە پێویستمان پێی هەبێت.

وە لە زاراوەی فەلسەفی و لۆجیکیدا بریتیە لە بەلگەنەویست(بەدیهی/البداهة)، دەوترێت: ئەم بابەتە لە زەروریاتە واتە بەلگە نەویستە و سەلماندنی پێویستی بە پێناسە و بەلگە نی یە.

وە لە زاراوەی بنەماکانی فیقهدا(اصول الفقه)دا زاراوەی پێویستی(الضرورة) بەکاردەهێنرێت بۆ باسکردن لە بارەی مەسلەحەتەوە، کاتێك دابەش دەکرێت بۆ زەروریەکان و حاجیات و تەحسینیات.

مەبەست لە مەسلەحەتە زەروریەکان ئەو مەسلەحەتەگشتیە یە کە هەموو نەتەوەو گەلان پێویستیان پێی هەیە تا ئەو رادەیەی ئەگەر یەکێك لەو بەرژەوەندیانە لە هەر کۆمەلگەیەکدا نەبێت ئەوا سیستەمی تێکدەچێت و بشێوی بلاودەبێتەوە.

جا لە بەرژەوەندیە زەرورەیە گشتی یەکان پاراستنی گیان و جەستە و پاراستنی باوەرو ناموس و سامان و شتی تری لە بابەتانە.

لە زاراوەی یاسا و فیقهی ئیسلامیدا پێویستی(زەرورەت) بریتی یە لەو عوزرەی پاساوی کارێکی قەدەغەکراو دەدات، بەم واتایەش دەبێتە بارودۆخێکی کاریگەر لە روکنی مەعنەوی تاواندا و دەبێتە بەربەستێك لەبەردەم بەرپرسیاریەتی جەزائیدا، وەك ئەوەی کەسێك سامانی کەسێکی تر لە ژێر فشاری زەرورەتدا بفەوتێنێت. لەم حالەتەدا لە رووی سزاییەوە لێپرسینەوەی لەسەر نی یە چونکە زەرورەت بەربەستە لە بەردەم لێپرسینەوەی سزاییدا، بەلام لە لایەنی مەدەنی یەوە بەرپرسیارە و دەبێت هەموو ئەو زیانانە ببژێرێت کە بەبێ پاساو بە خەلکی دەگەیەنێت، چونکە ناچاریوون مافی کەسانی تر هەلناوەشێنێتەوە، بەلکو قەدەغەکراوەکان رێپێدەدات. ئەو بنەما

بەناوبانگەی لەناو خەلکدا باوە کە دەڵێت(الضرورات تبيح المحضـورات) هەڵەیە، چـونکە زەرورەت لە بەربەستەکانە و لە هۆکارەکانی رەوایی(ئیباحە) نی یە.

لە زاراوەی یاسادا زانایانی یاسا بەم شێوەیە پێناسەیان کردووە: ئەو بارودۆخەیە کە هەڕەشە لە کەسێك دەکات بە مەترسیەك و وەهای دەخاتە مێشکی کە رێگای رزگاربوونی لەو بارودۆخە کردنی کارێکی تاوانکارانەیە[1].

## پایەکانی پێویستی:

پێویستی چوار پایەی هەیە:

١ - ناچارکراو: بریتی یە لەو مرۆڤەی دووچاری مەترسی بووە.

٢ - مەترسی هەنووکەیی.

٣ - جێگەی مەترسیەکە (ئەو بەرژەوەندیەی لە شەرع و یاسادا پارێزراوە).

٤ - کاری پێویست بۆ لابردنی مەترسی.

### ا- مەرجەکانی ناچارکراو:

١ - نابێت ناچارکراو پابەند بکرێت بە تەحەممولکردنی ئەو مەترسیەی کە رەنگە تووشی بێت، هەروەك حاڵەتی بەرگریکردنی ئەو هاوڵاتییە دژی ئەو دوژمنەی دەستدرێژی دەکاتە سەر وڵاتەکەی.

٢ - نابێت ویستی ناچارکراو لە روودانی مەترسیەکەدا، جا ئەگەر کەسێك ببێتە هۆی هەلگیرساندنی ئاگرێك لە شوێنێکدا و بۆ رزگارکردنی خۆشی تاوانێکی کرد، ئەوا بە ناچارکراو دانانرێت بە شێوەیەك کاریکاتە سەر پایەی مەعنەوی تاوانەکە و بەڵکو لە سەر تاوانەکەی لێپێچینەوەی لیەگەڵ دەکرێت.

---

[1] یاسای سزاکانی: لوبنانی (م٢٢٩) و پاشتر. عێراقی (م٦٣) و ئوردونی(م٨٩) و لیبی(م٧٢) و قەتەری (م٢١) و سوری(م٢٢٨).

د . محمود محمد مصطفی، هەمان سەرچاوە، ل٨٣.

د . رؤوف عبید، سەرچاوەی پێشو، ل ٦٠٠

د . محمود نجیب حسني. سەرچاوەی پێشو، ل ٤٥٨ و پاشتر

**ب- مەرجەکانی مەترسی:**

١ـ دەبێت زەبەلاح بێت، گەر بچوك و کەم بوو گوێی پێنادرێت.

٢ـ دەبێت هەنووکەیی بێت، گەر ترسناکی یەکە لە داهاتوویەکی دوور یا نزیکدا روویدات، نابێتە عوزر، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە لەو داهاتووەدا یارمەتی لە کەسێك وەربگرێت.

**ج.مەرجەکانی شوێنی مەترسی:**

لە گرنگترین مەرجەکانی ئەوەیە کە ئەو شوێنەی رووبەرووی مەترسیەکە بومەتەوە مەسڵەحەتێکی وەها بێت کە لە لایەن یاساوە پارێزراو بێت.

**د.مەرجەکانی ئەو کردارەیەمەترسیەکەی پێ لادەبرێت:**

١ـ دەبێت کردارەکە زەرور بێت بۆ لابردنی مەترسیەکە.

٢ـ دەبێت گونجاو بێت لەگەڵ ئەندازەی مەترسیەکە.

**کاریگەریی باروذۆخی پێویستی لە سەر پایەی مەعنەوی تاوان:**

هەرکاتێك پایە و مەجەکانی پێویستی هاتنە دی، ئیتر دەبێتە باروذۆخێکی کاریگەر لە سەر بکەری تاوان و لەوێشەوە لەسەر پایەی مەعنەوی لە رێگەی دامالینی ئازادی ویست کە لای زانایان بناغەی بەرپرسێتی سزایی یە. کەواتە لە رووی جەزلییەوە لێپێچینەوەی لێ ناکرێت، بەڵام لە رووی مەدەنی یەوە بەرپرسە لە بژاردنی ئەو زیانانەی کە لە ئەنجامی تاوانەکەیەوە هاتۆتە ئارا. وەك ئەوەی کەسێك ئۆتۆمبیلێك بدزێت و پاشان نەتوانێت وەك خۆی بیگەرێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی (کاتی دزی کردنەکە).

کەواتە سزای دزەکە پاداشتی دەستدرێژیکردنەکەیەتی بۆ سەر مافی گشتی، بەڵام ئەو قەرەبوەی پێویست دەکرێت لەسەری پاداشتی دەستدرێژیکردنەکەیەتی بۆ سەر مافی تایبەتیی کەسێك.

**ئەنجامگیری:**

لە ئەنجامی خستنەرووی ناوەڕۆکەکانی دوویاسگەی پێشوو لەم بەندە دا بۆمان دەرکەوت کە زۆربەی یاسا هاوچەرخەکانی سزادانی وڵاتەعەرەبی یەکان لەم چەند رووە وە سەرکەوتوو نەبووە لە باسکردنی باروذۆخی کاریگەر لەسەر پایەی مەعنەوی:

یەکەم: تێپەڕاندن(افراط) و بەزایەدان(تفریط) لە دیاریکردنی چوونە ناو تەمەنی هەرلشیدا(سن التمیین)، دەبینیت کە لە نێوان ٧ ـ ١٤ دا دیاریکراوە، دانانی بە ٧ سال تێپەڕاندنە و ١٤ سالیش بەزایەدانە لە زیادەڕۆییدا. باشترینی کارەکان ناوەندترینیانە،ئەوەش لە یاسای ئێستای[1] (چاودێری نەوجەوانان)ی عێراقی(م ٤٧) و یاسای سزاکانی قەتەری(م ٨١) دیاریانکردوە کە هەرکەس نۆ سالی تەمەنی تەواو کرد و چوویە ناو دە سالی یەوە ئەوا چۆتە نێو سالی هەرلشیەوە لە دۆزە جەزاییەکاندا(القضایا الجزائیة).

دووەم: لە دۆخی شێتیشدا ئەم یاسایانە یەکدەنگ نین لە دیاریکردنی یەك پێوەری عەقلانی بۆ نەخۆشی عەقلی کاریگەر لە سەر پایەی مەعنەوی بە شێوەیەك کە گشتگیر بێت بۆ هەموو حالەتە دەروونی و نەخۆشی یە عەقلی یە کاریگەرەکان لە سەر ئەم پایەیەی تاوان، وەك بە درێژی باسمان کرد.

سێیەم: زۆربەی یاساکانی سزای ولاتە عەرەبییەکان بەربەستەکانی سزا و بەربەستەکانی بەرپرسیاریەتی سزاییان تێکەل کردووە و دەستەواژەی (سزا نی یە)یان لە بریتی (بەرپرسیارێتی سزایی نیە) بەکارهێناوە یان(لە رووی سزایی یەوە لێی ناپرسرێتەوە). شتێکی ئاشکراشە کە نەفیکردنی سزا ئەوە ناگەیەنێت کە بەرپرسیاریەتی سزایی لە کۆل دەکەوێت، چونکە یەکەم گشتیترە و دووەم تایبەتترە، نەفیکردنی گشتیتر مەرج نی یە ولتای نەفی تایبەتتر بێت، بەلام پێچەوانەکەی راست دەردەچێت.

بۆ نموونە دەقی مادەی (٧٥) ی یاسای ئێستای سزاکانی لیبیا دەلێت(سزا نیە لە سەر ئەو کەسەی کەسێکی تر ناچاری کردبێت بە کردنی تاوانێك...هتد) لە کاتێکدا ناچارکردن لە بەربەستەکانی بەرپرسیارییەتی سزایی یە، ئەبوا بوترایەت (بەرپرسیارییەتی سزایی نیە) یان ( لە رووی سزایی یەوە پرسیاری لێ ناکرێت)، وە ئەم هەلەیە لە یاساکانی سزای هەندێك ولاتی تردا دووبارە بۆتەوە، وەك یاسای سزاکانی میسری(م٦١) و سوری (م٢٢٦) وە هەروەها.

چوارەم: زۆربەی یاساکانی سزای ولاتە عەرەبی یە هاوچەرخەکان بەربەستەکانی بەرپرسیارییەتی جەزایی و هۆکانی رەوایی(اباحة)یان تێکەل کردووە. دەستەواژەی (تاوان نی یە) یان لە بریتی (بەرپرسیاری یەتی سزایی نی یە)دا داناوە.

---

[1] ژمارە ٧٦ بۆ سالی ١٩٨٣ .

بۆ نموونە دەقی مادەی (٤٩) ی یاسای سزاکانی سوودانی دەڵێت ( تاوان لەو کارەدا نیە کە منداڵێکی خوار حەوت ساڵ دەیکات) ، راست وەهایە کەبڵێت: هیچ بەرپرسیاریەتی سزایی نییە.

مادەی(٥٠)ی هەمان یاسا دەڵێت ( تاوان لەو کارەدا نیە کەسێك بیکات کە لەکاتی تاوانەکەدا توانای تێگەشتنی لە چییەتی کارەکانی خۆی نەبێت یان توانای کۆنترۆڵی کارەکانی نەبێت بە هۆی یەکێك لەم هۆکارانەوە:

ا ـ شێتی هەمیشەیی یان کاتی یان نەخۆشی عەقڵیی.[1]

ب ـ سەرخۆشی پەیدا بوو لە هەر مادەیەکەوە کە بە بێ خولستی خۆی یان بێ ئاگاداری بەکاری هێناوە.

لەو یاسا عەرەبیانەی تر کە ناچارکردنیان بە هۆکانی رێپێدان دانـاوە، یاسای سزاکانی یەمەنی ژمارە (١٢)ی ساڵی ١٩٩٤ کە تازەترین یاسای عەرەبی یە. لە مادەی (٣٥)دا دەڵێت( تاوانکار نییە ئەو کەسەی کارێکی تاوانکارانەی وەهای لێ بووەشێتەوە کە لە ژێر فشاری زۆرلێکرانی مادی.....هتد).

وە راستر وەها بوو بوترێت (بەرپرسیاریەتی سزایی نیە) یان(لە رووی سزایی یەوە لێی ناپرسرێتەوە). بەڵگە نەویستە کە ناچارکرن چ مادی بێت چ مەعنەوی یەکێکە لە بەربەستەکانی بەردەم بەرپرسیاریەتی سزایی و هۆیەك لە هۆکانی بەرەوادانان نی یە.

روونیشە کە نەفیکردنی بەرپرسیاریەتی سزایی واتای نەبوونی تاوان نی یە، چونکە ئەو تاوانەکردارەی لە کاتی بوونی بەربەستی بەردەم بەرپرسیاریەتی سزاییدا کراوە وەك ساوایی و شێتی و سەرخۆشی خۆنەویستانە و ناچارکران و زەرورەت و هێزی ملکەچکار و شتی لەو شێوەیە، هێشتا هەر سیفەتی تاونکارانەی تێدایە سەرەرای لێنەپرسینەوەی تاوانکار لە رووی سزایی یەوە لەبەر یەکێك لە بەربەستانە.

هەروها هەندێك لە یاسا عەرەبی یەکان ئەوەی کە لە هۆکانی بەرەوادانانە کردوویانە بە یەکێك لە بەربەستەکانی بەردەم بەرپرسیاریەتی سزایی و بەم شێوەیە هۆی بەرەوادانان و بەربەستی بەرپرسیاریەتی سزاییان تێکەڵکردووە.

---

[1] لوبنانی (م ٢٣١) و پاشتر، ئوردونی(م ٩١) و پاشتر، سوڵتاننشینی (عومان (م ١٠١) و قەتەری (م ١٩) و ئیمارتی (م ٩) و یەمەنی (م ٣٣) و مەغریبی (بەندی ١٣٤) و سوری (م ٢٣٠).

د . رەووف عەبەید. لا ٦٢٤.

د . مەحمود نەجیب حسنی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٢٢.

لە بریتی دەستەواژەی (تاوان نی یە). وە بەڵگە نەویستە کە زۆرلێکردن چ مادی بێت چ مەعنەوی یەکێکە لە بەربەستەکانی بەردەم بەرپرسیاریەتی سزایی و هۆیەك لە هۆکانی بە رەوا دانان نی یە.

وە روونیشە کە نەفیکردنی بەرپرسیاریەتی سزایی واتای نەبوونی تاوان نی یە، چونکە ئەو تاوانەکردارەی لە کاتی بوونی بەربەستی بەردەم بەرپرسیاریەتی جەزاییدا کراوە وەك منداڵی و شێتی و سەرخۆشی خۆنەویستانە و زۆرلێکان و زەرورەت و هێزی ملکەچکەر و شتی لە شێوەیە، هێشتا هەر سیفەتی تاونکارانەی تێدایە سەرەڕای لێنەپرسینەوەی تاوانکار لە رووی جەزایی یەوە لەبەر یەکێك لە بەربەستانە.

هەروەها هەندێك لە یاسا عەرەبی یەکان ئەوەی کە لە هۆکانی بەرەوادانانە کردوویانە بە یەکێك لە بەربەستەکانی بەردەم بەرپرسیاریەتی سزایی و بەم شێوەیە هۆی بەرەوادانان و بەربەستی بەرپرسیاریەتی جەزاییان تێکەڵکردووە.

وە یەکێك لەو یاسایانەی تووشی ئەم تێکەڵکردنە بووە یاسای ئێستای سزادانی کوەیتی یە(م ٣٨) و دەڵێت (ئەگەر کارمەند لەسەر بناغەی بەکارهێنانی دەسەڵاتێك کارێکی کرد کە وای دەزانی یاسایی یە، یان فەرمانێك جێبەجێ بکات کە وابزانێت بە پێی یاسا پێویستە ملکەچی بێت، لەم کاتەدا لە رووی یاسایی یەوە بەرپرس نابێت).

ئاشکرایە کە باروتۆخی باسکراو لەم یاسایەدا لە هۆکانی بەرەوادانانە، چونکە لە بابەتی بەجێهێنانی ئەرك و نەبوونی بەرپرسیاری یە و مەرج نی یە بەڵگە بێت لەسەر رەوایی کارەکە، چونکە نەفیکردنی گشتیتر واتای نەفیکردنی تایبەتیتر نی یە.

پێنجەم: هەندێك لە یاسا عەرەبییەکان تووشی هاودژ(تناقض) بوون لە نێوان باوەڕبوون بە رەوادانانی کردارەدا و پێویستکردنی بژاردنی مەدەنی لە کاتێکدا ئەو تاوانە کردارەی دەگۆڕێت بە هۆیەك لە (هۆکانی بەرەوادانان) بۆ بەرەوادانراو، هەروەك لە حاڵەتەکانی بەرگری شەرعیدا و بەجێهێنانی ئەرکدا، ئەوا بکەرەکەی نە لە رووی جەزایی و نە لە رووی مەدەنی یەوە لێپرسینەوەی نی یە، چونکە(رێپێدانی شەرعی پێچەوانەی زامن بوونە).

یەکێك لەو یاسایانە یاسای سزادانی سوڵتاننشینی عومانە کە دەقی مادەی (٣٧) ی دەڵێت (ئەو تاوانەی زەرورەتێك بکەرەکەی ناچارکردووە بە کردنی بە تاوان دانانرێت، بەڵکو تەنها قەرەبووی مەدەنی لەسەر پێویست دەبێت....هتد).

ئاشکرایە کە پێویستی لە بناغەدا یەکێکە لە بەربەستەکانی بەرپرسیایەتی جەزایی و لە بابەتی هۆکانی بەرەوادانان نی یە، وە ئەگەر لەبەر باروبۆخی تایبەت بە دۆزەکەوە کرا بە هۆیەك لە هۆکانی بەرەوادانان ئەوا لە نێوان بە رەوادانانی کردار و پێویستبوونی بژاردنی مەدەنیدا ناکۆکییەکی ئاشکرا دیارە، چونکە کاری بەرەوادانراو لێپێچینەوەی سزایی و مەدەنی لەسەر نی یە.

شەشەم: تێکەڵکردنی هەندێك لە یاساکانی سزای وڵاتە عەرەبی یەکان لە نێوان پایەی مەعنەوی و پایەی مادی تاوانـدا کە کاریگەرە بە دۆخی دەرەکی لە زۆرلێکردن و پێویستی یان هێزی ملکەچکەر و هەر شتێکی لەم بابەتە. بەڵام پایەی مادی تاوان ناکەوێتە ژێر کاریگەری هیچ دۆخێك لە دۆخەکانی رەوادران یان لابەری بەرپرسیارییەتی جەزایی یان رێگر لە بەردەم سزادا.

بۆ نموونە لە یاسای سزاکانی یەمەنیدا ژمارە (١٢) ی سالی ١٩٩٤ دا دەڵێت (لقی چوارەم: ئەوەی پایەی مادی وەدوور دەخاتەوە و هەڵەش نەفی دەکات ناچارکردنی مادی و هێزی ملکەچکەرە) لەگەڵ ئەوەشدا هەموو مادەکانی ئەم لقە(٣٥ _ ٣٧) لە بەربەستەکانی بەرپرسیاریەتی سزایین بۆ باروبۆخی دەرەکی کاریگەر لە پایەی مەعنەوی و مادیدا لە هەموو حاڵەتە ئاسایی و هەڵاوێردەکاندا، ئەو ناکەوێتە ژێر کاریگەریی هیچیەك لە دۆخەکان. کاریگەر بوون بە هۆکانی رەوادران یان بەربەستەکانی بەرپرسیاریەتی سزایی تەنها سەبارەت پایەی شەرعی و پایەی مەعنەویەوە یە هەروەك ئاشکرایە لای هەرکەسێك کە کەمترین شارەزایی هەبێت لە یاسا سزاییەکاندا و ئەوەی پەیوەندی پێوەیان هەیە.

گەلێك ناتەواوی و کەلێن و ناکۆکی و پشێوی لە زۆرێك لە یاساکانی مەدەنی و جەزایی وڵاتە عەرەبییەکاندا هەیە و بوار نی یە بۆ پێشچاوخستنی هەمووی و لە تێزی دوکتۆراکەمدا لە یاسادا (نظرية الالتزام بالرد غير المستحق) ئاماژەم بە هەندێکی داوە. لەگەڵ رێزی زۆرم بۆ یاسادانەران لە وڵاتە عەرەبی یەکاندا.

هەموو ئەو باروبۆخانەی باسمان کردن لە باسگەی دووەمدا لە رووی فەلسەفی یەوە پێی دەوترێت کرداری کاریگەر(فعل مؤثر)، وە کارتێکراو پێی دەوترێت کاریگەریگر(منفعل) و ئەو ئەنجامەی لە کردارەکەو سەرهەڵدەدا پێی دەوترێت باروبۆخ(الظرف) وە کاریگەری وەرگرتن(انفعال) پێی دەوترێت کاریگەریی فەلسەفی(کارتێکران)، هەندێکجار نەرێنی و هەندێکجار ئەرێنی یە لە رووی زانستی یەوە و لە تاوانە رووبداودا.

# بەندی سێهەم:
# بارودۆخی کاریگەر لە سەر
# سزا و جوولاندنی داوا

کاریگەربوونی سزا یان جوولاندنی داوا بە بارودۆخی کاریگەر لەسەریان بە نیسبەت سزاوە یە، چ سووکیان بکات یان توندیان بکاتەوە یان هەڵیانبوەشێنێتەوە، مەسەلەی جولاندنی داواش ئەوا لە لایەن دادوەرەوە رەد دەکرێتەوە لەبەر چەند هۆیەکی پاساودار.

بۆیە لە رووی فۆرمەوە ئەم بابەتە دەکرێت بە پێنج باسگەوە.

یەکەمیان تایبەت دەکرێت بۆ سزا و جۆرەکانی. دووەمیان بۆ کاریگەربوون بە سووککردنی سزا.

سێهەمیان بۆ کاریگەربوون بە توندکردنەوەی سزا. چوارەم بۆ کاریگەربوون بە هەڵوەشاندنەوە.

پێنجەم بۆ کاریگەری بارودۆخ لە سەر داوا.

## باسگەی یەکەم:
## پێناسەی سزا و جۆرەکانی

سزا لە زمانی عەرەبیدا وشەی (العقوبة)ی بۆ بەکاردەهێنرێت و لە زمانی عەرەبیشدا لەم وشانەوە وەرگیراوە: عاقبە عقابا و معاقبة(سزای دا) بذنبە او علی ذنبە(لە سەر تاوانەکەی) و واخذ بە واقتص منە(تۆڵەی لێ کردەوە )[1]

لە زاراوەی یاساییدا: سزایەکە بە ناوی کۆمەڵگەوە دەدرێت وەك جێبەجێکردنی فەرمانێکی دادوەری بەسەر ئەو کەسەدا کە بەرپرسیاریەتی لە تاوانێك دەسەلمێنرێت.[2]

کەواتە سزا هەرچۆن بێت ئەگەر تاوانکار تووشی ئازار نەبێت پێی لە بەرانبەر سەرپێچیکردنی بۆ بڕیارێك یان فەرمانێکی یاسایی، یان نەبێتە هۆی بێبەشبوونی لە مافەکانی ژیان، یان ئازادی یان چالاکی رامیاری و شتی لەم بابەتانە، ئەوا هیچ فەلسەفەیەکی تێدا نی یە.

فەلسەفەی سزا بریتی یە لە قەڵاچۆکردنی تاوان کە ئامانجی سەرەکی سزاکە یە و شەریعەتە خودایی و یاسا مرۆییەکان پەیرەوی دەکەن بۆ پاراستنی کۆمەڵگە لە رێگەی گەڕاندنەوە و رێلێگرتنی گشتی(بەربەستکردنی کەسانی تر لە چاولێکردنی تاوانکار) و گەڕاندنەوە و رێلێگرتنی تایبەت(تەمبێکردنی تاوانکار) و بەربەستکردنی لەوەی بگەڕێتەوە بۆ تاوانەکەی و هەرتاوانێکی تر.

وە سزا جێبەجێ ناکرێت لە سەر ئەوکەسە نەبێت کە بەرپرسیاریەتی سزایی لەسەر دەچەسپێت و سەرچاوەی دیاریکردنی ئەم بەرپرسیاریەش دەزگای دادوەری یە.[3]

---

[1] لوبنانی (م ٢٣١) و پاشتر، ئوردونی(م ٩١) و پاشتر، سولتاننشینی (عومان (م ١٠١) و قەتەری (م ١٩) و ئیماراتی (م ٩) و یەمەنی (م ٣٣) و مەغریبی (بەندی ١٣٤) و سوری (م ٢٣٠).

[2] د. محمودمحمود مصطفی ـ شرح قانون العقوبات ـ القسم العام، سەرچاوەی پێشو لا ٥٥٥.

[3] مادەی پێنجەم لە یاسای ئێستای سزادانی عێراقی .

**سزا و زاراوە پەیوەندیدارەکان :**

**أ- سزا و رێوشوێنە مەبادایی یەکان(التدابیر الاحترازیة):**

لەم روانەوە هاوشێوەن:

١- هەردووکیان بە دەقی یاسایی بڕیاریان لە سەر دراوە .

٢- هەردووکیان تەنها بەرانبەر ئەو کەسە دەگیرێتە بەر کە تاوان دەکات .

٣- هەدووکیان بە پێی رێوشوێنی دادوەری و زەمانەتگەلێك دەکرێت کە ئازادی کەسێتی بۆ تاوانبار دەستەبەر دەکات .

٤- ئامانجی هەردووکیان قەلاچۆکردنی تاوانە.

٥ ـ فەرمانەکانی سزادان بەسەر رێوشوێن گرتنەبەری مەبادابیدا جێبەجێ دەبێت لەو رووە وە کە گەڕانەوە قبوولّ ناکات و یاسای (باشترین بژاردە بۆ تاوانبار)ی تێدایە.

سەرەڕای یەکبوونیان لەو لایەنانەوەی باس کرا، سزا جیاوازی لەگەڵ رێوشوێنگرتنەبەری مەبادایی هەیە لەوەدا کە ئێشێکی تێدایە تووشی تاوانبار دەبێت کە گونجاو بێت لەگەڵ پلەی بەرپرسیاریەتیەکەی، بە پێچەوانەی رێوشوێنگرتنەبەری مەبادایی.

**ب ـ سزاو قەرەبووکردنەوە:**

لەوەدا هاوبەشن کە هەردوکیان پاداشتی جێبەجێنەکردنی ئەرکێکی یاسایی یە، بەلاّم لەم مەسەلە جەوهەرییانەدا جیاوازن:

١ ـ قەرەبوو پاداشتی دەستدرێژیکردنە سەر مافێکی تایبەتی یە و سزا پاداشتی دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مافێکی گشتی یان مافێکی هاوبەش کە لایەنی گشتی زاڵترە تێیدا.

٢ ـ داوای قەرەبووکردنەوە لە لایەن زیانلێکەوتووە وە دەبێت لە لایەن خۆیەوە یان بریکارەکەی بەرزبکرێتەوە ، بە پێچەوانەی داوای سزا کە لە لایەن دەستەی داواکاری گشتی یەوە دەبێت، بە مەرجێك یاسا بە پێچەوانەوە بڕیارێکی نەدابێت.

٣ ـ فەلسەفەی قەرەبووکردنەوە گێڕانەوەی هاوسەنگی یە لە نێوان ماف و پابەندی(حقوق و التزامات)یە داراییەکاندا گەر جیاواز بوون، بەلاّم فەلسەفەی سزا پاراستنی قازانجی گشتی کۆمەڵگایە لە رێگەی تەمێکردنی تاوانبار و ترساندنی کەسانی تر و رێگرتنیان لەوەی کە چاو لە تاوانباران بکەن.

**ج ـ سزا و پاداشتی تەمێکردن:**

هەردووکیان لەوەدا یکدەگرنەوە کە پشت بە زەبروزۆر دەبەستن، وبەلاَم لە چەندین رووشەوە جیاوازن وەك:

١ ـ سزا پاداشتی کەسێکە کە سەرپێچی فەرمانێك یان نەهیکردنێك بکات کە ئاراستەی هەمـوو خەڵك کراوە و بۆ قازانجی خەلکە، بە پێچەوانەی سزای تەمێکردنەوە کە بۆ سەرپێچی فرمانێك و نەهییەکی تایبەت بە گروپێکی تایبەت [1] بڕیاری دراوە و تەنها روو لەو کەسانە دەکات کە سەر بەم گرووپەن.

٢ ـ سزا لە لایەن ئەو دەسەلاَتە دادوەری یەوە دەبێت کە نوێنەری دەوڵەتە، بەلاَم سزای تەمێکردن هەندێکجار گروپی تر دەتـوانن جێبەجێی بکەن.

**تایبەتمەندیـیە بنەڕەتیەکانی سزا:**

**ئەمەش هەندێك سیفەت و ئاکارە جیاکەرەوەی سزاکان:**

**١ ـ پێـویستە یاسـایی بێـت، واتـە یاسـا بڕیـاری لەسـەر دابێـت لـە سـەر ئـەو بنـەما دەستـووری یەی ك دەلێت(هیچ سزا و تاوانێك نی یە مەگەر دەقێکی یاسایی دیاری کردبێت).**

**٢ ـ پێویستە دادگەرانە بێت بـە شێـوەیەك کـە لەگـەڵ ئەنـدازە و مەترسـی بـارودۆخی سـووککەر و تـوندکەرەوەی تاوانەکەدا بگـونجێت، هەروەك پاشتر باسی دەکەین بە یارمەتی خـودا.**

**٣ ـ پێویستە بە سەر کەسی بکەردا بـدرێت یـان ئـەو کەسـەی کـە هاوبـەش بـووە لـە تاوانێکدا. ئەمەش بە پێی ئەو بنەما دەستـوری یەی کە لە دەقی قـورئاندا هاتـووە پێش یاسا مرۆیی یەکان﴿ولا تزر وازرة وزر اخرى﴾ سوورەتی الانعام ١٦٤.**

**لەم سیفەتەوە ئەوە بەرهەم دێت کە داوای سزایی تەنها دژی ئەو کەسە تۆمار دەکرێت کە تاوانی کردووە چ بکەری ئەسڵی بێت چ هاوبەش بێت یان ئاسانکاری کردبێت لە کردنی تاوانەکەدا .**

---

[1] **یاسای سەندیکای پزیشکان یان سەندیکای پارێزەران یان سەندیکای کرێکاران و هاوشێـوەکانیان .**

**جۆرەکانی سزا:**

سزای تاوانەکان لە رووی جیاوازەوە دەکرێن بە چەند جۆرێکەوە وەك:

یەکەم: لە رووی ئامانجی کۆمەڵایەتی یەوە:

١ ـ سزای وریاکردنەوەیی(تحذيرية) وەك غەرامەی دارایی و دەستبەسەراگرتنی سامان و هاوشێوەی ئەمانە.

٢ ـ سزای چاکسازیی وەك زیندانی و بەندکردنی درێژخایەن.

دووهەم: لە رووی گەورەیی سزاکەوە دەکرێت بەم بەشانەوە:

١ ـ سزای تاوانەکان: تاوانی گەورە ئەوەیە کە یەکێك لەم سزایانەی هەبێت:

ا ـ سزای لەسێدارەدان.

ب ـ سزای زیندانیی هەمیشەیی.

ج ـ سزای پتر لە پێنج ساڵ تا پانزەساڵ.[1]

٢ ـ سزای کەتن(الجنحة): کەتن ئەوەیە کە بە یەکێك لەم سزایانەی خوارەوە سزا بدرێت:

ا ـ بەندکردنی توند و سادەی پتر لە سێ مانگ بۆ پێنج ساڵ.

ب ـ غەرامەی دارایی[2].

٣ ـ سزای سەرپێچییەکان: سەرپێچی ئەوەیە یەکێك لەم دوو سزایەی هەبێت:

ا ـ بەندکرانی سادە لە ٢٤ کاتژمێرەوە تا سێ مانگ.

ب ـ غەرامەی دارایی سادە، بنەمای هەڵسەنگاندنیش مەترسی تاوانەکەیە.

سێیەم: لە رووی بنەرەتی و هاوشێوەکانیەوە دەکرێت بە سێ بەشەوە: سەرەکی(اصلية)، شوێنکەوتە(تبعية)، تەواوکەر(تكميلية).

سزای بنەرەتی ئەمانەیە:

ا ـ کوشتن بە سێدارە یان بە فیشەك، وە ئەم جۆرە سزایە پاش پەرەسەندنی بیری بیرمەندان لە چاککرنی کۆمەڵگەدا و پەرەسەندنی یاسادانەران لە چەسپاندنی

---

[1] مادەی ٢٥ لە یاسای ئێستای سزادانی عێراقی.

[2] مادەی ٢٤ لە هەمان یاسای عێراقی.

دادگەریدا کەمبوەتەوە .

ب ـ زیندانی(سجن) هەمیشەیی: یاسای سزادانی وڵاتە عەرەبی یەکان لە دیاریکردنی ماوەی زیندانی هەمیشەییدا جیاوازن، هەندێکیان بە (٢٠)[١] ساڵیان داناوە و هەندێکیان بە( ٣٠)[٢] ساڵ و هەندێکیشیان بە (مانەوەی لە زینداندا هەتا مردن) دایانناوە[٣]

زیندانیش لە هەندێك یاسادا هاوکاتە بە کاری سەخت و هەندێکیشیان لەم بارەیەوە هیچیان نەوتووە و تەنها باسی زیندانیی هەمیشەیی و کاتییان کردووە.

ج ـ زیندانیی کاتی: یاسای سزای وڵاتەعەرەبی یەکان لە دیاریکردنی لانی کەمی زیندانیکردندا جیاوازن، هەندێکیان [٤] بە پتر لە ٥ ساڵ تا ١٥ ساڵیان داناوە. لە هەندێك یاساشدا[٥] بە ٥ ـ ٣٠ ساڵ دانراوە.

د ـ بەندکردن(حبس)ی توند: ماوەکەی سێ مانگ تا پێنج ساڵ.

هـ ـ بەندکردنی سادە: لە ٢٤ سەعاتەوە تا سێ مانگە بە مەرجێك لە دەقی یاسادا پێچەوانەکەی نەهاتبێت[٦] .

ئەوەی شایانی باسە کە هەندێك لە یاسای سزاکانی وڵاتە عەرەبی یەکان هەردوو دەستەواژەی (الحبس/بەندکردن) و السجن/زیندانیکردنیان) ی بەکارهێناوە و (السجن)زیندانیکردن بۆ سەرووی ٥ ساڵ و (الحبس) بەندکردنی بۆ ٥ ساڵ و کەمتر بەکارهێناوە. هەندێکیان تەنها وشەی (الحبس)ی بەکارهێناوە کە بریتی یە لە هەموو ئەو سزایانەی ئازادی لە مرۆڤ دەسێنێتەوە بەبێ رەچاوکردنی ماوەکانی . لە کاتێکدا هەندێکیان تەنها وشەی (السجن)ی بەکارهێناوە کە بریتی یە لەو سزایەی ئازادی لە مرۆڤ

---

[١] یاسای ئێستای سزادانی عێراقی(م ٨٧) و یاسای سزادانی جەزائیری(م ٥).

[٢] یاسای سزادانی میسری(م ٣٤).

[٣] یاسای ئێستای سزادانی عێراقی(م ٨٧) و یاسای سزادانی جەزائیری(م ٥).

[٤] وەك یاسای عیراقی، کە دەڵێت: هیچکام لەو سزایانەی ئازادی لە مرۆڤ دەسێننەوە لەنابێت ٢٥ ساڵ تێپەڕ بکات لە هەموو حاڵەتەکاندا.(م ٨٧).

[٥] یاسای لیبی (م ٤٨).

[٦] یاسای عیراقی (م ٢٧).

دەسێنێتەوە بە رەهایی .

و ـ غەرامەی دارایی: بریتییە لەو ئەندازە پارەیەی کە پێویستە کەسی حوکمدراو بیدات بە گەنجینەی گشتی(الخزانـة العامـة). بۆ خەملاندنی ئەندازەی ئـەم غەرامەیـەش پێویستە لەسەر دادوەر بارودۆخی دارایی و کۆمەڵایەتی و شتی تری لـەم بابەتانـەی تاوانبار رەچاو بکات و هەروەها کایەی سوودوەرگرتنی تاوانبار لە تاوانەکەی لەگەڵ رەچاوکردنی ئەو بارودۆخەی کە چواردەوری کەسی تاوانباریان داوە.

ز ـ گلدانەوە لە قوتابخانەیەکی چاکسازیی کەتنکاراندا.

٢ ـ سزا شوێنکەوتەیی یەکان: جگە لـە سـزا سـەرەکی یـەکان یاسـاکانی سـزای وڵاتـە عـەرەبی یـەکان هەنـدێك سـزای تریـان دانـاوە کـە ناوی(سـزا شـوێنکەوتەکان) و (سـزا تەواوکارەکان) و دەستەواژەی تریشی بۆ بەکار هێنراوە.

**لە گرنگترین سزا شوێنکەوتەییەکان:**

بێبشـکران لـە هەنـدێك مـاف و شایسـتەیی وەك گرتنـە دەسـتی ئەرکـە گشـتییەکان و خۆکاندیدکردن بۆ ئەندامیەتی ئەنجومەن و دەستە گشتی یەکان. هـەروەها لادانـی لەسـەر وەزیفە گشتی یەکان و بێبەشکردنی لە پیشـەگەری کـردن، داخسـتنی شـوێنکارە گشـتی یەکان(المحلات العامة) و چاودێری پۆلیس و دەسبەسەراگرتنی دارایی و شتی لە بابەتە.

٣ ـ سزا تەواوکارەکان(التكميليـة): یاسـای سـزای وڵاتـە عـەرەبی یـەکان لـە سـەر ئـەو مەبەسـتەی لـە دەسـتەواژەی سـزا تەواوکەرەکانـدا هەیـە جیـاوازن، بەڵکـو هەنـدێکیان پشتگـوێیان خسـتـووە و هەندێکیشـیان دەسـتەواژەی تریـان بـۆ بـەکارهێناوە، وەك (الاضافية/زیادکراو) و (الفرعية/لقـی) و (التاديبيـة/تەمێکارانـە) و (التكـديريـة/لێڵکارانـە) یـان دەستەواژەی تری لەو چەشنە.

لە جیاوازی یە بنەڕەتیەکان ئەوەیە سزای شـوێنکەوتەیی پێـویستی بە دەقێکـی تـری نـوێ نیە پاش دەقی سزا سەرەکییەکان، بە پێچەوانەی سزای تەواوکەرەوە کە بـە دەقێـك دیاری دەکرێت کە سەربەخۆ بێت لە دەقی سزا سەرەکی یەکان.

هەندێك یاسای عەرەبی[1] دابەشكردنێكی تری هەڵبژاردووە لە رووی گەرەیی سزاكەوە بەم شێوەیە:

ا ـ **سزا تیرۆریستی یەكان:** بریتی یە لە سێدارەدان و زیندانی هەمیشەیی(هەتاهەتایی) و زیندانی كاتی (پتر لە ٥ ساڵ تا ١٥ ساڵ) .

ب ـ **سزا تەمێكەرەكان:** بریتی یە لە بەندكردن لە ١٠ رۆژەوە بۆ ٣ ساڵ و غەرامەی دارایی.

ج ـ **سزا لێڵكەرەكان(التكديرية):** بریتیە لە ٢٤ سەعات تا ١٠ رۆژ .

بێگومان هەندێك لە یاساكانی سزای وڵاتە عەرەبی یەكان دابەشكردنی سزاكانیان پشتگوێ خستووە و تەنها تاوانەكانیان دابەشكردووە بە پێی گەورەیی تاوانەكان و مافی دەستدرێژی لێكراو و هەندێكیشی سزای شوێنكەوتەیی و تەواوكەری بە یەكجۆر داناوە.[2]

لە نێو ئەو دابەشكردنانەی باسكران باشترین دابەشكردنێك ئەگاداریوویم لێی ئەو دابەشكردنەی بژاردەی یاسادانەری عیراقی یە لە یاسای ئێستای سزادانی عێراقی[3]، چونكە رێكوپێكتر و گشتگیرترە و نزیكترە لە عەقڵی ساغ و لۆجیكی یاسایی.

[1] وەك یاسای سزاكانی بەحرەینی (م ٤٧ ـ ٥٦)

[2] وەك یاسای كوەیتی (م ٦٦ ـ ٨٠).

[3] ژمارە ١١١ ی ساڵی ١٩٦٩.

## پاسگەی دووەم:
## ئەو بارودۆخانەی دەبنە هۆی سووککردنی سزا

ئەو بارودۆخەی هاوکاتی تاوانکردنەکەیە یەکەمجار کار لە تاوانکەر دەکات، پاشان کار لە سزا دەکات، چونکە کاریگەریی و کارتێکران کە لە بابەتی کردار و کارتێکرانی فەلسەفین دەکەونە نێوان بارودۆخی هاوکات لەگەڵ تاوان و تاوانکەردا، پاشان لە نێوان بارودۆخ و ئەو سزایەی لە بناغەدا دیاریکراوە بۆ تاوانەکە لە کاتی نەبوونی ئەو بارودۆخەدا. هەروەك لەو بارودۆخانەدا کار دەکەنە سەر پایەی شەرعی و مەعنەوی، کەواتە کارتێکران سیفەتی بکەرەکەیە و پاشان دەگوێزرێتەوە بۆ بەرپرسیارێتی جەزایی و لایدەبات وکردارەکە دەکاتە رێپێدراو یان رێگر دەبێت لە لێپرسینەوەی تاوانکار لەبەردەم بەرپرسیارێتیە سزاییەکەیدا.

وە دروستە و بەڵکو پێویستیشە ئەو سزایانەی یاسا بڕیاری لەسەر داوە دژی تاوانکار سووك بکرێت کاتێك بوونی بارودۆخێك(بەهانەیەك)ی یاسایی یان دادوەری هەبێت و دەبێتەهۆی سووککردنی سزاکە بە قازانجی تاوانکەر بەپێی پلەبەندی سزاکان، بەڵام جیاوازی لە نێوان یاساکاندا هەیە لە چەند خاڵێکدا کە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە، گرنگترینیان:

**یەکەم: جیاوازی لەو دەستەواژانەدا کە باس لە پلەبەندی سزاکان دەکەن بە زنجیرەی بەرەوخوار هاتن بەم شێوەیە:**

١ ـ سێدارە.

٢ـ زیندانی هەمیشەیی[1] یان کاری سەختی هەمیشەیی[2] یان گرتنی هەمیشەیی.[3]

یاسای سزاکانی وڵاتە عەرەبی یەکان جیاوازن لە مەبەستی وشەی هەمیشەیی، لە هەندێك یاسادا وەك یاسای عێراقی (م ٨٧) بە ٢٠ساڵ دانراوە و لە هەندێکی تردا بە ٣٠

---

[1] زاراوەی هەندێک لە یاساکانە، وەک عێراقی (م ٨٥) .

[2] هەندێک لە یاساکان بەکاریان هێناوە، وەک یاسای میسری (م ١٤).

[3] ئەم دەربڕینە لە هەندێک یاسادا هاتـووە.

ساڵ دانراوە و لە هەندێکی تردا بە (تامردن) کە مانەوەی تاوانکارە لەو سزایەدا تا لە ژیاندا بێت هەروەك پێشتر باسمان کرد.

٣ ـ زیندانیی کاتیی یان کاری سەختی کاتیی یان بەندکردنی کاتیی: ماوەی کاتیی بە (٥ ـ ٢٠ ساڵ) دانراوە بە پێی جیاوازی ئاراستە یاسایی یەکان.

٤ ـ بەندکردن: ماوەکەی لە نێوان ٢٤ سەعات و (٥ ساڵ) دایە.

٥ ـ غەرامە.

**دووەم: جیاوازی لە ئەندازەی سزادا پاش سووککردنی بەم شێوەیە:**

١ ـ کاری سەختی هەمیشەیی یان زیندانی هەمیشەیی یان بەندکردنی هەمیشەیی لە بریتی سزای لە سێدارەدان.

٢ ـ سزای کاتیی لە بریتی هەمیشەیی.

٣ ـ بەندکردن بۆ ماوەیەکی پتر لە ٥ ساڵ لە هەندێك یاسادا یان زیندانی پتر لە ٣ ساڵ لە هەندێك یاسادا لە بریتی کاتیی.

٤ ـ غەرامە لە بریتی بەندکردن.

لە هەموو حاڵەتەکاندا لەسەر دادگا پێویستە کە هۆکاری سووککردنەکە روون بکاتەوە.

**سێهەم: بۆچوونە یاسایی یەکان جیاوازن لە گۆڕانی سروشتی تاوان پاش سووککرانی سزاکەی:**

ا ـ ئاراستەیەك پێی وایە دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان سووککردن بەهۆی بەهانەیەکی یاسایی یەوە لەگەڵ سوووککردن بەهۆی باروئۆخێکی دادوەری سووککارەوە.

ئەنجا ئەگەر سووککردنەکە بە هۆی بەهانەیەکی یاسایی سووککەرەوە بوو ئەوا جۆری تاوانەکەدەگۆڕێت، بۆ نموونە ئەگەر سزای تاوانی گەورە گۆڕا بۆ سزای تاوانی مامناوەند یان سزای تاوانی مامناوەند گۆڕا بۆ سزای تاوانی سەرپێچی(تاوانی بچووك) ئەوا تاوانەکە لە حاڵەتی یەکەمدا لە گەورەوە دەگۆڕێت بۆ مامناوەند و لە حاڵەتی دووەمدا لە مامناوەندەوە دەگۆڕێت بۆ بچوك. نهێنی ئەمەش لەوەدایە کە یاسا فەرمانی داوە بە دادگا بە سووککردنی سزا لە هەبوونی بەهانەیەکی یاسایی سووککەردا، وە هەر یاساشە کە سزایەکی دیکەی داناوە جگە لە سزا سەرەکیەکە.

ئەگەر سووککردنی سزا لەبەر دۆخێکی دادوەریی سووککەر بێت، ئەوا تاوان هەمان گەورەیی و ترسناکیی یاسا خۆی دەپارێزێت و جۆرەکەی ناگۆڕێت و تاوانی گەورە نابێتە مامناوەند و ئەمیش ناگۆڕێت بۆ سەرپێچی[1].

ب ـ ئاراستەیەکی تر هەیە کە پێی وایە کە سووککردنی سزا بە هیچ شێوەیەک جۆری تاوانەکە ناگۆڕێت. یاسادانەری عێراقی لە یاسای ئێستای سزاداندا ئەم ئاراستەی هەڵبژاردووە و لە مادەی(٢٤)دا دەڵێت (جۆری تاوان ناگۆڕێت ئەگەر دادگا سزایەکی گۆڕی بۆ جۆرێکی سوکتر چ ئەم گۆڕانە بە هۆی بەهانەیەکی یاسایی یەوە بێت یان بە هۆی بەهانەیەکی دادوەری) مادام دەقی یاسا شتێکی جیاواز نەڵێت.

بارودۆخە کاریگەرەکانی سەر سزا دووجۆرە: بەهانە یاسایی یەکان وبارودۆخە سووککەرەکان. وە گرنگترین جیاوازی نێوانیشیان بریتییە لە:

١ ـ بەهانە یاسایی یەکان لە دەقە یاساکانی یاسادانەردا دیاریکراوە و سنووردارکراوە، بە پێچەوانەی بارودۆخی سووککەرەوە کە یاسا بازنەیەکی سنووورداری بە سەردا نەسەپاندووە، بەڵکو وازی لێدەهێنرێت بۆ دادوەر بۆ دیاریکردنی.

٢ ـ لە بەهانە یاسایی یەکاندا دادوەر ناچاردەکرێت بە سووککردنی سزا، بەڵام لە بارودۆخە سووککراوەکاندا دادوەر دەسەڵاتی خەمڵاندنی هەیە.

٣ ـ بەهانە یاساییەکان بە هۆی دەقەوە سنووردار دەبن بە پێچەوانەی بارودۆخە سووککەرەکانەوە.

## گرنگی یاسایی هۆکارەکانی سووککردن:

هۆکانی سووککردن بە هەردوو جۆرەکەیەوە گرنگییەکی زۆری هەیە، کە بریتی یە لە سەرپشککردنی دادوەر لە دەسەڵاتی فەرماندەرکردن بە سزا کەمتر لەو لانیکەمەی عادەتەن یاسا دیاری دەکات. لەم هۆکارە سووککەرانەدا فراوانییەخشینە بە دەسەڵاتی خەمڵاندنی دادوەر و لەوێشەوە مافی ئەوەی هەیە لە لانیکەم تێپەڕێت هەرکاتێك یەکێك لە هۆکارەکانی

---

[1] الاستاذ محسن ناجي ـ الاحكام في قانون العقوبات ـ شرح على متون النصوص الجزائيه لا ١٠٤.

سووککردنی تاوان و پاساوی ئەوکارەی هەبێت و پابەندبوونی بە سنوورەکانی یاساوە نابێت لەوکاتانەدا[1].

### جۆرەکانی بەهانە یاسایی یەکان:

بەهانە یاسایی یەکان دوو جۆرن: سووککراوەکان یان لێبووراوەکان. گرنگترین جیاوازی سەرەکی لە نێوانیاندا ئەوەیە کە بەهانە سووککراوەکان دەسکاری خودی سزاکە ناکەن بەڵکو بە دەق کاردەکەنە سەر ئەندازە دیاریکراوەکە بە پێچەوانەی بەهانە لێبوردەیی یەکانەوە کە بە تەواوی سزاکە لادەبات.

بۆ ئەوەی درێژەی پێنەدەین تەنها هەندێك نموونە لە بەهانە یاسایی یەکان و بارودۆخە سووککەرە دادوەریی یە کان دەخەینە پێشچاو، چونکە بابەتەکە لەم بوارەدا تایبەت نەکراوە بۆ هۆکانی سووککردن و بەهانە یاسایی یەکان، بەڵکو بۆ روونکردنەوەی فەلسەفەی بەرپرسیاری یەتی جەزایی لە ژێر تیشکی کردار و کارلێکرانی فەلسەفیە.

#### أ- چەند وێنەیەك لە بەهانە سووککەرەکان:

یەکەم: کاریگەربوون و هەڵچوونی بە دۆخێك کە بریتی یە لەوەی کتوپڕ ژنەکەی یان یەکێك لە ئافرەتە مەحرەمەکانی ببینێت لە حاڵی زیناکردندا یان لەسەر جێگادا بن و ئەمیش یەکسەر هەردووکیان یان یەکێکیان بکوژێت، یان لە هەردووکیان یان لە یەکێکیان بدات و ببێتە هۆی مردن یان سەقەتبوونێکی هەمیشەیی. زۆربەی یاسا عەرەبی یەکان بە دەق باسیان لەم بەهانە یاسایی یە کردووە کە تاوانی گەورە دەگۆڕێت بۆ مامناوەند. وەك یاسای ئێستای سزادانی عێراقی (م ٤٠٩) و یاسای ئێستای سزادانی میسری (م ٢٣٧) کە هەردووکیان لە دەقەکانیاندا دەڵێن تاوانکەر پتر لە ٣ ساڵ زیندانی ناکرێت. یاسادانەری عێراقی سەرکەوتووتر بووە لە یاسادانەری میسری، کاتێك بە دەقێکی روون باسی لە هەردوو حاڵەتی (لێدان تا ئاستی مردن) و (لێدان تا ئاستی سەقەتکردنێکی هەمیشەیی) کردووە، بەڵام یاسادانەری میسری تەنها باسی لە حاڵەتی کوشتن کردووە و بۆ دوو حاڵەتەکەی تریش دادوەر سووککردنی سزاکە لە بنەمای(تێگەشتنی گونجاو لەگەڵ

[1] د. محمود نجیب حسنی ـ سەرچاوەی پێشوو لا ٧٠٠.

دەق/المفهوم الموافق للنص)ی دەقی (م ٢٣٧)ەوە وەردەگرێت، چونکە کەسی بکوژ ئەگەر سوود وەربگرێت لەم لۆخە قێزەونە بینراوە بە سووکبوونی سزا لە سێدارەوە بۆ بەندکرانی کەمتر لە ٣ ساڵ، ئەوا باشتر سوود وەردەگرێت لە هەردوو حاڵەتی لێدانی بە مردن گەیەنەر یان لێدانی سەقەتکردنی هەمیشەیی، سەرەڕای ئەمەش یاسادانەری عێراقی لە دەقەکەیدا دەڵێت: ژنەکەی یان هاوبەشەزیناکارەکەی بۆیان نی یە مافی بەرگری شەرعی بەکاربهێنن دژی ئەوکەسەی سوود لەم عوزرە و بارولۆخی قێزەونی کاریگەر وەردەگرێت.هەروەها حوکمەکانی بارولۆخە توندکراوەکانی لە دژ بەکارناهێنرێت کە لە مادەی(٤٠٦)ی یاسای ئێستای سزادانی عێراقیدا پەرەگراف( ز ) کە بە دەقی روون سزای لە سێدارەدانی داناوە بۆ کوشتنێکی ئەنقست کە هاتبێت لەگەڵ تاوانێك یان پتر لەتاوانەکانی کوشتنی ئەنقەست یان دەست پێکردنی.

دووهەم: تێپەڕاندنی سنووری بەرگری شەرعی: لە باسگەی پێشتردا ئەوەمان روونکردەوە کە لە گرنگترین مەرجەکانی بەرگری شەرعی ئەوەیە کە ئەندازەی وەڵام گونجاو بێت لەگەڵ دەستدرێژ یەکەدا، بە شێوەیەك کە بەرگریکار سنووری پێویست بۆ لابردنی مەترسی لەسەر خۆی نەبەزێنێت، بەڵام ئەگەر ئەم سنوورەی بەزاند، ئەوا ئاراستەی یاساکانی وڵاتە عەرەبیەکان لە سەر ئەم مەسەلەیە جیاوازە. هەندێکیان پێیان وایە کە سزانادرێت لە سەری، وەك یاسای لوبنانی (م١٨٤ و ٢٢٨) و سوری (م ١٨٣ و ٢٢٧) کە لە دەقەکانیاندا سزای بکەری لەو شێوە نادرێت و دەڵێن(ئەگەر سنووری بەزاند لە بەرگریدا....ئەگەر ئەم کارەی لە هەڵچوونێکی بەهێزی دەروونیدا بوو کە هێزی بیرکردنەوە و ویستی لەدەست دابوو).

بەڵام زۆربەی یاسای سزای وڵاتە عەرەبی یەکانی تر رایان لەسەر سووککردنی سزایە لەم حاڵەتەدا بە سەپاندنی سزای تاوانی مامناوەندا لەو حاڵەتەدا کە بەرگری یەکە تاوانێکی گەرە بێت. لەو یاسایانەی وەها دەڵێن یاسای ئێستای سزادانی عێراقە (م ٤٥)[1] ، و میسری (٢٥١) و کوەیتی (م٣٦)، و قەتەری (م ٣٢)ە.

---

[1] کە لە دەقەکەیدا دە ڵێت(ماف بەرگری شەرعی رەوای ناکات کە زیانێکی زۆرتر لەوەی پێویستمانە بۆ بەرگری بگەیەنین وە ئەگەر بەرگریکەر بە ئەنقەست یان بە پشتگوێخستن یان بڕوای وەها بوو ئەم
←

**ب- بارودۆخە سووککەرەکان:**

پێشتر روونمانکردەوە کە ئەم بارودۆخانە لە هۆکانی سووککردنی سزان و یاسا دیاریان ناکات بەڵکو بەجێدەهێڵرێن بۆ دادوەر بۆ دیاریکردنی و جێبەجێکردنی سزا بە پێی دۆخەکان. بارووبۆخە سووککەرەکان جۆراوجۆرن و زەحمەتە بۆمان بژمێررێت، چونکە هەندێکیان پەیوەندی بە بارووبۆخی کەسی تاوانبارەوە هەیە لەبەر رەوشتباشی پێش تاوانەکە، هەندێکی پەیوەندی بە هۆکاری دەرەکی یەوە هەیە کە هەڵچوونی دەروونی دەوروژێنێت وەك وروژاندن و سەرخستنەسەری تاوانکار لە لایەن تاوانبەسەرداکراوەوە، وە هەندێکی پەیوەندی بە باری ئابووری تاوانکارەوە هەیە کە پاڵی پێوە دەنێت کە خیانەت لە ئەمانەت بکات یان تاوانی دزی بکات یان شتی لەم بابەتانە.

دادوەر دەتوانێت ئەم دۆخانە و هاوشێوەکانی بدۆزێتەوە لە ژینگە و مولابەساتی تاوانەکەدا چ پەیوەندی بە لایەنەمادییەکانیەوە بێت وەك بێنرخیی ئەو زیانەی لێوەی بەدیهاتووە یان لاوازی ئەو ئامێرەی تاوانەکەی پێکراوە، یان روودانی تاوانەکە لە کات و شوێنێکدا کە لەوێدا زیانەکەی کەتر بێت، یان شتی تری لەم بابەتانە.

گرنگی بارودۆخی سووککەر ئەوەیە کە دادوەر وەها لێدەکات لە توندی ئەو سزایە دوور بکەوێتەوە کە یاسا بڕیاری دەدات لەو حاڵەتانەدا کە روونبێتەوە سزای بڕیارلەسەردراو توندترە لەوەی تاوانەکە دەیخوازێت.

ئەوەی شایانی باسە چوارچێوەی بارودۆخە سووککراوەکان تەنها تاوانە گەورەکان دەگرێتەوە نەك مامناوەندەکان و سەرپێچییەکان. فەلسەفەکەشی ئەوەیە کە یاسادانەر عادەتەن لانی کەمی سزای مامناوەند و سەرپێچی دیاری ناکات، بەڵکو سنووری ئەوپەڕی دیاری دەکات و لانی کەمیی بە سنووری گشتی دادەنێت کە لە خۆیدا نزمە و یاسا نایەوێت دادوەر لە خوارئەوەوە سەرپشك بێت.[1]

---

سنوورەی تێپەڕاند، ئەوا بەرپرسە لەو تاوانەی دەیکات، وە لەم حاڵەدا دروستە بۆ دادگا فەرمانی سزایەکی مامناوەندی بەسەردا بدات لە بریتی سزای گەورە و وە فەرمانی سزای سەرپێچی بدات لە بریتی سزای مامناوەند).

[1] د . محمود نجیب حسنی ـ سەرچاوەی پێشو لا ٧٠٩ ، بند ٨٨٣.

## باسگەی سێهەم:
## بارودۆخی توندکەرەوەی سزا

توندکردنەوەی سزا لە بابەتی کاریگەریدانان و کاریگەر بوونە کە دەگەڕێنەوە بۆ وتەزای کردار و کارلێکرانی فەلسەفی، ئەوەی شایانی باسە کە توندکردنەوەی سزا نایەتەدی مەگەر لەو دوا سنوورە تێپەڕێت کە یاسا بڕیاری دەدات، ئەگەر سزا سنووری ئەمپەڕ و ئەوپەڕی هەبوو و دادوەر لە سزاکەدا ئەوپەڕی جێبەجێ کرد هێشتا بە توندکردنەوەی سزا دانانرێت. تێپەڕاندنی ئەوپەڕی سزاش لە یاسادا ڕێگای پێ نەدراوە ئەگەر پاساونەدرابێت بە بارودۆخێك یان هۆیەکی کاریگەر کە یاسا دانی پێدا دەنێت لەسەر بناغەی کردار و کاڵێکرانی فەلسەفی .

وە لەگەڵ ئەو هۆیانەی کەرەنگە ببنە بەربەست لە ڕووی بەرپرسیاریەتی جەزاییدا یان سووکی بکات یان نەهێڵێت سزا ڕوویدات. بە پێچەوانەشەوە چەند بارودۆخێکی(هۆکارەکان) تر هەیە کە پێویستبوونی توندکەرەوەی سزا دەخوازێت.

ئەم بارودۆخانەش هەندێکجار پەیوەستن بە لایەنی بەرجەستەیی تاوانەوە کە بەڵگەیە لە سەر رادەی ترسناکی تاوانەکە، وە هەندێکجار پەیوەندی بە کردار و ئەنجامەوە هەیە، جا گەر پەیوەندی بە کردارەوە هەبوو ئەوا دەگەیەنێت کە ئەو کارە ترسناکیی لەسەر کۆمەڵگەو تاك زۆرتر بێت. هەندێکجاریش ئەم ترسناکی یە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو هۆکارەی لە پرۆسەی تاوانەکەدا بەکارهێنراوە بە شێوەیەك گەورەیی ئەو تاوانەکردارە زۆرتر دەکات، وەك بەکارهێنانی ژەهر لە تاوانی کوشتندا یان بەکارهێنانی زۆر و توندوتیژی لە تاوانی دزیدا.

وە هەندێکجار ترسناکیی یەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕوودانی تاوان لە شوێنێکی دیاریکراودا، وەك دزیکردن لە ماڵێکدا کە خەڵکی تێدا نیشتەجێ بوویێت. هەندێکجاریش ترسناکیی تاوان دەگەڕێتەوە بۆ کاتێکی دیاریکراو وەك دزیکردن لە شەودا، هەندێکجاریش دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی نێوان تاوانکار و تاوانلێکراو وەك ئەوەی تاوانلێکراو باوك یان دایکی دزەکە بێت یان هەر شتێکی لەم وێنەیە.

هۆکارە پاساودارەکانی توندکردنەوە یان بارودۆخی توندکەرەوە لە یەك پلەدا نین لە ڕووی پابەندکردنی دادوەرەوە بە جێبەجێکردنی توندکردنەوە، بەڵکو دەکرێت بە دوو بەشەوە:

**ا- هۆکار( یان بارودۆخ )ە کراوەکان- الجوازیة-**

دادوەر دەسەڵاتی خەمڵاندنی هەیە لە لە چەسپاندنی سزایەك كە لە دواسنووری دیاریکراو تێپەڕێت یان هەمان ئەو سزایە جێبەجێ بکات کە لە یاسادا دیاریکراوە، هەروەك لە تاوانی دووبارەکردنەوەی تاواندا.

لە رای خاکییانەی بەندەدا: ئەم دەسەڵاتەی خەمڵاندن کە دراوە بە دادوەر تەنها بۆ ئەو ئەندازە تێپەڕاندنەیە کە لە دواسنوور دەردەچێت، بەڵام خودی تێپەڕاندن ئەوا دادوەر پابەندەبێت پێوەی و دەسەڵاتی خەمڵاندنی چەسپاندنی توندکردنەوە یان توندنەکردنەوەی نیە، چونکە ئەوە یاسا فەرمانی پێکردووە وەك بارودۆخەکانی توندیخوازیی سزا یان زۆرلێکردن یان توندوتیژی بەکارهێنان لە کاتی تاوانی دزیدا.

**ب- هۆکار( یان بارودۆخ )ە پێویست و نەگۆڕەکان:**

دادوەر مافی ئەوەی نییە کە فەرمان بدات بەو سزایەی کە لە ئەسڵدا بڕیاردراوە، بەڵکو پێویستە لەسەری فەرمان بەو ئەندازەیە بدات کە لە دواسنوور دەرچووە و سزای ئەسڵییشی تێدا جێبکاتەوە، هەروەك حاڵەتی دزیکردن لەژێر فشاری زۆرلێکراندا یان بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ ئاسانکردنی دزی یەکە.

جا بۆ ئەوەی تووشی درێژدادڕی نەبین تەنها دوو نموونە ڕووندەکەینەوە لەو تاوانانەی کە سزاکانی دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو بارودۆخانەی لە کاتی ڕوودانەکەدا هاوشانیبوون، وەك گەڕانەوەی تاوانبار و تاوانی دزیکردن بە بەکارهێنانی فشاری تایبەت.

**یەکەم: تاوانی گەڕانەوە(دووبارەکردنەوە):**

گەڕانەوە بریتی یە لەوەی تاوانبار دووبارە بگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانەی کە پێشتر حوکمی کۆتایی بەسەردا دراوە و لە ئەنجامی بارودۆخی گەڕانەوە و کاریگەریگەریی تاوانەکە و لەوێشەوە سزاکەی، ئەو ئەنجامە سەرهەڵدەدات کە بە توندکردنەوەی سزاکە دەناسرێت، چونکە گەڕا ئەوە بارودۆخی کەسێکە کەوا تاوانێك یان پتر دەکات پاش حوکمدانی کۆتایی بەرانبەری لە سەر تاوانێکی تر.

سزای توندکراوەی دواتاوان لەسەر ئەو بنەما فەلسەفییە بونیادنراوە کە گەڕانەوەی تاوانبار بۆ سەر تاوانەکەی ئەوە دەگەیەنێت سزای یەکەمینجار ئامانجی خۆی نەپێکاوە کە بریتی یە لە

ترساندن و رێگاگرتن لە تاوانبار کە بگەڕێتەوە سەر تاوانەکەی[1]

**پەیوەندی نێوان گەڕانەوە و فرەتاوانی:**

گەڕانەوە بۆ تاوان و فرەتاوانی لەوەدا یەکدەگرنەوە کە تاوانبار چەندجارێك ئەو تاوانەی کردووە، جیاوازیشیان ئەوەیە کە لە فرەتاوانیدا وا دیارە کە تاوانکەر چەندینجار تاوانی ئەنجامداوە پێش ئەوەی لە سەر هیچیەکێکیان حوکمی کۆتایی بدرێت، بەڵام لە گەڕانەوەدا وا دیارە کە حوکمی کۆتایی دراوە بەسەر تاوانکاردا پێش ئەنجامدانی تاوانی دلهاتوو.

شایانی باسە کە بابەتی گەڕانەوە بۆ تاوان گرنگییەکی تایبەتی پێدەدرێت لە هەردوو زانستی تاوانەکان و سزاکانەوە، چونکە حاڵەتی کەسی گەڕاوە سەرنەکەوتنی ئەو سزایەمان پێ ڕادەگەیەنێت کە پێشتر بەسەر تاوانباردا دراوە، لە لایەکی ترەوە ئەوەش دەگەیەنێت کە سروشتی تاوانکاری زۆر بە قووڵی رەگی لە ناخی تاوانکاردا داکوتاوە. هەروەها دەنگی ویژدان لە مرۆڤدا لاوازتر دەبێت لە گەڵ بەردەوامبوونی لە سەر خراپە.

هەروەها مرۆڤ تەنها سیفەتی چاولێکەری کەسانی تری تێدا نییە، بەڵکو بە سروشتی خۆی چاولێکەری بەرانبەر کارەکانی خۆشی تێدایە، چ یەکجۆر بێت یان فرەجۆر، بە تایبەتی ئەگەر بەندیخانەکان نەبوونە قوتابخانەیەکی باشکردن هەروەك ئێستا لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا دەیبینین، بەڵکو بوونەتە هۆکارێك بۆ وەرگرتنی زانیاری زۆرتر لە بارەی شێوازی تاوانکردنەوە و وەرگرتنی پسپۆڕیی لەگەڵ تێکەڵبوون بە تاوانبارانی ناو بەندیخانەکان.

**جۆرەکانی گەڕانەوە بۆ تاوان:**

لە چەند ڕوویەکی جیاوازەوە گەڕانەوە دابەش دەکرێت بۆ چەند جۆرێکی جیاواز:

**أ - لە ڕووی لێکچوون و هاوشێوەییەوە دەکرێت بە دوو بەشی تایبەت و گشتییەوە:**

١- گەڕانەوەی تایبەتی (یان جۆریی): ئەو جۆرەیە کە تاوانی دووەمەم هاوشێوە و هاوێنەی

---

[1] بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ ئەم سەرچاوانە:
د . محمود نجیب حسنی/سەرچاوەی پێشوو لا ٧٠٧ و پاشتر.
یاسای لوبنانی (م ٢٥٨) و سووری (م ٢٤٨).
د . رەئوف عبید، لا ٧١٥ و پاشتر.
د . محمود محمود مصطفى، بەندی ٤٧١ ـ ٤٧٤ .

ئەو تاوانە بێت کە پێشتر حوکمی کۆتایی لەسەر دراوە، وەك ئەوەی تاوانی پێشتر و تاوانی ئێستا دزیکردن بێت.[1]

٢- گەڕانەوەی گشتی (یان رەها): ئەو جۆرەیە کە هاوشێوەیی و هاووێنەیی تێدا رەچاوناکرێت لە دوو تاوانەکەدا، وەك ئەوەی تاوانبار لە کەسێك بدات و بیکوژێت و جارێکی تریش دزی بکات.

**ب ـ لە رووی کاتەوە دابەش دەکرێت بۆ هەمیشەیی و کاتی:**

١- گەڕانەوەی کاتی: ئەو گەڕانەوەیە کە دەبیّ تاوانی دووەم لە ماوەیەکی دیاریکراودا روویدات و ئەمەش عادەتەن ئەو کاتە دەبێت کە حوکمی یەکەم تاوان بە سزایەکی گەرە نەبووبێت چونکە پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی وەها کە بڵێین سزاکە ئامانجی خۆی نەپێکاوە.

٢- گەڕانەوەی هەمیشەیی (یان بەردەوام): بە پێچەوانەی کاتییەوە ئەو مەرجەی لەگەڵ نییە کە باسکرا، ماوەی نێوانیان هەرچەند بێت لەگەڵ حوکمی کۆتایی تاوانی یەکەمدا سزای تاوانی دووهەمیش توند دەکرێتەوە .

عادەتەن لەم جۆرەدا سزای تاوانی یەکەم گەورەیە بە شێوەیەك کە بۆ ماوەیەکی زۆر کاریگەریی چاکخوازی دەمێنێت و دووەم سزای توند پاساوی دەبێت .

**ج ـ لە رووی دووبارە بوونەوە و نەبوونەوە دابەش دەبێت بۆ: سادە و دووبارەکراوە:**

١ ـ گەڕانەوەی سادە: ئەو جۆرەیە پێش تاوانی دووهەم یەك حوکم بەسەر تاوانباردا درابێت.

٢ ـ گەڕانەوەی دووبارەکراوە: ئەو جۆرەیە کە سزاکانی حوکم چەند دانەیەك بێت و سزاکانیش لە سەر چەند تاوانێکی دیاریکراو بێت و دەبێت ئەو تاوانەی کە تاوانکار کردوویەتی پاش

---

[1] تاوانە سێکسییەکان لە یەکێك لەم بەندانەی داهاتوودا بە هاوشێوە و هاووێنە دادەنرێن بە مەبەستی جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم بەندە:

ا ـ تاوانەکانی دزینی خاوەندارییەتی(الاختلاس) و دزی و فێڵکردن و ناپاکی لە ئەمانەت و داگیرکردنی دارایی و دۆکیومێنت و هەڕەشە و شارینەوەی ئەو شتانەی لەم تاوانانەوە بەرهەم دێت یان گلدانەوەی بە شێوەیەکی نارەوا.

ب ـ تاوانەکانی تۆمەتی ئەخلاقیدانەپاڵ و جنێودان و سووکایەتیکردن و نهێنیئاشکراکردن.

ج ـ ئەو تاوانانەی پەیوەندی بە ئادابی گشتی و رەوشتی جوانەوە هەیە.

د ـ تاوانەکانی کوشتن و ئازاردانی ئەنقەست.

هـ ـ ئەو تاوانە ئەنقەستانەی کەوا یاسا لە یەك دەروازەدا کۆی کردۆتەوە.

ئەو سزایەی وەك حوكمێك بەسەریدا دراوە لە هەمان جۆر بێت.

**سوود و بەرهەمی ئەم دابەشکردنە :**

ئەم دابەشکردنەی لەم دووایییەدا کردمان بەرهەمێکی کرداری هەیە کە پێمان دەڵێت ئەندازەی توندیی سزا بە پێی جۆرەکانی گەڕانەوە دەگۆڕێت، ئەندازەکەی زۆرتر دەبێت ئەگەر گۆڕانەکە لە جۆری دووبارەکراوە بوو وەك لەوەی کە سادە بێت، هەروەها چۆنیەتی توندکردنەوە لە هەردوو جورەکەدا دەگۆڕێت، لە گەڕانەوەی سادەدا یاسادانەر تەنها زیادکردنی ئەوپەڕی تاوان دەخاتەکار کە دادوەر بۆی هەیە پێی بگات لە توندکردنەوەی سزا و دەشتوانێت بگاتە ئەو ئەنجامەش ئەو توندکردنەوەیە بەس نییە لە حاڵەتی گەڕانەوەی بەردەوامدا، ئەوکات ڕێگا بەو حوکمە دەدات بە سزایەکی لە جۆری جیاواز لەو سزایەی کە لە حاڵەتی نەگەڕاوەییدا دەیدا.

بە کورتی یاسادانەر وەها تێدەگات لە گەڕانەوەی سادە کە تاوانبارەکە هیچ ترس و گەڕانەوەیەکی لە سزا ئەسڵییەکە بۆ پەیدا نەبووە، بۆیە.بڕیار لەسەر هەمان سزا دەداتەوە لەگەڵ زۆرکردنی ئەندازەکەی.

بەڵام لە گەڕانەوەی بەردەوامدا نیشانە(قرینە)یەك هەیە لەسەر ئەوەی کە تاوانبار بە شێوەیەکی پیشەیی و بەردەوامی لەگەڵ جۆرێکی تایبەتی تاواندا سەروکارییەیداکردووە و سزای ئەسڵی بەس نیە بۆ تەمێکردنی و سزاکەی دەگۆڕێت بە جۆرێکی تر لە سزا.

**مەرجەکانی ئەو حوکمەی بە پێشینە دادەنرێت لە گەڕانەوەدا :**

بۆ ئەوەی حوکمێکی کۆن لە گەڕانەوەدا بە پێشینە دابنرێت، دبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١ ـ دەبێت حوکمەکە لە دادگایەکی نیشتیمانییەوە دەرچووبێت، کەواتە ئەگەر لە دادگای وڵاتێکی بێگانەوە بوو بە پێشینە دانانرێت.

٢ ـ پێویستە حوکمی سەلماندنی تاوانباری لە دەعولیەکی جەزاییدا لە دادگایەکی ئاساییەوە دەرچووبێت یان لە دادگایەکی هەڵاوێردە(استثناء)وە، کە دەسەڵاتی هەبێت حوکم بدات لە تاوانەکانی یاسای گشتیدا وەك دادگا سەربازییەکان یان دادگاکانی ئاسایشی دەوڵەت.

٣ ـ پێویستە بە سزایەکی جەزایی بێت، کەواتە حسابێك ناکرێت بۆ ئەو ڕێوشوێنگرتنەبەرە ڕاستکەرەوانەی(التدابیر التقویمیة) کە بەرانبەر منداڵان دەگیرێتە بەر.

٤ - پێویستە سزاکە ئەسڵی بێت، کەواتە لە گەڕانەوەدا حساب بۆ سزا تەواوکەرەکان ناکرێت، وەك دەستبەسەرداگرتن.

٥ - پێویست لە تاوانی گەورە یان مامناوەندیدا بێت، کەواتە حساب بۆ ئەو حوکمانە ناکرێت کە بۆ سەرپێچییەکان دەردەچێت.

٦ - پێویستە حوکمی پێشوو بە شێوەیەکی کۆتایی بەڵگەی گومانهەڵنەگری بەدەستهێنابێت، یان بە بەکارهێنانی هەرسێ رێگاکەی تانەلێدان کە بریتین لە بەرهەڵستکاریی(المعارضة) و تێهەڵچوونەوە(الاستئناف) و یەکلاکەرەوە(التمییز ـالنقض) یان بە کاتبەسەرچوونی دیاریکراو بە یاسا.

٧ - پێویستە حوکمە پێشوەکە مابێتەوە و هەڵنەوەشابێتەوە بە لێبوردنی گشتی یان پووچەڵکردنەوەی یاسایی یان دادوەری یان بە دەرچوونی یاسایەکی نوێی وەها کە ئەو کارەی حوکمی پێشووی لەسەر دراوە و بۆتە هۆی ئەوەی سزاکە بکاتە کارێکی رێپێدراو، چونکە لەم حاڵەدا سیفەتی تاوانیی لەسەر کارەکە لادەبات.

٨ - نابێت ئەو سزایەی حوکمی پێ دراوە لە گەڕانەوەدا لە تاوانێکی سیاسی پێشوودا بێت. تاوانی سیاسی ئەو تاوانەیە بە پاڵنەرێکی سیاسی دەکرێت یان بەرانبەر مافگەلێکی گشتی یان تاك دەکرێت.

٩ - ئەو حوکمی سەرکۆنە(ئیدانە)کردنەی لە لێبوردنەکەدا هەیە بە پێشینە دانانرێت لە باروبۆخی گەڕانەوەدا.

بەڵام لێبوردن لە خودی سزاکە چ هەمووی چ هەندێکی نابێتە هۆی ئەوەی کە حوکمە بڕیاردراوەکە بە پێشینە دانەنرێت لە گەڕانەوەدا، چونکە ئەوکاتە کاریگەرییەکەی تەنها کورتهەڵدەهێنرێت لە سەر بەریەستکردنی جێبەجێکردنی بە پێی ئەسڵەکە، هەروەها لە لاچوون و نەمانی سزا بە ماوەبەسەرچوون(التقادم).

## حاڵەتەکانی گەڕانەوە:

دەقی یاساکانی سزا لە وڵاتە عەرەبییەکاندا سێ حاڵەتی گەڕانەوەی دیاریکردووە بە شێوەیەك کە تاوانبار بە گەڕاوە دانانرێت مەگەر لە یەکێك لە حاڵەتاندا بێت:

حاڵەتی یەکەم: بریتییە لە حاڵەتی حوکمدان بە سەر تاوانباردا بە یەکێك لە سزاکانی تاوانە گەورەکان وەك سزای هەمیشەیی یان زیندانی کاتیی. کەواتە گومانلێکراو بە گەڕاوە دانانرێت ئەگەر

حوکمی یەکەم بەندکران بێت یان غەرامە بێت، گەرچی ئەم حوکمە لەسەر ئەسڵی تاوانێك دەرچووبێت کە باروودۆخی سووککەری هەبووبێت.

حاڵەتی دووەم: بریتییە لە حاڵەتی حوکم بە سەر تۆمەتباردا بە بەندکردن بۆ ماوەی ساڵێك و پتر، پاشان تاوانێکی مامناوەند بکات لە ماوەی پێنج ساڵدا لە مێژووی تەواوبوونی سزاکەوە یان لە کاتی لاچوونیەوە بە هۆی تێپەڕبوونی کاتەوە(التقادم).

حاڵەتی سێهەم: بریتییە لە حاڵەتی حوکمدان بەسەر تۆمەتباردا بە بەندکردنی بۆ ماوەی کەمتر لە ساڵێك یان غەرامە، پاشان تاوانێکی مامناوەند بکات هاوشێوە بە تاوانی یەکەم لە ماوەی پێنج ساڵدا لە مێژووی بەسەرچوونی حوکمی یەکەمەوە.

جیاوازی نێوان حاڵەتی دووەم و سێهەم ئەوەیە کە حاڵەتی سێهەم گریمانەی حوکمێکی سووکتر دەکات لە گریمانەی حاڵەتی دووەم، کەواتە ئەوکەسەی کە حوکمی ساڵێك کەمتر یان غەرامەی بەسەردا دراBێت، بە گەڕاوە دادەنرێت بەپێی حاڵەتی سێهەم، لە کاتێکدا ئەم حوکمە بەس نییە تا بە پێی حاڵەتی دووەم بە گەڕاوە دابنرێت.[1]

### کاریگەرییەکانی گەڕانەوە:

ئەگەر توخمەکانی گەڕانەوە هەبوو و بەربەستەکانیش نەبوون ئەوا چەندکاریگەرییەك سەرهەڵدەدات کە یاسا سزاییەکانی وڵاتانی عەرەبی فەرزی دەکات[2]. بەڵام هەروەك پێشتر وتمان

---

[1] تاوانە سێکسییەکان لە یەکێك لەم بەندانەی داهاتوودا بە هاوشێوە و هاووێنە دادەنرێن بە مەبەستی جێبەجێکردنی حوکمەکانی ئەم بەندە:

أ ـ تاوانەکانی دزینی خاوەندارییەتی(الاختلاس) و دزی و فێڵکردن و ناپاکی لە ئەمانەت و دڵگیرکردنی دارایی و دۆکیومێنت و هەڕەشە و شاردنەوەی ئەو شتانەی لەم تاوانانەوە بەرهەم دێت یان گلدانەوەی بە شێوەیەکی نارەوا.

ب ـ تاوانەکانی تۆمەتی ئەخلاقیدانەپاڵ و جنێودان و سووکایەتیکردن و نهێنیئاشکراکردن.

ج ـ ئەو تاوانانەی پەیوەندی بە ئادابی گشتی و رەوشتی جوانەوە هەیە.

د ـ تاوانەکانی کوشتن و ئازاردانی ئەنقەست.

هـ ـ ئەو تاوانە ئەنقەستانەی کەوا یاسا لە یەك دەروازەدا کۆی کردۆتەوە.

[2] لە بارەی بابەتی گەڕانەوە و حوکمەکانی سەیری ئەم دەقە یاساییانەی خوارەوە:

یاسای ئێستای سزاکانی عێراقی هەردوومادەی(١٣٩ ـ ١٤٠)

یاسای سزاکانی مەغریبی، بەندەکانی(١٥٤ ـ ١٦٠)

کاریگەریی هەردوو جۆرەکەی گەڕانەوە(گەڕانەوەی سادە و گەڕانەوەی چەندبارە). خەملاندنی ئەم جیاوازییە ملکەچی دەسەلاتی خەملاندنی دادوەرە، بەلام لە هەموو حالەتەکاندا دەتوانین کاریگەرییەکانی هەردوو جۆری گەڕانەوە بۆ ئەم خالانە بگەڕێنینەوە:

١ ـ توندکردنەوەی سزا تا ئەوئەندازەیەی لە دووئەوەندەی دوالسنووری بڕیار لەسەردراو لە سزا ئەسلییەکەی زیادنەکات و سزاکەش لەو سنووورە تێپەڕ نەکات کە ببێتە سزایەکی هەمیشەیی هەموو تەمەنی سزادراوەکە بگرێتەوە.

٢ ـ دەکرێت کەسی گەڕاوە لە هەندێك تاواندا بخرێتە ژێر چاودێری پۆلیسەوە، وەك تاوانی دزی و فێلکردن. چاودێری پۆلیس دەبێتە سزایەکی تەواوکار و لە نێوان سالێك تا دوو سالدایە.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، توندکردنەوەی سزای کەسی گەڕاوە لە ژێر تیشکی یاساکانی ئێستای سزادانی ولاتە عەرەبییەکاندا تەنها بە دروست(جائز) دانراوە و فەرز نەکراوە، بۆیە دادوەر دەتوانێت سزاکە توند نەکاتەوە و بۆ سزای دووهەم ئەو سزایە بڕیارە سادەیە بدات کە لە بنەڕتدا یاسا بۆ تاوانەکەی داناوە، وەك ئەوەی هیچ جۆرە گەڕانەوەیەك لە ئەرادا نەبێت.

## دووهەم: سروشتی یاسایی باروذۆخی توندکەرەوە لە تاوانی دزیدا:[1]

دزی بریتییە لە بردنی دارایییەکی گواستراوە(منقول)ی کەسێکی تر لە پارلسگەی ـ شوێنی پارلستنی خۆیدا ـ (حرز المثل) بە مەبەستی ئەوەی بیکەیتە هی خۆت. بردنی دارایی کەسانیتر دەکرێت سزای لەسەر بدرێت لە یاسادا و چەندین جۆر سزای تاوانی دووهەم توند دەکرێتەوە و بە پێی ئەو بارودۆخەی بە دەوری تاوانەکەدا هەیە دەگۆڕێت، چونکە دزی سیفەتە تاوانییەکەی

---

یاسای ئێستای سزاکانی میسری، مادەکانی(٤٩ ـ ٥٤)

یاسای ئێستای سزاکانی جەزائیری، مادەکانی (٥٤ ـ ٦٠)

[1] بۆ بابەتی توندکردنەوەی سزای دزی سەیری ئەم سەرچاوە یاساییانە بکە:

التشريع الجنائي في الشريعة الاسلامية والقانون الوضعي/ د . عبدالخالق النواوي/ لا ٢٣٩ و پاشتر.

الاحكام العامة في قانون العقوبات شرح على متون النصوص الجزائية/المحامي محسن ناجي، لا ٥١٠ ء پاشتر.

جرائم الاعتداء على الاشخاص و الاموال/د . ڕەئوف عوبەید، لا ٢٧٥ و پاشتر.

شرح قانون العقوبات العراقي الجديد، د . حميد السعدي، الاعتداو على الاموال، ٢/٢٠١ و پاشتر .

یاسای جەزایی ئوردون (م ٣٩٩) و یاسای جەزایی کوەیتی (م ٢٧٧) و پاشتر.

دەگۆڕێت بە پێی گۆڕانی ئەو بارودۆخەی کە بۆی هەیە سزاکە توندتر بکاتەوە لەبەر ئەو نیشاندانە(دلالة)ی هەیەتی لەسەر مەترسی تاوانبار.

قۆناغەکانی تاوانی دزی بریتییە لە خەیاڵێك کە لە مێشکدا دێت و دەچێت تا لە ئەنجامدا دەگۆڕێت بۆ خواست و بڕیار پاشان بۆقۆناغی ئامادەکردن و ئەنجا بۆ ئامادەبوونی بۆ جێبەجێکردن[1]. پاشان ئامادەکردنی کلیلی دروسکراو یان بەکارهێنانی گوریس و شیشی ئاسن بۆ سەرکەوتن بەسەر دیوارەکاندا، یان بەکارهێنەری ئەمێری شکێنەر بۆ شکاندنی دیواری شورا و پاشان چوونە قۆناغی ئەنجامدانی دزییەکە.

هەندێك جاریش تاوان ئەنجام نادرێت لەبەر چەند هۆیەکی ویستراو یان نەویستراو، بۆیە یاسا تەنها لەبەر بیرکردنەوە دەربارەی تاوان یان خواست و بڕیار سزای کەس نادات، بەڵام یاسا لە سەر دەستپێکردنێکی وەها کە جێبەجێنەکردنی تاوان بە هۆی هۆکاری خۆنەویستەوە بوە سزادەدات[2].

ئەمە لە یاسادا، بەڵام لە شەریعەتی ئیسلامیدا دزی بە تاوانەکانی سزادیاریکراوەکان ـ الحدود ـ دادەنرێت، وە لە تایبەتمەندی و سیفەتەکانی ئەم تاوانانە ئەوەیە کە سزاکانی ناکەونە ژێر کاریگەری بارودۆخی سووککەر یان بارودۆخی توندکەرەوە، بەڵکو ئەگەر پایە و مەرجەکانی هاتە دی و بەربەستەکان لە ئارادا نەبوون، ئەوا ئەو سزادیاریکراوە بەوشێوەیەی لە قورئاندا هاتووە جێبەجێ دەکرێت وەك دەفەرمێت﴿ والسارق والسارقة فاقطعوا ايديهما جزاءا بما كسبا نكالا من الله﴾ المائده/ ٣٨.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە بارودۆخی توندکەرەوە دوو جۆرە: ماددی(عەینی) و کەسیی.

بارودۆخی مادیش شوێنەکان دەگرێتەوە، وەك شوێنی نیشتەجێبوون و پاشکۆکانی، یان شوێنی خواپەرستی، یان شوێنێکی شورادار کە دزییەکە شکاندنی شتێك یان بە سەرکەوتن بەسەر شوراکەدا بێت یان بە دروستکردنی کلیلی ساختە یان بە شکاندنی مۆری دلخستن یان بە فرەیی تاوانکەران یان بە هەڵگرتنی چەك.

هەروەها بارودۆخی مادی کاتەکانیش دەگرێتەوە، وەك دزیکردنی شەو.

وە ئەم بارودۆخانە بە سیفەتێکی شوێنکەوتە دادەنرێن بۆ تاوان و دەبێتە بەشێك لە پێکهاتەی

---

[1] هەموو تاوانەکان لەم قۆناغانەدا هاوبەشن.

[2] د. حميد السعدي، سەرچاوەی پێشو ١٧٦/٢ و پاشتر.

مادی تاوان و حوکمی دزی بەسەر هەموو ئەوکەسانەدا جێبەجێدەبێت کە تێیدا بەشداربوون.

وا بە کورتی ئەو بارودۆخانە باس دەکەین کە لەگەڵ تاوانی دزیدا سەرهەڵدەدەن:

أ ـ ئەو بارودۆخە توندکەرەوانەی پەیوەندی بە شوێنی دزییەوە هەیە:

یاسادانەری یاسا جەزاییەکان گرنگی داوە بە توندکردنەوەی سزا لەو دزیانەی لەم دۆخانەدا دەکرێن:

١– شوێنی نیشتەجێبوون یان ئامادەکراو بۆ نیشتەجێبوون گەرچی کەسیشی تێدا نەبێت یان لە یەکێك لە پاشکۆکانی ئەو شوێنەدا. وە فەلسەفەی ئەم توندکردنەوە بریتییە لە شکاندنی حورمەتی ماڵ و تێکدانی ئەو ئارامییەیە کە پێویستە هەبێت لە نێو دانیشتووانی ئەم شوێنانەدا، جگە لە دروستکردنی پەشۆکاندن و دەستدرێژی و چاوسوورکردنەوە لە کەسانی دانیشتووی ئەم شوێنانە.

٢– ئەو شوێنەی دیوار یان پەرژینی بۆ کرابێت.

٣ – بانك یان دووکان یان کۆگا یان شوێنی پاراستنی کەلوپەل.

٤– شوێنی ئامادەکراو بۆ خواپەرستی یان وێستگەی شەمەندەفەر یان بەندەر یان فرۆکەخانە.

٥– رێگای گشتی لە دەرەوەی شار و شارۆچکەکان، یان لە ناو شەمەندەفەردا، فەلسەفەی توندکردنەوەی سزا ئەوەیە کە لەم شوێنانەدا پاسەوان یان فریاکەوتنیان تێدا نییە.

٦– قۆستنەوەی هەلی رووداني جەنگ، پشێوی، ناکۆکی نێو خەڵك، ئاگرکەوتنەوە یان نوقمبوونی کەشتی و شتی لە بابەتە. ئەم حاڵەتانە نیشانەی ئەو حاڵەتە قورسە دەروونی و ترسناکییەیە کە هاوکاتە لەگەڵ دزییەکەدا.

ب ـ ئەو بارودۆخە توندکەرەوانەی کە لە کاتی دزیکردنەکەدایە:

دیارە کە یاسادانەر لە یاسا جەزاییەکاندا ئەم دۆخانەی لە حاڵەتی دزیدا بە ماوەی نێوان ئاوابوونی خۆر و هەڵهاتنی خۆر داناوە.[1]

---

[1] مادەی (٤٤٠) لە یاسای ئێستای سزادانی عێراقی.

بڕیاری ئەنجومەنی هەڵوەشاوەی رابەرایەتی شۆڕش بە بەرزکردنەوەی توندکردنەوە بۆ لە سێدارەدان لە ١٩٨٠/١٠/٣٠ و پاشان بۆ دەستی راست برین لە مەچەکدا وقاچی راست برین لە قوله پێدا لە حاڵەتی.

وە ئەوەی لەم یاسایانەدا تێبینی دەکرێت شەوی فەلەکی(کە نێوانی ئاوابوون و هەڵهاتنی خۆرە) دانراوە بە بارودۆخی توندکەرەوە بۆ سزای دزیکردن، ئەوەیە کە پێچەوانەیە لەگەڵ فەلسەفەی توندکردنەوەی سزادا کە برتییە لەوەی کە دزیلێکراوەکە لە حاڵەتی سامی تاریکایی شەودایە، چونکە دزی کەمێك پێش گزنگ یان کەمێك پاش خۆرئاوا بە بیست خولەك هەروەك دزیکردن وەهایە لە رۆژدا، لەبەر نەبوونی تاریکی و ترس لەم دووکاتەدا، بۆیە پێویست بوو لەسەر یاسادانەر تاریکی شەو بکاتە بارودۆخی توندکەرەوە لە بریتی خودی شەوی فەلەکی، واتە کاتی شەو لەگەڵ هاتنی تاریکیدا تا نەمانی ئاسۆی پاش خۆرئاوا و کۆتاییەکەشی بە دەرکەوتنی رووناکی بەریەیان دێت.

ج ـ ئەو بارودۆخە تونکراوانەی پەیوەندیان بە فرەبکەرییەوە هەیە لە دزیدا:

حیکمەتی توندکردنەوەی سزا لەم حاڵەتەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کۆمەڵێك کەس پێکەوە کۆدەبنەوە تا تاوانێك بکەن و سەرگرتنی تاوانەکە مسەوگەر بکەن، چونکە فرەبوونی تاوانکارەکان هێزیان پتر دەکات و خولستیان بەهێزتر دەکات بۆ جێبەجێکردنی تاوانەکەیان و شکاندنی یاسا، جگە لەوەی کە فرەیی دزەکان ترس دەخاتە دڵی دزیلێکراوەوە و هەست دەکات کە ناتوانێت بەرگری و پارێزگاری لە خۆی بکات.

**د ـ ئەو بارودۆخە تونکراوانەی پەیوەندیان بە هۆکاری دزیکردنەکەوە هەیە:**

فەلسەفەی توندکردنەوە لێرەدا ئەوەیە کە ئەو هۆکارانەی تاوانباران بەکاریدەهێنن لە کاتی دزییەکەدا رۆڵێکی گەورەی هەیە لە دروستکردنی تۆقاندن و دەستەوسانکردنی بەرگریدا.

لەو هۆکارانەش: زۆرلێکردن و بەکارهێنانی توندوتیژی و هەڵگرتنی چەك و بەکارهێنانی شێوازی دەرگاشکاندن و سەرکەوتن بەسەر دیواردا و بەکارهێنانی کلیلی کۆپیکراو یان خۆت بگۆڕیت بە کەسێکی تر و هۆکاری تری لەم جۆرە.

کاردروستی و حیکمەت لەم توندکردنەوەی سزایەدا لە سەر تاوانی دزی ئەوەیە کە لەم حاڵەتانەدا ترسناکییەکی زۆرتر هەیە وەك لە دزیی ئاساییدا، بۆیە دەبێتە هۆی ئەم توندکردنەوەیە.

**هـ ـ ئەو بارودۆخە تونکراوانەی لە سیفەتێکی تایبەتی تاوانکارەوە سەرچاوەدەگرێت:**

١ ـ لەو بارودۆخانەی پەیوەندی بە سیفەتی تایبەتی تاوانبارەوە هەیە: تاوانبارەکە بەکرێ خزمەتکاربێت لای دزیلێکراوەکە. خزمەتکاریش ئەم کەسانە دەگرێتەوە (خزمەتکاری

ئافرەت لە مالان، پەروەردەکاری منداڵ، چێشتلێنەر و شۆفێر، جووتیاری تایبەت، وە پاسەوان و هەرشتێکیش لەم بابەتانە بێت).

فەلسەفەی توندکردنەوەی سزا لێرەدا ئەوەیە کە ئەم سیفەتە رێگا بەو کەسانە دەدات تا بەردەوام هاتووچووی کەسی خزمەتکرلو بکەن ، دلرلییەکەشی لەبەردەستیاندا بێت، چونکە برولبوونی کەسی دزلێکرلو پێیان دەبێتە هۆی ئەوەی رێوشوێنی مەبادلی دژی دزی نەگرێتە بەر.

٢ ـ یان تاولنکار کرێکار یان پیشەگەر یان هەرشتێکی لەم چەشنە بێت کە لە دووکانە بازرگانییەکاندا کار دەکەن و کاری نووسین و ژمێریاری و بازرگانی و ئیدلری دەکەن.

وە فەلسەفەی توندکردنەوەی سزا لەسەر ئەمانەش لە سەر دوو بناغەیە:

یەکەم: بە جێگەی باوەڕ و پشتبەستن دلنرلون لای دزلێکرلو.

دووەم: ئاسانبوونی تاولنی دزی بۆیان، لەبەر ئەوەی سامانە دزرلوەکەیان لیٚ دیار و روونە یان لەبەردەستیاندایە.

٣ ـ یان کارمەند بێت یان ئەرکێکی گشتی پیٚ سسپێررلبێت لە فەرمانگە فەرمی و شێوە فەرمییەکاندا. بنەمای ئەم توندکردنەوەیەی سزا لەم بارودۆخەدا گەر بەدیهات، ئەوەیە کە دزی تاولنکار ئەرکی خزمەتگوزاریەکی گشتی پیٚ سپێررلوە لە کاتی بەجێهێنانی کارەکەیدا و بەناوی بەرژەوەندی گشتییەوە کاردەکات و ئەو تاولنەکردلرەی رسولکردنی شەرەفی ئەرکەکەیەتی ناشیرینکردنی ناوبانگی ئەو فەرمانگەیە کە ئەو کارمەندە کاری تێدا دەکات.

٤ ـ یان دزەکە ئەندامێکی هێزە چەکدلرەکانی سوپا یان پۆلیس یان ئاسایش یان پاسەوانی شەو بێت. فەلسەفەی توندکردنەوەی سزا لەم بارودۆخەدا بریتییە لە ناپاکی کردن لەو ئەمانەتدلرییەی کە لە ئەرکپارێزیدا هەیە، هەروەها دزیکردن لەم حاڵەتەدا دزیکردنە لە سامانی گشتی و دەستدرێژیکردنە سەر سامانی گشتیش زۆر ترسناکترە لە دەستدرێژیکردنە سەر دلرلیی تایبەتی، هەروەها ئەوکەسەی لەناو هێزە چەکدلرەکاندایە پێگەی فەرمی خۆی بەکاردەهێنێت بۆ ئەنجامدانی ئەم تاولنە.

**و- سیفەتە تایبەتییەکانی تاوانبەسەرداکراو لە نموونەی:**

١ - بریندارانی جەنگ: یاسا جەزاییەکان سزای توندکردنەوەیان هەیە بۆ ئەو دزییەی لە دارایی بریندارانی جەنگ دەکرێت. فەلسەفەی ئەم توندکردنەوەیە ئەوەیە ئەو کەسانە ناتوانن پارێزگاری لە خۆیان بکەن و تاوانکار باروبۆخی خراپی تەندروستی ئەوان دەقۆزێتەوە بۆ دزیکردن.

٢ - دزینی دارایی نەخۆش و پەککەوتەکان: یاسا هەمان حاڵەتی بریندارانی جەنگ دەداتە نەخۆش و پەککەوتەکان لەبەر هەمان هۆکار کە لەوێدا باسکرا.

**ز- سیفەتی دارایی دزراو:**

یاسای جەزایی پێداگیری دەکات لە سەر پاراستنی سامانی دەوڵەت و ئەو کۆمپانیایانەی دەوڵەت هاوکارە لە سەرمایەکەیاندا و لێرەوە توندکردنەوە.دەکرێت لە سزای دەستدرێژیکردنە سەر ئەو سامانانە، چونکە سوودی ئەم سامانانە بۆ کۆمەڵگەیە و بۆ سووی گشتی بەکاردەهێنرێت[1]

## باسگەی چوارەم:
## باروودۆخە بەخشەرەکان(بەربەستەکان) لە سزا

پێشتر لە بەندەکانی یەکەم و دووەم لە دەروازەی دووەمدا باسی باروبۆخە کاریگەرەکانی سەر پایەی شەرعی و مەعنەویمان کرد و روونمانکردەوە کە ئەو شتەی کاردەکاتە سەر پایەی شەرعی کردارەکە لە سیفەتی تاوانەوە دەگۆڕێت بۆ رەوادراو(ئیباحە)، ئەو شتەش کاردەکاتە سەر پایەی مەعنەوی دەبێتە هۆی لابردنی بەرپرسیاریەتی جەزایی، وە هەرشتێك ببێتە هۆی رێپێدان یان بەربەستی بەرپرسیاریەتی سزایی دەبێتە بەخشەر(مانع)لە سزا، چونکە پەیوەندی لۆجیکی نێوانیان لەگەڵ بەربەستی سزادا بریتییە لە گشتگیری و تایبەتبوونی رەها (العموم و الخصوص المطلق) کەواتە هەرکات یەکێك لە کارتێکەران هەبوو بەربەستی سزاش دەبێت.

[1] د . حمید السعدی، سەرچاوەی پێشوو ٢٠٦/٢ و پاشتر.

لەسەر بناغەی ئەم پەیوەندییە لۆجیکییە، تەنها ئەوەندە بەسە کە لە دوو بەندەکەی پێشوودا دەربارەی هۆکانی بەرەوادنان و بەربەستەکانی بەرپرسیاریەتی جەزایی باسمان کرد.

وا لەم باسگەدا زانیاری پتر پێشکەش دەکەین، کە بریتییە لەو بەربەستای کە تەنها دێنە پێش سزاو بەس بە بێ ئەوەی هۆیەك بێت لە هۆکانی بەرەوادنان یان بەربەستێك بێت لە بەربەستەکانی بەرپرسیاریەتی جەزایی.

هەندێك لەو بەربەستانەش ئەمانەن:

**یەکەم: بارودۆخی هەوالگەیاندن:**

هەوالگەیاندن دەربارەی هەبوونی رێککەوتنێکی تاوانکارانە لە لایەن بەشداربووانەوە لەم رێکەوتنەدا، پێش ئەنجامدانی تاوانەکە و پێش ئەوەی دەسەلاتی گشتی گەران و لێکۆڵینەوە دەستپێبکات لە سەر ئەو تاوانبارانەی رێکەوتوون لە سەر ئەنجامدانی تاوانی گەورە یان مامناوەند.

زۆربەی یاساکانی سزادان باسی ئەم بەربەستە بەخشەرە لە سزا دەکەن. وەك یاسای ئێستای سزادانی عێراقی کە لە مادەی (٥٩) دا دەڵێت: (هەرکەسێك دەستپێشخەری بکات بە گەیاندنی هەواڵ بە دەسەلاتی گشتی کە رێکەوتنێکی تاوانکارانە هەیە و هەروەها دەربارەی بەشداربووان تێیدا، پێش روودانی هیچیەك لەو تاوانانەی رێکەوتنی لەسەر کراوە و پێش دەستپێکردنی گەران و لێکۆڵینەوەی دەسەلاتی گشتی دەربارەی ئەو تاوانبارانە، دەبەخشرێت لەو سزایانەی لە مادەکانی(٥٦ - ٥٧ - ٥٨) بریاری لەسەر دراوە. بەلام ئەگەر ئەو هەوالگەیاندنە پاش دەستپێکردنی گەران و لێکۆڵینەوەی دەسەلاتی گشتی بوو، ئەوا ئەو هەوالگەیاندنە نابێتە هۆی بەخشین لە سزا، مەگەر هەوالگەیاندنەکە کارئاسانی کردبێت بۆ دەسگیرکردنی تاوانبارەکان).

لەم مادەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە دوو مەرج هەیە بۆ ئەم جۆرە لێبوردنە:

**یەکەم:** هەوالگەیاندن دەربارەی هەبوونی رێکەوتنێکی تاوانکارانە و بەشداربووان تێیدا، بە مەرجێك هەواڵەکە هەموو وردەکارییەکانی ئەو رێکەوتنەی تێدابێت کە هەوالدەر ئاگاداری بووە.

**دووەم:** دەبێت هەواڵەکە پێش دەستپێکردنی گەران و لێکۆڵینەوەی دەسەلاتی گشتی بێت.

فەلسەفەی لێبوردن لە سزای تاوانبار بەدیهێنانی دوو ئامانجە:

١ ـ هەڵنانی تاوانبار لە سەر گەرانەوە لەو تاوانەی دەستی پێکردووە.

٢ ـ بەخشین و لێبوردن دەبێتە هۆی دەرخستنی ئەو رێکەوتنە و ئەندامەکانی و ئەوانەی

هەوڵی دروستکردنیاندلوە و لە ئەنجامدا سزای دادگەرانەی خۆیان وەردەگرن.

**دووەم: بارودۆخی ئازادکردنی مەرجدار:**[1]

بریتییە لە ئازادکردنی کەسی زیندانیکراو پێش تەواو بوونی ئەو ماوە زیندانییەی وەك سزا بە سەریدا دراوە. مەبەستیش لە وشەی (مەرجدار)ئەوەیە کە کەسی ئازادکراو دەبێ لەو ماوەی زیندانییەی کە ماوەتی خاوەنی رەوشتی باش بێت، وەگەر نا دەگەڕێنرێتەوە بۆ زیندان بۆ تەواوکردنی ماوەکەی.

فەلسەفەی ئەم سیستەمە ئەوەیە کە زیندانییەکان هەڵبنێت بۆ رەوشتی جوان لە کاتی جێبەجێکردنی سزادا و قۆناغدارکردنی کەسی ئازادکراو بەوەی کە پاش ئازادکردنی بخرێتە ناو سیستەمێك لە ئازادیی رەها.

بۆ ئەوەی بارودۆخی ئازادکردن ببێتە کارایەکی کاریگەر ئەم مەرجانەی پێویستە:

أ - پێویستە هەڵسوکەوتکردن لەکاتی زیندانیبوونیدا ئەو بڕوایە ببەخشێت کە خۆی راستدەکاتەوە.

ب - دەبێت هەموو لە ئەستۆگرتنە داراییەکانی جێبەجێ کردبێت کە لە سەریەتی.

ج - نابێ ئازادکردنی مەترسیەك دروست بکات بۆ سەر ئاسایشی گشتی.[2]

ئاشکرایە کە بارودۆخی ئازادکردن ئەگەر مەرجەکانی تێدا بەدیهات دەبێتە هۆی بەخشینی تاوانبار لەو ماوەیەی سزا کە لە سەری ماوە و دەبێتە بەرگرێك لەبەردەم بەردەوامبوونی زیندانییەکەی.

**سێیەم: بارودۆخی وەستاندنی سزا:**

وەستاندنی جێبەجێکردنی سزا هۆیەکە بۆ بەخشینی سزای سەر تاوانبار لەگەڵ بوونی مەرجە یاساییەکان، کە ئەمانەی خوارەوەیە:

أ - پێویستە ئەو تاوانە گەورە یان مامناوەند بێت، کەواتە سزای ئەو تاوانە ناوەستێنرێت کە

---

[1] یاسای سزادانی مەغریبی بەندی (٥٩)

د . محمود نجیب حسنی، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٤١ و پاشتر، بەندی ٧٩٣.

[2] د . محمود محمود مصطفى - سەرچاوەی پێشوو لا ٥٨٣.

سەرپێچی(تاوانی بچوك) بێت، چونكە زۆربەی سەرپێچییەكان سزای غەرامەی لە سەرە و ناتوانرێت سیستەمی لابردنی سزا جێبەجێ بكرێت.

ب ـ نابێ تاوانەكە لەكەدارکردنی شەرەفی تێدا بێت بە شێوەیەك بوبێتە نیشانەی رەوشتنزمی تاوانكاران، چونكە فەلسەفەی وەستاندنی سزا رەچاوكردنی رابوردووی بكەرەكەیە و پێشبینی نەگەڕانەوەی تاوانكارە بۆ تاوانی نوێ. وە پێویستە ئەم مەرجە بە گرنگ رەچاو بكرێت سەرەڕای رەهایی ئەو دەقە لە بارەی وەستاندنی سزاكەوە [1].

ج ـ پێویستە سزاكە لێسەندنەوەی ئازادی بێت(زیندان و بەندكردن)كەواتە ئەگەر سزاكە غەرامە بوو دروست نییە بوەستێنرێت.

د ـ دەبێت ئەو سزایەی كە دراوە بەندكردنێك بێت پتر لە ساڵێك نەبێت.

هـ ـ نابێت تاوانكار پێشتر فەرمانی سزای تاوانێكی بەئەنقەستی لە سەر بێت.

لە یەكێك لەم حاڵەتانەدا بڕیاری وەستاندنی جێبەجێكرنەكە هەڵدەوەشێتەوە و بەربەستەكە لادەبرێت و قەدەغەكراوەكە دەگەڕێتەوە:

١ ـ ئەگەر حوكمدراوەكە نكولی كرد لە جێبەجێكردنی مەرجەكانی وەستاندنی سزاكە، وەك ئەوەی لە ماوەی وەستاندنی سزاكەدا پەیمانی جوانكردنی رەوشتی نەبردە سەر یان ئەو بژاردنەی كە لە سەریەتی ، هەمووی یان هەندێكی جێبەجێ نەكرد.

٢ ـ ئەگەر لە ماوەی تاقیكردنەوەكەیدا (سێ ساڵ) تاوانێكی گەورە یان ناوەنجی ئەنقەستی وەهای كرد كە سێ مانگ پتر حوكم بدرێت. بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا سەرپێچی(تاوانی بچوك)ی ئەنجامدا وەستانی سزاكە هەڵناوەشێنرێتەوە.

٣ ـ ئەگەر لە ماوەی تاقیكردنەوەكەدا دەركەوت كە تاوانێكی گەورە یان ناوەنجی ئەنقەستی ئەنجام داوە و دادگاش لە كاتی بڕیاردانی وەستانی سزاكەدا پێی نەزانیوە.

**مەرجەكانی هەڵوەشاندنەوەی وەستاندنی جێبەجێكردنی سزا :**

أ ـ پێویستە وەستاندنی جێبەجێكردنی سزا حوكمی كۆتایی بێت و گەشتبێت بە پلەی یەكلاكراوە(قەتعی)، ئەگەر حوكمەكە بەرایی بوو بە حوكمی تێهەڵچوونەوە(دادگای

---

[1] سەرچاوە پێشووەكان.

تەمین) تانەی لێنەدرابوو و ماوەی تێهەڵچوونەوەکەشی بەسەردا تێپەڕنەبوویوو یان بە تێهەڵچوونەوە تانەی لێدرابوو بەڵام دادگای تێهەڵچوونەوە یەکلایی نەکردبووەوە، ئەوا نابێت وەستاندنی سزاکە بەو پێیە بێت.

ب ـ پێویستە دادگا لە ماوەی ئەزموونیەکەدا کە(سێ ساڵ)ە بە حوکمە پێشووەکە بزانێت لە مێژووی وەستاندنی جێبەجێکردنەکەوە، کەواتە ئەگەر پاش کۆتاییهاتنی ئەو ماوەیە پێی زانی ئەوا دەست نادات لە وەستاندنی جێبەجێکردنی سزاکە.

ج ـ پێویستە هەڵوەشاندنەوەی وەستاندنەکە لە سەر داوای داواکاریی گشتی (الادعاء العام)بێت و داوای تاوانکار هیچ نرخێکی نییە.

فەلسەفەی ئەم مەرجەش ئەوەیە جێبەجێکردنی سزا و وەستاندنی مافی تاوانلێکراو یان کەسی زیانلێکەوتوو لە ئەنجامی تاوانەکە نین، بەڵکو مافی دەستەی کۆمەڵایەتییە.[1]

### چوارەم: بارودۆخی هەواڵگەیاندن دەربارەی ئەو تاوانانەی زیان بە ئاسایشی ناوخۆی دەوڵەت دەگەیەنێت:

بارودۆخی ئەو هەواڵگەیاندنەی کاردەکاتە سەر تاوان و دەبێتە هۆی لێبوردن لە تاوانکاری بەشدار لە رێککەوتنێکی تاوانکارانە یان گرووپی چەتە یان رێکخراو یان دەستە یان ئەو لقانەی لە یاسادا لە بەشی ئەو تاوانانەی کە زیان بە ئاسایشی دەوڵەت دەگەیەنن دانراون و سەرۆکایەتی یان فەرمانبەری تێدا نەبووبێت و لەگەڵ یەکەمین ئاگادارکردنەوەی دەسەڵاتی فەرمیدا لێیان جیابووبێتەوە.[2]

هەروەها لەو هەواڵگەیاندنە بەخشەرانە لە سزا، هەواڵدانە بە دەسەڵاتی گشتی دەربارەی ئەو تاوانانەی زیان بە ئاسایشی دەوڵەت دەگەیەنێت پێش دەستپێکردن بە جێبەجێکردنی سزا و پێش دەستپێکردنی لێکۆڵینەوە.

---

[1] سەرنجی یاسای ئێستای سزادانی عێراقی بکە، مادەکانی(١٤٤ ـ ١٤٩).
[2] یاسای ئێستای سزادانی عێراقی مادەی(٢١٧).

وە دادگا بۆی هەیە سزا ببەخشێت ئەگەر هەواڵدانەکە پاش جێبەجێکردنی تاوانەکە و پێش دەسپێکردنی لێکۆڵینەوەکە بوو، ئەمەش کاتێك رەوایە کەوا هەواڵدەرەکە ئاسانکاری بکات بۆ دەسەڵاتداران لە کاتی لێکۆڵینەوەدا بۆ دەستگیرکردنی تاوانکارانی تری تاوانەکە.[1]

**پێنجەم: بارودۆخی هەواڵدان دەربارەی کەسی فڕێنراو:**

ئەو تاوانبارەی لە تاوانی فڕاندنی خەڵکی و گرتنیان و دەسبەسەرگرتنیاندا بەشدار بووە لە سزادان دەبەخشرێت ئەگەر هەواڵ و زانیاری بە دەسەڵاتی گشتی بدات دەربارەی شوێنی فڕێنراوەکان پێش دۆزینەوەیان و رێنومایی.[2]

**شەشەم: بارودۆخی مردن کاریگەری لەسەر سزا دەبێت لە رووی بەخشینی سزاوە:**

ئەگەر کەسی سزادراو پێش تەواو بوونی حوکمەکەی مرد، تاوانەکە هەڵدەوەشێتەوە و دەعوای جەزایی و سزا نامێنێت و هەموو ئەنجامێکی حوکمەکە هەڵدەوەشێتەوە، چونکە مردن دەبێتە هۆی نەهێشتنی کەسی یاسایی مردووەکە، هەروەها تاوان و سزا دووکەسایەتین ناگوێزرێنەوە بۆ میراتگرەکانی تاوانبار لەسەر بناغەی(ولا تزر وازرة وزر اخرى)، چ مردنەکە پێش شکاتکردن بوو بێت یان پاش، پێش دەرچوونی حوکم بێت یان پاشی و لە پێش گەشتنی بە کۆتایی . بەڵام ئەوکەسەی لە ئەنجامی تاوانەکەوە زیانی پێگەشتووە دەتوانێت داوایەکی مەدەنی لە لای دادگای مەدەنی تایبەت تۆمار بکات چونکە ئەم داوایە بە مردن هەڵناوەشێتەوە و مافی داواکاری دارایی(المدعي المالي) پەیوەست دەبێت بە میراتیی مردووەکەوە پاش مردن . بەڵام ئەگەر حوکمدراوەکە پاش تێپەڕبوونی حوکمەکەی و گەشتنی بە پلەی قەتعی مرد ئەوا تەنها سزاداراییەکان هەڵدەوەشێتەوە چ سەرەکی بێت چ شوێنکەوتەیی یان تەواوکار. بەڵام رای پەسەندتر لە فیقهی جینائیدا کە یاسادانەری عێراقی و میسری قبووڵیانکردووە[3] بریتی یە لە هەڵاوێردنی ئەو سزادارییانەی کەوا گەشتوونەتە پلەی یەکلابوونەوە لە هەڵوەشانەوەدا وەك غەرامە و گەڕاندنەوە.

---

[1] یاسای ئێستای سزادانی عێراقی مادەی(٢١٨).

[2] یاسای ئێستای سزادانی عێراقی مادەی(٢/٤٢٦).

[3] سزای ئێستای سزادانی عێراقی(م ١٥٢)

هەروەها ڕێوشوێنی مەبادیی دارایی(التدابیر الاحترازیة المالیة) لە هەڵوەشاندنەوە جیاکراوەتەوە، وەك دەستبەسەردا گرتن و داخستنی دوکان، ئەم سزا داراییانە لە میراتی مردووەکە دەردەکرێت بە ئاگاداری میراتگرەکانی.

وە فەلسەفەی ئەم هەڵاوێردنانەی باسکران ئەوەیە گەڕاندنەوەی شتێك لە جێگای تاوان بە حوکمی یاسا پێویستە، چ حوکمی تاوانبارکردن درابێت یان نا، هەمان حاڵەت بۆ ڕێوشوێنی مەبادیی دارایی ئارادایە.

بەڵام لە غەرامەدا بابەتەکە راجیایی تێدایە و رای پەسەندکراو لە فیقهی جینائیدا وەك باسمانکرد ئەوەیە کە پاش حوکمی کۆتایی لە سەری، دەبێتە قەرز و بە مردنی دەگوێزرێتەوە بۆ میراتییەکەی.[1]

## حەوتەم: کاریگەریی باردۆخی لێبوردنی گشتی لە سزادا:

لێبوردنی گشتی بە یاسا دەردەچێت و لە ئەنجامدا دوای یاسایی کۆتایی پێ دێت و ئەو حوکمەی تاوانباری پێ مەحکووم کراوە نامێنێت. هەوەها هەموو سزا سەرەکی و شوێنکەوتەیی و تەواوکەرێك و هەموو ڕێوشوێنێکی مەبادیی . بەڵام کاریگەرییەکی گەڕاوەی(رجعی) نییە، کەواتە کارناکاتە ئەو سزایانەی پێشتر جێبەجێ کراوە مادام یاسای لێبوردنەکە بە پێچەوانەی ئەمانەوە شتێك نەڵێت .

ئەگەر لێبوردنەکە تەنها بەشێکی لە سزای بڕیاردراوی گرتەوە، ئەوا بە حوکمی لێبوردنی تایبەتی سەیر دەکرێت و حوکمەکانی ئەوی بەسەردا دەدرێت. وە لێبوردن ماف کەسیی(الحقوق الشخصیة) کەسانی تر ناگرێتەوە، شوێنەوارەکانیشی لێبوردنی گشتی هەندێکی جەزاییە و هەندێکی مەدەنییە و هەندێکیشی تەمبێکارە:

---

[1] الاحکام العامه فی قانون العقوبات، شرح علی متون النصوص الجزائیه، محسن ناجی . سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٥٦.

**١-شوێنەوارە جەزاییەکان:**

أ - هەڵوەشاندنەوەی تاوانبارکران ئەگەر حوکمی دادگا درا بوو لە دەعوای جەزاییدا و ئازادکردنی سزادراو ئەگەر لە زینداندا بوو، هەروەها پێش حوکم هەموو ڕێوشوێنێکی دادوەری دەوەستێنرێت کە بەرانبەر تاوانبار گیراوەتە بەر.

ب - هەموو سزا سەرەکی و شوێنکەوتەیی و تەواوکەرەکان و ڕێوشوێنی مەبادیی هەڵدەوەشێتەوە جگە لەوانەی سروشتەیاساییەکەیان ڕێگە نادات بە گەڕانەوە تیایاندا.

ج - ئەو حوکمی تاوانبارکرانەی لێبوردنەکە دەیگرێتەوە بە پێشینەیەک دانانرێت بۆ بارودۆخی گەڕانەوە.

د - هەموو ئەو مافانەی کە بە هۆی حوکمدرانەوە لە سزادراو وەرگیرابوو بۆی دەگەڕێنرێتەوە .

**٢-شوێنەوارە مەدەنییەکان:**

لێبوردنی گشتی کارناکاتە سەر مافە کەسییەکانی کەسی تر و ئەم ئەنجامانەی هەیە:

أ - هەڵوەشاندنەوەی داوای مافی گشتی بە لێبوردنی گشتی کە پەیوەندی بە مافی کەسیی کەسەکانەوە نییە لەوانەی تووشی زیان بوون  بە هۆی تاوانەکەوە، بۆیە زیانلێکەوتوو مافی ئەوەی هەیە لە دادگا مەدەنییەکاندا داوای ئەو ئەندازە پارەیەی خۆی بکات کە دەکەوێتە سەر تاوانباری لێبووردراو.

ب - ئەگەر لە داوای جەزاییدا بڕیاردرا لە سەر ئەو مافە کەسییانەی لە تاوانەکەوە سەریهەڵداوە، ئەوا لێبوردنی گشتی نایگرێتەوە، ئەوکەسە زیانلێکەوتووەی دادگا بە قازانجی ئەو حوکمی دەرکردووە دەتوانێت مافی خۆی لە سامانی ئەو کەسە وەریگرێتەوە کە لێبوردن گرتوویەتەوە و لێبووردراویش ناتوانێت نارەزایی دەربڕێت و لێبوردنی گشتی بکات بە بیانوو.

**٣-شوێنەوارە تەمبیکەرەکان:**

لە ڕووی تەمبێکردنەوە ئەم شوێنەوارانە لە لێبووردنی گشتییەوە پەیدا دەبێت:

أ - ئەگەر حوکمدراو کارمەند بوو لە فەرمانگەیەکی حکومەتدا چ فەرمی بێت یان نافەرمی، یان سەر بە تایەفەیەکی ئاینی یان سەندیکایەک بوو یان هەر شتێکی لەو بابەتە و دەسەڵاتی

تـەمێکردن لەومافانـەی بێبەشـی کردبـوو، ئـەوا بـە بـێ هـیچ بڕیـارێکی نـوێی دەسـەڵاتی تەمبێکار بە شێوەیەکی ئاسایی دەگەڕێتەوە سەر جێگای خۆی.

ب ـ ئەگەر بڕیاری دەسـەڵاتی تەمبێکـەر لـە سـەر هـەمان ئـەو بەڵگەوتانـە بـونیاد نەنرابـوو کـە حـوکمە جەزاییەکەی لەسەر بونیاد نرابوو، ئەوا بڕیارەکەی بـۆ خـۆی جێبـەجێ دەکرێـت، چونکە داوای جەزایی و داوای تەمبێکەر لێکجودان.[1]

## هەشتەم: باروودۆخی گەردنئازادکردن و ڕێکەوتن(سوڵح):

گەردنازادی بریتیە لە وازهێنانی تاوانلێکراو لە مافی خۆی بە سەر تاوانکەرەوە لەو شـوێنەوارانەی لە تاوانەکەیەوە پەیدا دەبێت. ئەمەش تەنها لـەو تاوانانـەدا دەبێـت کـە ڕێکـەوتن قبـوڵ دەکـەن، کەواتـە گـەردنئازادی تاوانبەسـەرداکراو لـەو ڕووەوە کـە هۆکـارە یـان بـاروبۆخێکی کاریگـەرە و بەرەبستە لە سزا، دروست نییە، مەگەر تەنها لەو تاوانانەدا کە بـە مەرجـە یاسـاییەکانی ڕێکـەوتنی تێدا دروستە. ئەم تاوانانە جـوولاندنی داوای جـەزایی تێیـدا لـە سـەر شـکاتکردنی تـاوانلێکراو یـان کەسێکی نوێنەری یاسایی ئەو وەستاوە، کە لە مادەی سێهەمی یاسـای بنـەماکانی مـوحاکەماتی جەزایی لە یاسای ئێستای عێراقیدا هاتـوو.[2]

فەلسەفەی بەرەبستی جوڵاندنی داوای جینایی لەم تاوانانـەدا بـە بـێ شـکاتکردنی تـاوانلێکراو یـان بریکـاری یاسـایی، ئەوەیـە کـە سـومعەی تـاوانلێکراو بپارێزرێـت لـە لەکـەدار بـوون، چـونکە گرتنەبەری ڕێوشـوێنی دادوەری بە شێـوەیەکی ئاشـکرا نـاوی کەسـی پەیـوەندیدار دەزڕێنێـت و

[1] یاسای سزادانی عێراقی (م ١٥٣). مامۆستا محسن ناجی، سەرچاوەی پێشوو لا ٥٥٧ و پاشتر.

[2] لەم تاوانانەی خـوارەوەدا دروست نییە کە داوای جەزایی بجوڵێنرێت مەگەر لە سەر داوای شکاتی تاوانلێکراو یان بریکاری یاسایی ئەو بێت:

١ ـ زینای یەکێك لە دوو هاوسەر یان لە فرەژنیدا بە پێچەوانەی یاسای باری کەسێتی .

٢ ـ تۆمەتی داوێنپیسی یان جنێو یان نهێنی درکاندن یان هەواڵی درۆ یان هەڕەشە بە قسە یان ئازاری سووك ئەگەر تاوانەکە بەرانبەر کەسێك نەکرابوو کە لە کاتی بەجێهێنانی ئەرکێکی گشتیدا بێت ئان بەهۆی ئەو کارەوە بێت.

٣ ـ دزی و بەزۆر زینالەگەڵکردن و ناپاکی لە ئەمانەت و کڵاولەسەرنان و گلدانەوەی هەرشتێك کە لەوانەوە پەیدا بێت ئەگەر تاوانلێکراو هاوسەری تاوانبار بێت یان باوانی بێت یان ڕۆڵەو نەوەی بێت و ئەو شتانەش حیجزی دادوەر یان ئیداری لەسەر نەبێت یان مافی کەسێکی تری لەسەر بێت.

پەردەهەڵدانەوەیەکی دڵماتوو نادیارە بۆ ئەو پەیوەندییانەی کە دەبێت داپۆشراو بێت، وە لەبەبەر ئەوەی تاوانەکە تایبەتییە و پەیوەندی نزیکی بە کۆمەڵگەوە نییە.

وە رێکەوتن لەم تاوانانەدا نەبێت دروست نییە، چونکە ئەم رێکەوتنە ئەگەر کرا ئەوا بە لێبوردن[1] دادەنرێت لە لایەن تاوانلێکراوەوە بەرانبەر تاوانبار لە تاوانەکەیدا.

ئەمەش بە پێی مادەی (٣٣٨)ی یاسای ئێستای بنەماکانی موحاکەماتی جەزایی عێراقی[2] .

لێبوردن وگەردنازادی لە لایەن تاوانلێکراوەوە واتای ئەوەیە کە وازی لە سکاڵاکەی هێناوە دژی ئەو کەسەی تاوانێکی لەو تاوانانە کردووە کە دروستە رێکەوتنی تێدا بکرێت.

**مەرجەکانی گەردنئازادکردن:**

بۆ ئەوەی گەردنئازادکردن وەك بارودۆخێکی کاریگەر لە سزادا حسابی بۆ بکرێت دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١ـ دەبێت تاوانەکە لەو تاوانانە بێت کە رێکەوتن لە خۆ دەگرێت و ئەم مەرجەش لە پەرەگرافی (د) لە مادەی (٣٣٩) لە یاسای ئێستای بنەماکانی موحاکەماتی جەزایی عێراقیدایە.[3]

وە ئەو تاوانانەی رێکەوتنی تێدا دەکرێت دوو بەشن:

**یەکەم:** ئەو تاوانانەی بە ساڵێك یان کەمتر سزایان لە سەرە. ئەمانەش رێکەوتن دەگرنە خۆ بە بێ رەزامەندی دادگا، واتە رێکەوتنی تێدا قبووڵ دەکرێت و ئیلزامییشە، کەواتە دەبێ دادگا قبووڵی

---

[1] دادگای یەکلاکەرەوە لە بڕیاری ژمارە ٦٥٩/ بڕیارێکی جەزایی تەمییزی لێبوردن/١٩٧١ لە ١٩٧١/١/٥ بڕیارێکی دەرچوو لە دادگای گەورەی جەزا لە پارێزگای دیالە و ئەم بڕیارەی لەسەر دا: ( بڕیار درا لێبوردنی حوکمدراو(ح) قبووڵ نەکرێت لەو حوکمەی کە دژی دەرچووە لە هەمان ئەم دادگاوە لە مێژووی ١٩٧٠/٤/٢٥ بە زیندانیکردنی قورس بۆ ماوەی دووساڵ بە پێی مادەی (٤٠٩)ی یاسای سزادانی عێراقی، چونکە سزای ناوبراو لەو سزایانەیە کە لێبوردن ناگرێتەخۆی) .

[2] دەقی مادەکە دەڵێت( ئەو دادگایەی حوکمەکەی دەرکردووە یان ئەو دادگایەی لە جێگەیدا دانراوە بۆی هەیە بڕیار بدات لێبوردن قبووڵ بکات لەوکەسەی حوکمی سزایەکی سەرەکی کۆتکاری ئازادی (مقید للحریە) لەسەرە لە تاوانێکدا کە دروستە لێبوردنی تێدا بدرێت چ ئەو حوکمەی دراوە یەکلابووبێتەوە یان نا).

[3] دەقی بڕگەی ( د ) دەڵێت: دادگا گەردنئازادی وەردەگرێت ئەگەر تاوانەکە لەو تاوانانە بوو کە رەوا بێت بە بێ رەزامەندی دادگا گەردنئازادی تێدا بکرێت و دادگاش دەتوانێت لە حاڵەتەکانی تردا وەربیگرێت.

بکات لە هەموو بابەتەکاندا جگە لە تاوانەکانی هەڕەشەکردن ، ئازاردان، فەوتاندنی دارایییەکان، یان دەرهێنانی، لەم تاوانانەدا رێکەوتن قبوڵ ناکرێت مەگەر بە رەزامەندی دادگا، گەرچی سزاکە لە ساڵێك کەمتر بێت.

دووەم: ئەو تاوانانەی بە ساڵێك پتر سزایان لە سەرە رێکەوتن ناگرنە خۆ مەگەر بە رەزامەندی دادگا بە پێی دەقی مادەی(١٩٥) لە یاسای بنەماکانی موحاکەماتی جەزایی عێراقی .[١]

لە سەر ئەم بناغەیە لێبوردنی تاوانلێکراو دروستە بە بێ رەزامەندی دادگا لەو تاوانانەدا کە رێکەوتن تێیدا لە سەر رەزامەندی دادگا نەوەستاوە. هەروەها دروستە بە رەزامەندی دادگا لەو تاوانانەدا رێکەوتنەکە لەسەر ئەم رەزامەندییە دەوەستێت، چونکە لێبوردن تەنها لەو شتانەدا دروستە کە رێکەوتنی تێدا دروستە.

٢ـ پێویستە سزای بڕیاردراو لەو سزا ئەسڵییانە بن کە کۆت لەسەر ئازادی دادەنێن بە پێی مادەی (٣٣٨) لە و یاسایەی ناومان برد.

ئەم مەرجەش دوو توخمی هەیە:

**یەکەم:** پێویستە حوکمەکە دژ بە حوکمدراوەکە دەرچوو بێت چ حوکمێکی سەرەتایی بێت و یەکلانەبوویێتەوە یان بەدەستهێنراو(مكتسب)بێت، لە هەردوو حاڵەتەکەدا لێبوردن دروستە. ئیتر پێویستە لە سەر دادگا حوکمی پێ بکات و یەکسەر سزادراوەکە ئازاد بکات.

٣ـ نابێ لێبوردنەکە بە مەرجێکەوە لکابێت یان پێوەی بەسترابێت. وە ئەگەر لێبوردنی تاوانلێکراو مەرجدار کرابێت بە وەرگرتنی پەیمانێك لە حوکمدراو پێش ئازادکردنی یان بەسترابوویەوە بە جێبەجێبوونی قازانجێکی شەخسیی تاوانلێکراو، لێبوردنەکە هەڵدەوەسێتەوە و هیچ شوێنەوارێکی نابێت .

---

[١] کە دەڵێت:

أ ـ (ئەگەر تاوانی ئاماژەپێکراو لە (م ١٩٤)دا سزای زیندانی ساڵێك یان کەمتر یان غەرامەی لەسەر بوو، ئەوا سوڵحی تێدا قبوڵ دەکرێت بە بێ ررزامەندی حوکم یان دادگا.

ب ـ ئەگەر تاوانەکە سزای پتر لە ساڵێکی لەسەر بوو ئەوا رێکەوتنی تێدا قبوول ناکرێت مەگەر بە رەزامەندی دادوەر یان دادگا.

ج ـ بە رەزامەندی دادوەر و دادگا رێکەوتن قبووڵدەکرێ لە تاوانەکانی هەڕەشە و ئازادکردن و فەوتاندنی دارایی یان دەرهێنانی، گەرچی بە پتر لە ساڵێك سزا درابێت لە سەری.

فەلسەفەی ئەم مەرجەی کۆتایی ئەوەیە کە لێبوردن هۆیەکە یان بۆخێکە بۆ نەمانی تاوان بە نەمانی دوای مافی گشتی کە نەبوونی تاوانی لیّ بەرهەمدیّت. بۆیە ئەگەر کۆتی لەسەر بێت یان بەسترابێتەوە بە شتێکی ترەوە ئەو بەرهەمەی نابێت. چونکە ئەگەر تاوان لە ئارادا نەبێت شوێنەوارێکیشی نابێت. ئەم مەرجەش لە پەرەگرافی (هـ) لە مادەی (٣٣٩) ی یاسای ناوبراو وەرگیراوە.

**ئەنجامگیری:**

لەو روونکردنەوەیەی پێشکەش کرا دەربارەی رێکەوتن و لێبوردن ئەو ئەنجامەمان دەستدەکەوێت کە هەردووکیان لە لۆجیکی یاساییدا بیّ یەکدی نابن، بە شێوەیەک کە لێبوردن نییە مەگەر لەو تاوانانەدا کە رێکەوتنی تێدا دەکرێت، هەروەک چۆن سۆلّح بەجێنایەت مەگەر بە وازهێنانی هەریەک لە (تاوانبار و تاوانلێکراو) لە بەشێک لە مافەکانیان لە سەر ئەوی تر. لە رووی تەلازومەوە هەردووکیان وەک یەک بارودۆخ(یان هۆکار) وەهان بۆ هەڵوەشاندنەوەی سزا. سەرەرای ئەوەش هەریەک لە یاسادانەران چارەسەرێکی تایبەتی داناوە، بۆیە دەکرێت بە شێوەیەکی تیۆری بە هۆکارێك یان بارودۆخێکی کاریگەری سەربەخۆ بزانین کە تاوان دەکەوێتە ژێر کاریگەریی و لەوێشەوە سزا و ئەنجامی ئەم کارگەریی و کارتێکرانە فەلسەفییە نەمانی سزاو ئازاردانی تاوانکارە.

**نۆهەم: بارودۆخی لێبوردنی تایبەت :**

لێبوردنی تایبەت بە فەرمانێکی کۆماری دەردەچێت و لە ئەنجامدا ئەوسزایەی لە حوکمەکەدایە ، هەمووی یان هەندێکی نامێنێت یان دەگۆڕرێت بە سزایەکی سووکتر لە سزایانەی بڕیاری یاساییان لەسەرە.

بەلام لە ئەنجامی لێووردنەوە سزا شوێنکەوتەییەکان و تەواوکارەکان و شوێنەوارە سزاییەکانی تر هەڵناوەشێتەوە، هەروەها رێوشوێنە مەبادلییەکان نامێنن، هیچ کاریگەرییەکیشی نامێنێت لەسەر ئەو سزایانەی جێبەجێکراون.

هەموو ئەمانەش بۆ حاڵەتێکن فەرمانەکە شتێك نەڵێت کە پێچەوانەی ئەمانە بێت.[1]

---

[1] مادەی (١٥٤)ی یاسای سزادانی عێراقی.

پەیوەندییەك لە نێوان دۆخی لێبووردنی گشتی و دۆخی لێبووردنی تایبەت:

ئەم دوو دۆخە لەم چەند خاڵەدا جیاوازییان هەیە و گرنگترینیان ئەمانەن:

١ـ دۆخی تایبەت تەنها کار لەسەر سزا دادەنێت، حوکمدراوەکە بە تەواوی یان لە بەشێك لە تاوانەکەی دەبەخشرێت یان بۆی دەگۆڕرێت بە سزایەکی تر، ئەگەر بەشێکی بوو ئەوا بەریەستەکە روودەکاتە ئەو ئەندازەی سزاکە گرتوویەتەوە، وە ئەگەر گۆڕین بوو ئەوا بەریەستەکە بە سەبارەت بە سزا بنەڕەتیەکەوە دەبێت کە گۆڕراوە نەك سزا بەدەلەکە.

٢ـ لێبووردنی تایبەت بە فەرمانێکی کۆماری دەردەچێت، بەڵام لێبووردنی گشتی بە یاسا.[1]

٣ــ لە ئەنجامی لێبووردنی تایبەتەوە سزای شوێنکەوتەیی و تەواوکار و شوێنەوارە جەزاییەکانی تر و رێوشوێنە مەبادلییەکانی تر هەڵناوەشێتەوە.[2]

بە پێچەوانەی لێبووردنی گشتییەوە کە لە ئەنجامیەوە تەواوبوونی دەعوا و نەمانی حوکمی تاوانبارکردن کە رەنگە لە سەری دەربکرێت و هەموو جۆرەکانی سزا و رێوشوێنێکیش هەڵدەوەشێتەوە.[3]

## گرنگیی لێبووردنی تایبەت:

لە زۆر رووەوە لێبووردنی تایبەت لە سزا گرنگی زۆرە و هەندێك لەو گرنگییانش بریتییە لە:

أ ـ راستکردنەوەی هەڵەدادوەرییەکان: هەندێکجار دادوەر هەڵە دەکات لە تاوانبارناساندنی تاوانکەردا و لێبووردنی تایبەتی ئەم هەڵەیە چارەسەر دەکات و شوێنەوارەکانی ناهێڵێت.

ب ـ هەندێکجار گرتنەبەری رێگاکانی تانەلێدان دادگەریی خوازراو بەدیناهێنێت لە حوکمدان بە سزاکە، بۆیە لێبوورنی تایبەت دێت و ئەم ناتەواویە لادەبات.

ج ـ رەنگە ئەندازەی سزاکە گونجاو نەبێت لەگەڵ ئەندازە و مەترسی تاوانەکەدا، بۆیە کاتێك لێبوردنەکە سزاکە سووك دەکات هاوسەنگی دەخاتە نێوانیان.

د ـ رەنگە هەندێکجار سزا تەواوەکە رەوشتی حوکمدراوەکە رێك نەکاتەوە، بۆیە لێبووردنی تایبەت سزاکە کەمدەکاتەوە و فەلسەفە چاکسازییەکەی بەدیدەهێنێت.

---

[1] هەمان یاسا (م ١٥٣) .

[2] هەمان یاسا (م ٢/١٥٤) .

[3] هەمان یاسا (م ١/١٥٤) .

## نموونەکانی لێبوردنی تایبەت:

لێبوردنی تایبەت سێ نموونەی هەیە:

١ - بەخشین بە تەواوی لە هەموو سزاکە. لەم وێنەیەدا دەبێت یەکسەر حوکمدراو لە زیندان ئازاد بکرێت.

٢ - بەخشینی تاوانکار لە بەشێك لە تاوانەکەی، وەك کەمکرنەوەی ماوەی زیندانکردن لە شەش ساڵەوە بۆ سێ ساڵ، یان دابەزاندنی بەندکردن لە چوارساڵەوە بۆ یەك ساڵ بۆ نمونە.

٣ - گۆڕینی جۆرێك لە سزا بۆ جۆرێکی تر، وەك گۆڕینی زیندانی بە بەندکردن و بەندکردن بە غەرامە.

بەڵام گۆڕین ئەم سێ مەرجەی پێویستە:

أ - دەبێت گۆڕین لە تووندترەوە بێت بۆ سووکتر نەك بە پێچەوانەوە.

ب - دەبێت سزای جێگرەوە وەك سزا بنەڕەتییەکە بڕیاری یاسای لەسەر بێت، بۆ رەچاوکردنی بنەمای (هیچ سزا و تاوانێك نییە بەدەر لە دەقی یاسایی).

ج - نابێت ئەو مەرسوومەی کەسزاکە دەگۆڕێت مەرجێکی وەهای تێدا بێت کە زیان بە حاڵی حوکمدراو بگەیەنێت و ببێتە هۆی ناشیرینکردنی پێگەی . چونکە ئەم جۆرە مەرجانە توونکردنەوەن و ئەمەش لەگەڵ سووککردنی سزادا ناگونجێت .

## مەرجەکانی لێبوردنی تایبەتی:

١ - پێویستە حوکمەکە گەشتبێتە پلەی بڕاوە و یەکلایی، چونکە لێبوردن حوکمی سزایەك دەگرێتەوە کە نەتوانرێت بە هیچ رێگەیەك لە رێگا یاساییەکانی تانەلێدان فریای بکەوین.

٢ - دەبێت لێبوردنەکە بە مەرسوومێکی کۆماری بێت، وەگەر نا جێبەجێ ناکرێت[1] .

---

[1] مامۆستا محسن ناجی - سەرچاوەی پێشوو لا ٥٧٢.

## دەهەم: بارودۆخی ماوەسەرچوو:[1]

ماوەبەسەرچوو(التقادم): بریتی یە لە تێپەڕبوونی ماوەیەك، لە مێژووی دەرچوونی فەرمانی کۆتایی سزاکەوە پێش ئەوەی لەو ماوەیەدا ڕێوشوێنی جێبەجێکردنی بگیرێتە بەر . وە لە ئەنجامی کاریگەریی ماوەبەسەرچوو و کارتێکرانی سزاوە بەسەرچوونی مافی کۆمەڵگە لە جێبەجێکرنیدا پەیدا دەبێت.

بەڵام ماوەبەسەرداچوو لە دلوای جەزاییدا بریتییە لە تێپەڕبوونی ماوەیەك لە مێژووی تاوانکردنەکەوە یان هەر ڕێوشوێنگرتنەبەرێك لە ڕێوشوێنەکانی دلوای جەزایی و لە ئەنجامی کاریگەریەکەیەوە ماوەی کاتبەسەرداچوونەکە کۆتایی دێت و لە ئەنجامی کارتێکرانی دلوا جەزاییەکەشەوە مافی کۆمەڵگەش نامێنێت لە جووڵاندنی ئەم دلوایەدا.

فەلسەفەی نەمانی سزا بە کاتبەسەرچوون ئەوەیە کە: جێبەجێکردنی سزا پاش بەسەرچوونی کاتەکەی هیچ ئامانجێکی بەدی ناهێنێت لە دەستخستنی دادگەری و قازانجی کۆمەڵگە لە ترساندنی تایبەتی(ڕێگرتن لە تاوانبار بە گەڕانەوەی بۆ تاوانەکەی) و ترساندنی گشتی ( بەربەستکردنی کەسانی تر لەوەی چاو لە تاوانبار بکەن و لابدەن بەرەو تاوانکردن).

جگە لەمەش، تاوانبار پاداشتی کارەکەی وەرگرتووە بە خۆشارینەوەی لە خەڵکی بۆ ئەو ماوەی بەسەرچوونە، کە ئازارێکی زۆری بۆ دروستکردووە و زۆریەی بەرژەوەندییەکانی لە دەستداوە و گەلێك لە هەلەکانی پێداویستی ژیانی لە دەستداوە و گەلێك زیانی تریش کە کەمتر نییە لە ئازاری ئەو سزایەی کە بڕیار بووە جێبەجێ بکرێت لە سەری . هەروەها کۆمەڵگە هیچ قازانجێك ناکات لە جێبەجێکردنی سزایەك کە شوێنەوارەکەی نەمابێت لە بیرەوەری خەڵکدا کە تاوانەکە دروستی کردووە .

[1] دەربارەی بارودۆخی کاتبەسەرداچوون سەیری ئەم سەرچاوانە دەکرێت: یاسای ئێستای ڕێوشوێنگرتنەبەری جینایی میسری (م ٧٤ ـ ٧٦)، د . محمود نجیب حسنی ـ سەرچاوەی پێشوو لا ٧٥٤ و پاشتر. د .محمود محمود مصطفی ـ سەرچاوەی پێشو لا ٦٩١ و پاشتر ، د . رەئوف عبید ـ سەرچاوەی پێشوو لا ٨٧٧ و پاشتر .

**ئەو سزایانەی دەکەونە ژێر کاریگەری باروبۆخی ماوەبەسەرچوونەوە:**

تەنها ئەو سزایانە دەکەونە ژێر کاریگەری باروبۆخی ماوەبەسەرچوونەوە کە جێبەجێکردنیان پێویستی بە گرتنەبەری رێوشوێنی دیاریکراو هەیە کە کرداری مادی بەرانبەر کەسی حوکمدراو یان بەرانبەر دارایییەکەی دەگرێتە خۆ. ئەوەش بریتییە لە سزای جەستەیی وەك لەسێدارەدان و ئەو سزایانەی ئازادی دەسڕنەوە وەك زیندانیکردنی هەمیشەیی یان کاتیی و بەندکردن یان سزاماڵییەکان کە لە غەرامەدا خۆی دەبینێتەوە.

بەڵام ئەو سزایانەی جێبەجێکردنی لە سەر گرتنە بەری ئەو رێوشوێنانەی کرداری مادی لەسەر کەسی حوکمدراو یان لەسەر دارایییەکەی ناگرێتە خۆ، ئەوا بە ماوەبەسەرچوون نافەوتێت.

**ئەو سزایانەی بە ماوە بەسەرچوون نافەوتێت:**

أ ـ دەستبەسەرداگرتن(المصادرە): چونکە لەگەڵ دەرچوونی حوکمەکەدا بە جێبەجێکراو دادەنرێت.

ب ـ ئەو سزایانەی هەندێك ماف و تایبەتمەندی دادەماڵێت: چونکە کاریگرییەکەی(بێبەشبوونی حەکمدراو لێیان) لەگەڵ دەرچوونی حوکمەکەدا بەدی دێت بە بێ جێبەجێکردنێك.

ج ـ چاودێری پۆلیس: چونکە لە رۆژێکی دیاریکراودا دەست پێدەکات و بە تەواوبوونی ماوەکەی تەواو دەبێت.

د ـ نیشتەجێبوون(الاقامة) .

ئەم سزایانە و هاوشێوەکانی کە پێویستییان بە رێوشوێنی دادوەریی و رووکەشی نییە، بە ماوەبەسەرچوون بەسەرناچێت، بە هۆی نەبوونی هەردوو توخمی کاریگەری و کارتێکرانی فەلسەفی، وە ئاشکراشە کە کاتبەسەرچوونیش لە شوێنەواری ئەو دوانەیە.

**ماوەی کاتبەسەرچوون:**

ماوەی کاتبەسەرچوون بۆ کۆتاییهاتنی ئەو سزایانەی کەتوونەتە ژێرکاریگەریەکەی بە پێی گەورەیی و ترسناکیی تاوانەکە دەگۆڕێت، چەند ئەو دیاردەیە پتر بێت ماوەی تێپەڕبوونیشی درێژ دەبێتەوە، چونکە کاتبەسەرچوون هەروەك وتمان لەسەر بیرچوونەوە بونیات دەنرێت و چەند تاوان سادە بێت ئەوەندەش نزیکە لە بیرچوونەوە.

لەسەر ئەم بناغەیەش ماوەکانی کاتبەسەرچوونی هەڵوەشێنەرەوە جیاوازە لە دلولجەزاییەکاندا و لە سزاکانی تاوانی گەورە و ناوەنج و سەرپێچیدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ ـ ماوەی کاتبەسەرچوونی نەمانی تاوانبارکردن (نەمانی دلوا جەزاییەکان):

١ـ لە مادەکانی تاوانە گەورەکاندا دە ساڵ لە رۆژی روودانی تاوانەکەوە.

٢ـ لە مادەکانی تاوانە ناوەنجەکاندا سێ ساڵ.

٣ـ لە مادەکانی سەرپێچیدا یەکساڵ.

ئەمەش بەومەرجەی دەقێکی یاسایی بە پێچەوانەیەوە نەهاتبێت.

ب ـ ماوەی نەمانی جێبەجێکردن (نەمانی سزا):

٢ـ لە سزای سێدارەدا سی ساڵ.

٢ـ لە زیندانی هەمیشەییدا یان کاتیدا بیست [1].

٣ـ لە سزای تاوانی ناوەنجیدا پێنج ساڵ.

٤ ـ لە تاوانی سەرپێچیدا دوو ساڵ [2].

## دەسپێکردنی ماوەی کاتبەسەرچوون:

ماوەکە لەو کاتەوە دەست پێدەکات حوکمەکە یەکلایی بوبێتەوە، بناغەی ئەمەش ئەوەیە کە پاش یەکلابوونەوەکە جێبەجێکردنی پێویست دەبێت، گەر حوکمەکە بزرانە (غیابی)نەبوو، وەگەرنا ماوەکەی لە رۆژی دەرچوونی حوکمەکەوە دەستپێدەکات [3]

ئەو حوکمە نائامادەییەی لە دادگایەکی جینابیەوە دەردەچێت بە حوکمێکی کۆتایی

---

[1] مادەی (١٥) لە یاسای ئێستای رێوشوێنە جینابییەکانی میسری .

[2] سەرچاوەی پێشوو (م ٥٢٨) . وە لە یاسای ئێستای سزادانی سوری (م ١٦٢ ـ ١٦٥): ماوەی کاتبەسەرچوون لە سزای لەسێدارەدان و سزاجینابیە هەمیشەییدا بیست و پێنج ساڵە، وە لە تاوانی کاتیدا دوویەرانبەری ماوەی سزاکەیە بە مەرجێك ماوەکەی لە بیست ساڵ پتر نەبێت و کەمتر نەبێت لە دە ساڵ، وە لە هەر سزایەکی جینابی تردا دە ساڵ و لە تاوانی ناوەنجدا پێنج ساڵ و لە سەرپێچیدا دوو ساڵ و لە رێوشوێنە مەبادابیەکاندا سێ ساڵ . وە دەستپێکردنی ماوەکەش لە مێژووی حوکمدرانەکەوە دەست

[3] یاسای ئێستای رێوشوێنی جینابی (م ٥٢٨) .

دانانرێت، چونکە یەکسەر هەڵدەوەشێتەوە لەگەڵ ئامادەبوونی یان گیرانی حوکمدراودا [1].

ئەوەی کە شایانی باسە کە یاسادانەری عێراقی گرنگییەکی بە کاتبەسەرچوون نەداوە لە رووی کارتێکردنی لەسەر نۆرە جینایییەکان بە رێژەیەکی کەم نەبێت. [2] رەنگە بەو رێبازە کاریگەر بێت کە باوەڕی وەهایە لابردنی سزای سەر تاوانباران بە ماوەبەسەرچوون بیرۆکەیەکی لۆجیکی نیە، پێویست وابوو ئەم بیرۆکەیە جێبەجێ نەکرێت مەگەر بۆ تاوانبارانی رێکەوت و تاوانبارانی سۆز، نەوەك بۆ تاوانبارانی بەرورد و خووگرتوو، چونکە ترسناکی بۆ سەر کۆمەڵگە دروست دەبێت بە هەڵوەشاندنەوەی سزا لەسەر ئەو جۆرە تاوانبارانە بەهۆی ماوەبەسەرچوونەوە، چونکە ئەوان لە هەموان باشتر دەتوانن خۆیان لەبەرچاوی خەڵکی ون بکەن بە ئاسایشی و ئارامی بژین .

**یازدەهەم: باروودۆخی هەڵوەشاندنەوەی دەقی تاوانبارکردن:**

ئەگەر پاش فەرمانی کۆتایی یان پێشی یاسایەکی نوێ دەرچوو، بە شێوەیەك ئەو کارەی بە رەوا زانی کە تاوانباری لەسەر حوکم دراوە، ئەوا فەرمانەکە دەوەستێنرێت و شوێنەوارە جەزاییەکانیشی نامێنێت . [3]

---

[1] وەك لە تاوانی ناپاکیی هاوسەریدا کە پەرەگرافی (أ ) لە مادەی (١/٣٧٨) دەڵێت: (شکاتکردن لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا وەرناگیرێت:

أ ـ ئەگەر شکاتەکە پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ بەسەر رۆژی زانینی شکاتکەرەکە بە تاوانەکەدا کرا. (

وە لە یاسای چاودێری منداڵان ژمارە ٧٦ ساڵی ١٩٨٣ی گۆڕاو لە مادەی (٧٠)دا دەڵێت:

یەکەم: داوای جەزایی بە تێپەڕبوونی دە ساڵ لە تاوانی گەورەدا و پێنج ساڵ لە تاوانی ناوەنجدا بەسەردەچێت.

دووەم: رێوشوێنگرتنەبەر ئەگەر جێبەجێ نەکرا لە ماوەی پانزەساڵدا لە تاوانی گەورەدا و بە تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر تەواوبوونی ماوەی رێوشوێنە حوکمپێکراوەکە لە حاڵەتەکانی تردا.

[2] وەك لە تاوانی ناپاکیی هاوسەریدا کە پەرەگرافی (أ ) لە مادەی (١/٣٧٨) دەڵێت: (شکاتکردن لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا وەرناگیرێت:

أ ـ ئەگەر شکاتەکە پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ بەسەر رۆژی زانینی شکاتکەرەکە بە تاوانەکەدا کرا. (

لە یاسای چاودێری منداڵان ژمارە ٧٦ ساڵی ١٩٨٣ی گۆڕاو لە مادەی (٧٠)دا دەڵێت:

یەکەم: داوای جەزایی بە تێپەڕبوونی دە ساڵ لە تاوانی گەورەدا و پێنج ساڵ لە تاوانی ناوەنجدا بەسەردەچێت .

[3] مادەی(٥) لە یاسای ئێستای سزادانی میسری .

ئەوەش بابەتێکی بەڵگە نەویستە کە گەڕانەوەی دەقە جەزاییەکان بنەمای (شەرعیەتی تاوان و سزاکان)هەڵناوەشێنێتەوە، چونکە دەسەڵاتی کۆمەڵگە لە سزادانی تاوانبار بە سنووری هەردوو بیرۆکەی زەرورەتی کۆمەڵایەتی و سوودی کۆمەڵایەتی سنووردار کراوە، بۆیە ئەگەر سزا زەرورەتێکی نەبێت بەهیچ شێوەیەکە جێبەجێ ناکرێت.

ئەگەر یاسا نوێیەکە سزای ئەو تاوانەی هەڵوەشاندەوە کە لە سایەی یاسا کۆنەکەدا روویدا بوو یان سزاکە سووك کرا، ئەوە دڵنیێدانانێکە لە لایەن یاسادانەرەوە بە بێسوودیی سزاکە و هیچ پاساوێك نییە بۆ جێبەجێکردنی.

جگە لەمەش وەها دادەنرێت کە یاسا نوێیەکە سوودمەندترە بۆ تاوانبار وەك لە یاسا کۆنەکە، وە قازانجی کۆمەڵگەش لەوەدایە کە یەکسەر جێبەجێ بکرێت و مەسڵەحەتی تاوانباریش هەر لەوەدایە.

لەسەر بناغەی وەرگرتنی ئەم بیرۆکە لۆجیکییە قازانجی کۆمەڵگە و تاوانبار لەو چارەسەرەدایە کە ناودەبرێت بە شوێنەواری فەوری جێبەجێکردنی یاساکان .[1]

ئاشکرایە یەکێك لە مەرجەکانی دەرچوونی ئەو یاسا نوێیەی کە باشترە بۆ تاوانبار ئەوەیە ئەو یاسایە پێش دەرچوونی حوکمی کۆتایی سەر تاوانبار دەربچێت بەڵام ئەم مەرجە رەچاوناکرێت بۆ حاڵەتی بە رەوادانانی کردارێك لە لایەن یاسا نوێکەوە پاش ئەوەی یاسا کۆنەکە بە تاوانی دانابوو لەبەر ئەو هۆکارانەی باسمان کرد .

**دوازدەهەم: بارودۆخی پێدانەوەی متمانە(رد الاعتبار):**

پێدانەوەی متمانە بریتییە لە سڕینەوەی حوکمی سەرکۆنەکردن بە نیسبەت داهاتوو و بەسەرچوونی هەموو ئەو شوێنەوارە جەزاییە یاساییانەی لە ئەنجامیەوە دروست بووە بە شێوەیەك حوکمدراو لە مێژووی بەدەستهێنانەوەی متمانەوە دەبێتە کەسێکی وەها کە هیچ حوکمی سەرکۆنەی لە سەر نەبێت .[2]

---

[1] د . محمود نجیب حسنی ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل ٦٩ .

[2] لەم بابەتەدا سەیری یاسای رێوشوێنی جینایی میسری بکە ژمارە ١٥٠ ساڵی ١٩٥٠ی گۆڕاو، مادەکانی (٥٣٦ ـ ٥٥٣)

یاسای ئێستای سزایکانی جینایی سوری مادەکانی (١٥٨ ـ ١٦٠)

## فەلسەفەی قبوولکردنی گەڕاندنەوەی متمانە بۆ حوکمدراو:

هێشتنەوەی حوکمدراو پاش تەواو بوونی ماوەکەی بە بێبەشی لە مومارەسەی ئەو مافە مەدەنی و سیاسیانەی کە حوکمی سزایی بۆ هەمیشە بێبەشی دەکات لێی، هیچ لە قازانجی کۆمەڵایەتی و کەسێتی ئەو نییە، بۆیە یاسا سزاییەکان دەسپێشخەریان کردووە بە سەلماندنی سیستەمی گەڕاندنەوەی متمانە بە لابردنی ئەو ئەنجامە سزاییانە ئەگەر مەرجە یاسایی و دلوەرییەکانی تێدا بوو.

هەروەها گەڕاندنەوەی متمانە سیستەمێکە یاسادانەر لەو ڕێگەیەوە حوکمدراو بگەڕێنێتەوە بۆ پێگەی پێشووی تاوەکو بتوانێت سوود لە هەموو مافەکان و تایبەتمەندییەکانی خۆی وەربگرێت کە پێش کردنی تاوانەکە و بتوانێت هەموو جۆرەکانی ئەو چالاکییانە بکات کە هەمووکەس ڕێگای مومارەسەکردنی پێدەدرێت بە مەرجێك پێشتر حوکمی تاوانباربوونی لەسەر نەبووبێت . وە دلنگەریش وا دەخوازێت هەلێکی تر ببەخشێت بە حوکمدراو بۆ خۆچاککردن و تا وەك ئەندامێك لە کۆمەلگەدا پەیامەکەی خۆی بگەیەنێت.

## پەیوەندی نێوان گێڕانەوەی متمانە و لێبووردنی سەرتاپاگیر:

لەوەدا یەکدەگرنەوە کە لە ئەنجامیانەوە نەمانی ئەو شوێنەوارە جەزاییەکان بەدی دێت کە لە ئەنجامی کارەتاوانیەکەوە هاتۆتە ئارا وە، بەڵام لەم خاڵانەدا جیاوازن:

١ـ هەمیشە لێبووردنی سەرتاپاگیر بە پێی یاسا دەبێت، بەڵام گێڕانەوەی متمانە هەندێکجار بە پێی یاساو هەندێکجاریش بە حوکمێکی دلوەری دەبێت.

٢ـ لێبووردنی سەرتاپاگیر زۆربەی کات ڕێوشوێنێکی سیاسییە و بە مەبەستێکی گشتی دەگیرێتە بەر وەك دلخۆشکردن یان پەردەی بیرچوونەوە خستنە سەر هەندێك ڕوودلو، بەڵام گێڕانەوەی متمانەپاداشتێکی کەسییە لە سەر هەڵسوکەوتێکی جوانی حوکمدراو .

---

یاسای ئێستای سزادانی مەغریبی، بەندی (١٠٢)
د . محمود نجیب حسنی ـ سەرچاوەی پێشوو ـ لا ٧٦٢ و پاشتر.
د . محمود محمود مصطفی، سەرچاوەی پێشوو ـ لا ٦٩٩ و پاشتر.
د . رەئوف عبید ـ سەرچاوەی پێشوو ـ لا ٨٨٧ و پاشتر.
ماموستا محسن ناجی ـ سەرچاوەی پێشو لا ٥٧٣ و پاشتر .

لە ئەنجامی ئەم جیاوازیەوە وەستاندنی سزا و نەمانی حوکم لە رابوردوو دلهاتوودا لە لێبوردنی گشتیدا، بەڵام لە گێڕانەوەی متمانەدا دەبێت سزاکە بە تەواوی جێبەجێکرابێت و حوکمی رابوردوو یان دلهاتووش ناشۆرێتەوە بەڵکو شوێنەوارەکەی دەشۆرێتەوە.

٣ـ لێبوردنی سەرتاپاگیر کارێکی هەڵاوێردەییە و هەندێکجار دێتەجێ و هەندێکجاریش نایەتە دی، بەڵام گێڕانەوەی متمانە کارێکی ئاسایی و بەردەوامە.

٤ ـ لێبوردنی سەرتاپاگیر هەندێکجار پێش دادگایی یان پێش دەرچوونی حوکم یان پێش جێبەجێکردنی تەواوی سزا دەردەچێت، بە پێچەوانەی گێڕانەوەی متمانە کە هەمیشە پاش جێبەجێکردنی تەواوی سزاکە دەبێت یان پاش هەڵوەشاندنەوەی بە تێپەڕبوونی کات.

٥ـ لێبوردنی سەرتاپاگیر بەخشیشێکە و لە لایەن دەسەڵاتی یاسادانانەوە دەدرێت و لەسەر ویستی یاسادانەر وەستاوە، بەڵام گێڕانەوەی متمانە مافێکی پێویستە کە دەبێت بدرێت بە حوکمدراو ئەگەر مەرجەکانی هاتبێتە دی.

٦ـ لێبوردنی سەرتاپاگیر کاریگەری لەسەر رابوردوو دادەنێت، بەڵام گێڕانەوەی متمانە تەنها شوێنەوار لەسەر دلهاتوو دادەنێت.

**جۆرەکانی گێڕانەوەی متمانە :**

لە رووی سەرچاوەوە گێڕانەوەی متمانە دەکرێت بە دوو بەشەوە: یاسایی و دادوەریی.

**یەکەم: گەڕاندنەوەی متمانەی دادوەریی :**

ئەمەش بە حوکمی دادگای تاوانەکان دەبێت و ئەم مەرجانەشی پێویستە:

١ـ جێبەجێکردنی ئەو سزایەی فەرمانی لەسەر دراوە یان لێبوردن لێی یان بەسەرچوونی بە ماوەبەسەرچوون.

٢ـ تێپەڕبوونی ماوەیەکی دیاریکراو لە مێژووی جێبەجێکردنی سزاکە یان لێبوردنی یان کۆتاهاتنی بە ماوەبەسەرچوون .

ئەم ماوەیەش شەش ساڵە ئەگەر تاوانەکە گەورە بوو، ئەگەر تاوانێکی ناوەنجیش بوو سێ ساڵە. وە ماوەکەش دووبەرانبەر دەبێتەوە ئەگەر حوکمی گەڕانەوە یان نەمانی سزا بە

ماوەبەسەرچوون دەربکرێت .[1]

ئەگەر حوکمدراوەکە لە ژێر چاودێری پۆلیسدا بوو پاش تێپەڕبوونی سزای سەرەکی ئەوا ماوەکە لە دوارۆژی کۆتایی ماوەی چاودێریەکەوە دەست پێدەکات. لە ئازادکردنی مەرجداردا ماوەکە لەو مێژووەوە دەستپێدەکات کە بڕیارە سزاکەی تێدا تەواو دەبێت یان لەو مێژووەوە کە ئازادکرنەکە یەکلا دەبێتەوە.

٣ ـ پێویستە حوکمدراو هەموو ئەو پابەندییە داراییانەی بدات کە لە سەریەتی، لە غەرامە یان گێڕانەوەی شوێنی تاوان یان بژاردن یان مەسرەفەکانی. دادگاش دەتوانێت چاوپۆشی بکات لەم مەرجە، ئەگەر حوکمدراو بیسەلمێنێت کە لە باروبۆخێکی وەهادایە ناتوانێت ئەم ئەستۆدارییە جێبەجێ بکات.لە بری ئەوە پابەندییەکە بە ماوەبەسەرچوون هەڵدەوەشێتەوە.

٤ ـ رەوشتجوانی حوکمدراو بە شێوەیەك بێت کە رەوشتی کەسی خوازیاری گێڕانەوەی متمانە لە کاتی حوکمدرانیەوە تا ئەو رادەیە بێت کە متمانەی خۆڕاستکردنەوە دروست بکات.

ئەوەی شایانی باسە ئەگەر خوازیاری گێڕانەوەی متمانە چەند حوکمێکی یەك لەدوای یەکی بەسەردا درابوو ئیتر فەرمانی گێڕانەوەی متمانەی بۆ دەرناکرێت مەگەر هەریەك لە فەرمانەکان ئەو مەرجانەی تێدا بەدی بێت کە باسمان کردن، بە مەرجێك لە حسابکردنی ماوەکاندا رەچاوی ئەوە بکرێت بدرێتە پاڵ نوێترین فەرمانەکان . لە گێڕانەوەی متمانەی دادوەریدا یاسا پێویستی ناکات کە تاوانەکە لە جۆرێکی دیاریکراو بێت، دوای گێڕانەوەی متمانەش دروستە بۆ هەرکەسێك حوکمدرابێت بە تاوانی گەورە یان ناوەنج، هەرجۆر و هەر ئەندازەیەك بێت.

**دووهەم: گێڕانەوەی متمانەی یاسایی:**

متمانەیەکە بە هێزی یاسا دێتە ئارا بە بێ پێشکەشکردنی هیچ داوایەك لە لایەن حوکمدراوەوە یان دەرچوونی فەرمانێکی دادوەری بۆ ئەم گێڕانەوەیە، ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا بوو:

[1] یاسای ئێستای رێوشوێنی تاوانکاری میسری (م ٥٣٧) .

١ ـ پێویستە سزاکە جێبەجێ بکرێت یان ببەخشرێت یان بە هۆی کاتبەسەرچوونەوە بەسەرچوووبێت.

٢ ـ پێویستە دوانزەساڵ تێپەڕیوووبێت بەسەر جێبەجێکردنی تەواوی سزاکەدا گەر حوکمەکە بۆ سزای تاوانێکی گەورە، ناوەنج، تاوانی دزی، شاردنەوەی شتی دزراوەوە، کڵاولەسەرنان، ناپاکی لە ئەمانەت، تەزویر یان دەستپێکردنی یەکێك لەم تاوانانەوە بووبێت.

٣ ـ بەڵام بۆ ئەو کەسە حوکمدراوەی کە سزایەکی تاوانی ناوەنجی لە سەر بێت جگە لەو تاوانانەی باسمانکرد پێویستە شەش ساڵ بەسەر جێبەجێکردنی سزا یان بەخشینی تێپەڕیووبێت، بە مەرجێك حوکمدراوەکە گەڕاوە نەبێت و سزاکەش بەهۆی کاتبەسەرچوونەوە هەڵنەوەشابێتەوە، وەگەرنا تێپەڕبوونی دوانزەساڵ لێرەشدا بەمەرج دەگیرێت. ئەگەر حوکمدراو چەندفەرمانێکی بەسەردا درابوو، ئەوا بە فەرمانی یاسا متمانەی بۆ ناگەڕێنێتەوە گەر هەریەك لەوحوکمانە ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو کە یاسا باسی کردوون، بە مەرجێك لە ژماردنی ماوەکاندا بدرێتە پاڵ نوێترین فەرمانەکان .

**شوێنەوارەکانی گێڕانەوەی متمانە :**

هەرکات مەرجەکانی کارتێکەر و کارتێکراوی فەلسەفی بەدیهات، ئەوا دوو جۆر شوێنەواری لێدەکەوێتەوە:

١ ـ سەبارەت بە سزا نەمانی حوکمی دادوەر بە تاوانبارکردن لە داهاتوودا دەردەکەوێت.

٢ ـ کۆتایی هاتنی هەموو ئەو شتانەی لێوەی پەیدا دەبن وەك لە نەمانی شیاوییەتی(ئەهلییەت) و بێبەشبوون لە مافەکان و شوێنەوارە سزاییەکانی تر .

بەڵام دروست نییە گێڕانەوەی متمانە بکرێتە بەڵگە لەسەر کەسێکی تر لەو شتانەدا کە پەیوەندی بەو مافانەوە هەیە کە پێیان دەگات لە ئەنجامی فەرمانی تاوانبارکردنەوە و بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی بە گەڕاندنەوەی شوێنی تاوان و بژاردنی ئەو زیانانەی لە ئەنجامی ئەو تاوانەوە بەدی دێت .

جگە لەوەش لە ئەنجامی گێڕانەوەی متمانەوە نەمانی تاوانەکە لە خودی خۆیدا بەدینایەت، چونکە ئەوەی لە واقیعدا روویداوە بەشێکە لە واقیع و ناسڕێتەوە . ئەگەر توانرا شوێنەوارەکانی تاوانەکردار ی تاوانبار بە کردار و بە یاسا بسڕێتەوە، ئەوا رەنگە واتاو ئاماژەکانی بمێنێتەوە .

**قابیلیەتی هەڵوەشاندنەوەی فەرمانی گێڕانەوەی متمانە :**

دوو هۆکار هەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی فەرمانی گێڕانەوەی متمانە:

**یەکەم:** دەرکەوتنی ئەو راستییەی کە حوکمدراو چەند حوکمێکی تری دژ دراوە جگە لەو حوکمەی متمانەی پێدراوەتەوە، بە بێ ئەوەی ئەو دادگایەی کە متمانەکەی پێبەخشیوەتەوە ئاگای لەو حوکمانەی تر بووبێت لە کاتی گێڕانەوەی متمانەکەدا .

**دووەم:** بریتییە لە دەرچوونی حوکمێك پاش گێڕانەوەی متمانە لەبەر تاوانێك کە حوکمدراو کردوویەتی پێش گێڕانەوەی متمانە .

لە کۆتاییدا یاسا رێگا نادات لە جارێك پتر گێڕانەوەی متمانە ببەخشرێت بە حوکمدراو، کەواتە ئەگەر متمانە گێڕرایەوە بۆ حوکمدراو و پاشان حوکمێکی تر درا، ئەوا نابێت متمانەی بۆ بگەڕێنرێتەوە سەبارەت ئەم حوکمەی دوایی .

وە ئاشکرایە هەموو ئەو باروبۆخانەی لەم باسگەدا بەڵکو لەم بەندەدا هێنامان، باروبۆخی کاریگەرن، بۆیە لە رووی فەلسەفییەوە بە هەریەك لەمانە دەوترێت کردار(فعل)، وە کاریگەربوون پێشی بە کارتێکران( انفعال) و شوێنەواری پێکگەشتنی ئەم دوانەش پێیان دەوترێت ئەنجام و فەلسەفە، چ توندکردنەوە بێت یان سووککردن یان لێبوردن بێت .

لێرەدا لێکۆڵینەوەی بەرپرسیاریەتی جەزایی لە ژێر تیشکی وتەزاکانی ئەرستۆدا( کردار و کارتێکرانی فەلسەفی)تەواو بوو . وا لێرەبەدواوە بەیارمەتی خودا لێکۆڵینەوەی بەرپرسیاریەتی مەدەنی باس دەکەین لە ژێر تیشکی وتەزاکانی ئەرستۆدا (کردار و کارتێکرانی فەلسەفی) . داوا لە پەروەردگاری مەزن دەکەم یارمەتیم بدات بۆ تەواوکردنی ئەویەشانەی کە ماون لە لێکۆڵینەوەی بەرپرسیاریەتی یاسایی . بێگومان خودای مەزن توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت .

# دەروازەی سێهەم

## فەلسەفەی بەرپرسیاریەتی مەدەنی لە ژێر تیشکی کردار و کارتێکرانی فەلسەفیدا

لە لێکۆڵینەوەی بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا گرنگی بە سێ خاڵی سەرەکی دەدەین:

یەکەم/ سازاندنی بەرپرسیاریەتی مەدەنی .

دووەم/ کاریگەریی کرداری بەجێنەهێنانی پابەندبوون و کارتێکرانی ویست .

سێهەم/ کاریگەریی کرداری بەجێنەهێنانی پابەندبوون و کارتێکرانی دروستکەر و پاڵنەری هەڵسوکەوتی یاسایی .

بۆ لێکۆڵینەوە لە هەریەك لەم خاڵانە لە رووی فۆرم و بابەتەوە بەندێك تایبەت دەکرێت .

# بەندی یەکەم:
# سازاندنی بەرپرسیاریەتی مەدەنی

کاریگەریی کردار و کاریگەربـوونی کارتێکرانی فەلسەفی رۆڵێکی دیاریان هەیە لە دروستـبـوونی بەرپرسیاریەتی مەدەنیدا. کاریگەریی کردار زۆرجار لە کەسێکی سروشتییەوە دەبێت، رەنگە هەندێکجاریش لە کەسێکی مەعنەوییەوە یان رووداوێکی سروشتیەوە بێت.

ئەگەر تێکدانی پابەندبـوونێکی گرێبەستیی (عقدی) بێت ئەوا بەرپرسیاریەتەکەش گرێبەستی یە و پابەندبـوونیش تایبەت دەبێت بەرانبەر تاکێك یان گروپێك .

وە ئەگەر تێکدانی پابەندبـوونێکی یاسایی بێت ئەوا بەرپرسیاریەتەکە کەمتەرخەمی دەبێت و پابەندبـوونەکەش گشتی دەبێت بەرانبەر هەمـوو خەڵکی.

تێکدانی پابەندبـوونی گرێبەستیی بەپێی ئەو پابەندبـوونانەی لە گرێبەستەکانەوە بەدیدێت دەگۆرێت، بە پێچەوانەی تێکدانی پابەندبـوونی یاساییەوە کە تەنها یەکدانەیە و بریتیی لە پەیمانێکی شەرعیی یان یاسایی دەدرێت کە هیچ زیانێك بە کەسانی تر نەگەیەنرێت بە بێ پاساوی شەرعی یان یاسایی. کەواتە بە گۆرانی بابەتی پابەندبـوون و پابەندپێدراو ئەو ناگۆرێت.

ئەوەی لەم پێشەکییەدا باسمان کرد راجیایی زانایانی یاسای تێدا نییە. بەڵکـو راجیایی لە سازاندنی بەرپرسیاریەتی مەدەنیدایە، کە ئایا بە (گرێبەستیی ـ عقدی) یان (کەمتەرخەمی ـ تقصیری)بێت یەك دانەیە، یان دەکرێت بە دووبەشی جیاوازەوە لە تـوخم و حـوکمەکانیدا، کە بەرپرسیارییەتی گرێبەستی و کەمتەرخەمییە. ئەم جیاوازییەش لە دوو تـیـۆردا دەردەکەوێت: تیۆریی

شـوێنکەوتەیی - تقلیدی -(یان تیۆری جـووتبەرپرسیارییەتی مەدەنی)، و تیۆری نـوێ (تیۆری تاکبەرپرسیارییەتی).

لایەنگرانی تیۆری شـوێنکەوتەیی باوەڕیان بە سازاندنی بەرپرسیارییەتی مەدەنی هەیە لەگەڵ جـووتبەرپرسیارییەتی و جیاکردنەوەی دووبەشی ناوبراو لە یەکدی و لە رووی تـوخمەکان و شـوێنەوارەکانەوە.

کۆمەڵەکەی تر رایان وایە کە بسازێنرێت لەگەڵ یەك بەرپرسییارێتی مەدەنیدا چ تێکدانی پابەندبـوونی گرێبەستی بێت یان تێکدانی پابەندبـوونی یاسایی بێت.

هەندێك لە زانایانی یاساش هەوڵی یەکخستنی ئەم دوو ئاراستە پێچەوانەیان داوە و هەوڵی پەیداکردنی ناوەندێکی مامناوەندیان داوە کە حـوکمەکان و تـوخمەکانی هەردوو بەرپرسییارییەکە بگرێتەوە.

لەسەر بناغەی ئەم وردەکارییانە بەرپرسییارییەتی مەدەنیمان لە سەر بناغەی کردار و کارتێکران دابەشکردووە بۆ سێ باسگە: یەکەمیان تایبەت کراوە بۆ بەڵگەکانی جـووتبەرپرسییاریەتی مەدەنی، دووەمیش بۆ بەڵگەکانی لایەنگرانی یەکبـوونی بەرپرسییارییەتی مەدەنی، لە سێهەمیشدا ئاراستەی رێکخەر باس دەکەین لەگەڵ هەڵسەنگاندنمان بۆ جیاوازیەکان.

# باسگەی یەکەم:
# گرنگترین بەڵگەکانی
# لایەنگرانی جووتبەرپرسیاریتی

لایەنگرانی جووتبەرپرسیارییەتی بەڵگەیان لەسەر جیاوازی بەرپرسیارییەتی (گرێبەستی و کەمتەرخەمی) هێناوەتەوە و بەڵگەیان لەسەر ئەوەش هێناوەتەوە کە هەریەك لەمان بەشێکی سەربەخۆی بەرپرسیاریتی یاسایین، بە هۆی بوونی چەند جیاوازییەکی بناغەییەوە لە نێوانیاندا کە گرنگترینیان بریتییە لەم بەڵگانە[1] :

**یەکەم: لە رووی بناغەوە:**

بەرپرسیارییەتی گرێبەستیی لەسەر بناغەی تێکدانی پابەندبوونێکی گرێبەستیی تایبەتەوە دەبێت کەتاکێك یان گروپێك دەیکات، بەڵام بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمی لە سەر تێکدانی پابەندبوونی یاسایی بەرانبەر هەموو خەڵکی، هەموو مرۆڤێك پابەند دەبێت بەوەی بە بێ هۆ زیان بە هیچکەسێك نەگەیەنێت.

**دووەم: لە رووی سروشتەوە:**

پابەندبوونی گرێبەستی بەپێی جیاوازی ئەو پابەندبوونانە دەگۆڕێت کە پەیوەندییان بە گرێبەستەکەوە هەیە و بەپێی جیاوازی گرێبەستەکان دەگۆڕێت، بەڵام پابەندبوونی یاسایی جێگیرە و ناگۆڕێت، چونکە بریتییە لە پەیماننامەیەك کە یاسا فەرزی دەکات لەسەر هەموو مرۆڤێك کە نابێت زیان بە هیچکەسێك بگەیەنێت ئەوکەسە هەرکەسێك بێت بە بێ پاساوێکی شەرعی یان یاسایی.

---

[1] لە بارەی ئەم بابەتەوە سەیری پەرتووکی الوسیگ/٨٤٨ وپاشتر بکە، نووسینی مامۆستا عبدارزاق السنهوری.

وە مامۆستای دوکتۆر سلیمان مرقس لە پەرتووکی الواف فی شرح القانون المدنی/٢ فی الالتزامات ، بەرگی دووەم، الفعل الضار و المسئولیة المدنیة . لا ١٧ و پاشتر.

وە مامۆستای دوکتۆر حسن الذنون: المبسوط في المسئولية المدنية ـ الضرر لا ٦١ و پاشتر.

د . عبدالحي الحجازي: موجز النظرية العامة للالتزام ـ المصادر غير الارادية ـ بند (٥) و پاشتر.

**سێهەم: لە رووی شیاویەتیەوە:**

لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەهلییەتی تەواو بە مەرج گیراوە، چونکە دروستیی گرێبەستی لەسەر وەستاوە کە هۆی پابەندی یان سەرچاوەی پابەندییە.

بە پێچەوانەی شیاویەتی بەرپرسیاریەتی کەمتەرخەمی کە لە فیقهی رۆژئاوا و ئەو یاسایانەدا کەگاریگەرن پێیانەوە[1] تەنها شیاوییەتی بەجێگەیاندنی ناتەواو(جیاکردنەوە) بە مەرج دەزانن تێیدا. بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەی پێی کاریگەرن،[2] بە هیچ شێوەیەك شیاویەتی بەجێهێنان بەمەرج ناگرن چ تەواو بێت یان ناتەواو. ئەو کەسەی شیاویەتی ناتەواوی بێت وەك شێت و منداڵی ناهەراش(بێ تەمییز) و هەرکەسیش وەك ئەمان وەها بێت، ئەگەر دارایی کەسێکی فەوتاند ئەوا بە بەرپرس دەزانرێت بە بەرپرسیارێتی ناتەواو و دەبێت و ئەگەر پارەی هەبوو بژاردنی لەسەر پێویست دەبێت، وەگەرنا دادگا دەتوانێت وەلی ئەمرەکەی یان سەرپەرشتیارەکەی یان پێسپێراو(وصی)ەکەی ناچاریکات بیبژێرێت، بە مەرجێك لە داهاتوودا بتوانێت ئەو بژاردنە وەربگرێتەوە لەو کەسەی زیانەکەی گەیاندووە.[3]

**چوارەم: لە رووی سەلماندنەوە:**

لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا ئەرکی سەلماندنی هەستان بە پابەندییە گرێبەستییەکانی دەکەوێتە سەر قەرزار پاش ئەوەی خاوەن قەرز سەلماندی کە گرێبەستەکە مەرجی یاسایی تێدایە.

بەڵام لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا پێویستە لەسەر خاوەن قەرز بیسەلمێنێت کە قەرزدار بەرپرسیاریەتیە یاساییەکەی شکاندووە لە رێگەی کارێکی زیانبەخش و نادروستەوە.

---

[1] وەك یاساکانی میسرس و سورس ولوبنانی و کوەیتی.

[2] وەك یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی و ئوردنی و یەمەنی.

[3] مادەی (١٩١) لە یاسای مەدەنی عێراقیدا.

ئەم جیاوازییەش لەسەر ئەو بنەما سەرەکیەوە بونیاد نراوە کە دەڵێت(البينة على من ادعى[1] و اليمين على من انكر) [2]

**پێنجەم: لە رووی بەهانەکانەوە:**

لە بەرپرسیاری مەدەنیدا پێویستە لە پێش سکاڵای داواکردنی مافدا ئاگادارییەك درابێتە قەرزدار بۆ جێبەجێکردنی پابەندییەکانی بەرانبەر ئەو کەسەی شایانی بژاردنەکەیە، بە مەرجێك یاسا دەقێکی پێچەوانەی نەبێت.

بە پێچەوانەی بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمییەوە کە تێیدا زیانلێکەوتوو بە بێ ئاگادارکردنەوەی قەرزار دەتوانێت داوای قەرەبوو بکات. وە نهێنی ئەم جیاوازییەش ئەوەیە کە وێنای عوزرەکان تەنها لە نێوان دووکەسدا دەبێت کە پێشتر پەیوەندییەکی تایبەتییان هەبووبێت(پەیوەندی گرێبەستی) چونکە ناتوانرێت هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە ئاگادار بکرێتەوە.

**شەشەم: لە رووی ئاستی بەرپرسیارییەوە:**

لە بەرپرسیاریەتی گرێبەستیدا کەسی زیانلێکەوتوو مافی بژاردن وەرناگرێت جگە لەو زیانە راستەوخۆ چاوەڕوانکراوەی کە لە کاتی گرێبەستەکەدا روودەدات، ئەمەش ئەگەر پابەندنەبوونەکەی بەهۆی هەڵەیەکی بچووکەوە بوو.

بەڵام ئەگەر لە ئەنجامی فێڵکردن یان هەڵەیەکی گەورەوە بوو، ئەوا پابەند دەبێت بە قەرەبووکردنەوە لە زیانی مادیدا راستەوخۆ چ چاوەڕوانکراو بێت یان نا. [3]

---

[1] چونکە ئیدیعایەك دەکات کە پێچەولنەی ئەسڵە، کە ئەستۆپاکییە.

[2] چونکە لەگەڵ ئەسڵدایە، ئەوەتا مرۆڤ کە لەدایك دەبێت ئەستۆی لە هەر پابەندیەکی تاوانی و مەدەنی خاڵیە، وە پێویستە داوەر وەهای دابنێت کە ئەم خاوێنیە بەردەوامە تاکو پێچەوانەکەی دەسەلمێت.

[3] مادەی (١٦٩) لە یاسای مەدەنی عێراقی دەڵێت:

١ ـ ئەگەربژاردنەکە لە گرێبەستەکەدا یان لە دەقی یاسادا بڕیار نەدرابوو ئەوا دادگا بڕیاری لەسەر دەدات.

٢ ـ وە قەرەبوو کردنەوە بۆ هەموو ئەو پابەندبوونانەی لە گرێبەستەکەوە سەرهەڵدەدات (واتە لە تێکدانی)چ پابەند بوون بێت بە گواستنەوەی موڵکایەتی یان بەرهەمی موڵکێک یان هەر مافێکی ←

**حەوتەم: لە رووی هاوکاری قەرزارەکانەوە:**

ئەم هاوکارییە لە نێوانیاندا نابێت و لە یاساشدا گریمانەی ئەوەش ناکرێت لە بەجێهێنانی پابەندبوونی گرێبەستیدا گەر پێشتر پابەندبوونێك لە ئارادا نەبێت لەو بارەیەوە[1]

لە کاتێکدا هاوکاری لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا بە پێی یاسا بوونی هەیە، وە ئەگەر دووکەس یان پتر لە کردنی تاوانێکی ناڕەوادا بەشدار بوون وبەبێ پاساو زیانیان بە کەسێك گەیاند، ئەوا قەرەبوو لەسەر هەریەکیان پێویست دەبێت و کەسی زیانلێکەوتوو دەتوانێت داوای قەرەبووی تەولو لە هەریەك لەوان بکات، ئەگەر یەکێکیان بژاردی، ئەوا دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر بەشداربووانی تری زیانەکە و داوای وەرگرتنەوەی ئەو بەشانە بکات کە بۆیانی بژاردووە.

**هەشتەم: لە رووی بەخشینی رێکەوتنەوە لە بەرپرسیارییەتی:**

بە شێوەیەکی گشتی بەخشین (اعفاء) لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا دروستە بە مەرجێك لە ئەنجامی فێڵی خاوەن قەرز یان هەڵەی گەورەیەوە سەرپهەڵنەدابێت. بەپێچەوانەی بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمییەوە کە ئەم رێکەوتنە دروست نییە، چونکە پێچەوانەی یاسای گشتییە.[2]

**نۆهەم: لە رووی ئەو ماوەبەسەرچوونەوە کە داواکە هەڵدەوەشێنێتەوە:**

داوای بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمی بە تێپەڕبوونی سێ ساڵ هەڵدەوەشێتەوە لە کاتی

---

بەرجەستەی تر یان پابەندبوونبە کردنی کارێک یان نەکردنی کارێک، وە ئەو زیانانە دەگرێتەوە کە خاوەن قەرزەکە تووشی بووە وە لەدەستدانی ئەو کاسبییەی بە هۆی فەوتانی ئەو مافەی لە سەریەتی یان بەهۆی دواکەوتنی وەرگرتنی" بە مەرجێک ئەمە ئەنجامێکی سروشتی بێت بۆ بەجێنەهێنانی قەرزار بۆ پابەندبوونەکانی یان دواکەوتنی لە بەجێهێنانی.

[1] ئەگەر قەرزارەکە فێڵێک یان هەڵەیەکی گەورەی نەکردبوو ئەوا لەو سنووری چاوەڕوانکراوە تێنابەڕێت لە کاتی گرێبەستەکەدا چ توشبوونی زیان بێت یان لەدەسچوونی کەسابەتێک بێت.

[2] یاسای (٣٢٠)ی مەدەنی: (هاوکاری لە نێوان خاوەن قەرزەکاندا نابێت مەگەر بناغەی رێکەوتن یان دەقێکی یاسایی).

زانینی زیانلێکەوتـوو بە ڕوودانی کارەزیانبەخشەکە و بەو کەسەی کارەکەی کردووە.

لە هەمـوو حاڵەتەکاندا بە تێپەڕبـوونی پانزەساڵ هەڵدەوەشێتەوە، لە ڕۆژی ڕوودانی کارە نادروستەکەوە.

بەپێچەوانەوە، لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا ماف دلواکردنەوەی قەرەبـوو هەڵناوەشێتەوە تا تێپەڕبـوونی پازدە ساڵ.[1]

**دەیەم: لە ڕووی تایبەتمەندییەوە:**

لە سەر بنەمای (قەرز دلوادەکرێت و ناهێنرێت) کە ولتای ئەوەیە پێـویستە لەسەر خاوەن قەرز بڕوات بۆ لای قەرزار و داوای ماف خۆی لێ بکات. ئەو دادگایەی تایبەتە بە سەرنجدان لەم داوایە دادگای شـوێنی شکاتلێکراوە لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا، بەڵام لە داوای بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا دادگای تایبەت بە سەرنجدان لەو بابەتە ئەو دادگایەیە کە کارە زیانبەخشەکە لە بازنەی ژێردەسەڵاتیدا ڕوویداوە.

**یازدەهەم: لە ڕووی ئەو یاسایەوە کە جێبجێکردنی پێـویستە:**

ئەگەر ناکۆکییەك دروست بـوو بە هۆی پابەندبـوونێکی گرێبەستییەوە و تـوخمێك(لایەنێك)ی بێگانەی تێدا بـوو، ئەوا پێـویستە یاسای ئەو وڵاتە جێبەجێ بکرێت کە گرێبەستەکەی تێدا کراوە، ئەگەر وڵاتێکی هاویەشیان نەبوو[2] ئەمە لەکاتێکدا گرێبەستەکە لە سەر داراییەکی گواستراوە بـوو، بەڵام لە خانووبەرەدا(عقار)دا یاسای ئەو شـوێنە جێبەجێ دەکرێت کە مـولکەکەی تێدایە.

بەڵام لە بەرپرسیاری کەمتەرخەمیدا یاسای ئەو وڵاتە جێبەجێ دەکرێت کە ڕووداوی سەرچاوەی پابەندییەکەی تێدایە، ئەگەر ئەم ڕووداوە بەپێی یاسای عێراقی ڕەوا نەبـوو.[3]

---

[1] مادەی (٢٣٢) یاسای مەدەنی: (دلوای قەرەبـووی ئەو زیانانە ناکرێت کە لە ئەنجامی کاری ناڕەواوە سەریهەڵدابێت و هەرچی بێت بە تێپەڕبـوونی سێ ساڵ لەو ڕۆژەوەی زیانلێکەوتـوو زانیـویەتی بە ڕوودانی زیانەکە و بەو کەسەی کە بۆتە هۆی زیانەکە و دلوای قەرەبـووش لە هیچ حاڵەتێکدا نابیسترێت بە تێپەڕبـوونی پازدەساڵ بەسەر کردارە ناڕەواکەدا).

[2] مادەی(٢٥) یاسای مەدەنی عێراقی.

[3] هەمان سەرچاوە مادەی (٢٧).

## باسگەی دووەم:
## بەڵگەی لایەنگرانی تابەرپرسییەتی

بێگومان گرنگترین بەڵگەکانی ئەم ئاراستەیە لە لایەن لایەنگرانیەوە خراوەتە روو و لە پێشەوەی ئەو لایەنگرانەشدا هەردوو ( یاساناس)ی فەرەنسی (بلانیـول و جوسران). وە کارەکانیشیان بریتییە لە رەتکردنە و موناقەشەی بەڵگەکانی لایەنگرانی جووتبەرپرسیاری(بەرپرسیارییەتی گرێبەستی و کەمتەرخەمی) وەك لێرەدا روونی دەکەینەوە:

**یەکەم: لە رووی سروشتەوە:** هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان هەردوو بەرپرسیارییەتییەکاندا، چونکە هەردووکیان لەسەر بناغەی تێکدانی پابەندی وەستاوە، بەبێ رەچاوکردنی هۆکاری ئەم پابەندییە یان سەرچاوەکەی.

**دووەم: لە رووی پادلشتەوە:** پادلشتی تێکدانی پابەندبوون لە هەردوو بەرپرسیارییەتییەکەدا بریتییە لە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی لەم تێکدانەوە دروست بـووە، نابێت تەنها لەبەر ناوەکانیان جیاوازی بخەینە نێوانیانەوە، چونکە گرنگ ناوەڕۆك و کرۆك و ئەنجامە.

**سێهەم: بەڵگە هێنانەوە بەوەی کە جیاوازی لە شیاویەتیدا(ئەهلییەت) هەیە راست نییە**، چونکە ئەم شایستەییە مەرجی بوونی خـودی بەرپرسیارییەتی نییە، بەڵکو مەرجی راستیی گرێبەستە، وە ئەوەی ئەم راستییە پشتراست دەکاتەوە ئەگەر کەسێکی باڵغی عاقڵ گرێبەستێك لەگەڵ کەسێکدا بکات و پاشان شایستەیی(ئەهلییەت) نەمێنێت و زیانێك لە قەرزدەر بکەوێت، ئەوا پێویستە قەرەبووی ئەو زیانە بکرێتەوە سەرەڕای نەمانی پێگەشتنی قەرزارەکە.

کەواتە شایستەیی مەرجی بەدیهاتنی بەدیهاتنی گرێبەستە نەك مەرجی بەرپرسـبوون.

**چوارەم: بەڵگە هێنانەوەبە دووفاقیبوونی ئەو دووبەرپرسیاریە** بەوەی کە لە لایەنی بەرپرس لە سەلماندندا جیاوازی هەیە، ئەم بەڵگەیەش هەڵدەوەشێتەوە بەوەی بـوونی هەریەك لەم دوو بەرپرسیاریەتە لەسەر دیاریکردنی لایەنی بەرپرس لە ئەرکی سەلماندن ناوەستێت، بەرپرسیارییەتی لە راستی و واقیعدا هەیە و سەلماندنیش بەستراوەتەوە بە فەرمانی

دادوەرییەوە. کەواتە دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان سەلماندنی شتێك لە واقیعدا و سەلماندنی لە بەردەم دادگادا.

**پێنجەم: بەڵگە هێنانەوە لەسەر دوانەبوونی بەرپرسیاریەتی مەدەنی** و دابەشکردنی بۆ گرێبەستی و کەمتەرخەمی بە هۆی زەرووڕەتی ئاگادارکردنەوەی قەرزار لە لایەن خاوەنقەرزەوە پێش ئەوەی قەرەبووەکەی لیّ وەربگیرێت لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا و نەبوونی ئەم زەرووڕەتە لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا. ئەم بەڵگەیەش بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە بوونی ئاگادارکردنەوە زەروور نییە لە پابەندبوونە سلبییەکاندا ئەگەر قەرزارەکە ئەو پابەندبوونەی تێکدا لە هەردوو بەرپرسیارییەتیدا. ئەوەی ئاشکرایە کە پابەندبوون لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا هەمیشە سلبییە کە بریتییە لەو پەیماندانەی لە یاسادا گریمانەکراوە کە خۆبپارێزێت لە زیانگەیاندن بە کەسانی تر، هەروەها پابەندبوونە گرێبەستییەکان نەرێنی دەبن کە بریتییە لە خۆبەدوورگرتن لە دوانخستنی رادەستکردن و دەستکاری نەکردنی شتی فرۆشراو لە لایەن فرۆشیارەوە.

ئاگادارکردنەوەی خاوەنقەرز بۆ قەرزار پێویستە ئەگەر بابەتی پابەندبوونەکە پێدانی شتێك بێت یان کردنی کارێك بێت یان هەر شتێکی لەم بابەتە، کەواتە ئاگادارکردنەوە پێویست نییە بۆ دروستبوونی بەرپرسیارییەتی چ گرێبەستی بێت چ کەمتەرخەمی. جیاوازی لە پێویستبوونی ئاگادارکردنەوە و پێویستنەبوونی بەستراوەتەوە بە راجیایی لە ئەرێنیبوونی پابەندبوون و نەرێنیبوونی، نەك بە دروستبوونی بەرپرسیارییەتییەوە، جگە لەمەش یاسا باسی لە ناپێویستبوونی ئاگادارکردنەوە کردووە لە هەندێك حاڵەتدا وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا:

أ ـ ئەگەر جێبەجێکردنی پابەندییەکە جێبەجێکردنێکی بەرجەستەی مومکین بوو بە هۆی کرداری قەرزارەوە، بە تایبەتی ئەگەر چێوەی پابەندبوونەکە گواستنەوەی مافێکی بەرجەستە بوو یان کردنی کارێك بوو و دەبوا لە کاتێکی دیاریکراودا جێبەجیّ بکرابایە، کاتەکە تێپەڕی بەڵام جێبەجیّ نەکرا یان پابەندبوونەکە رێگرتنبوو لە کارێك و قەرزارەکەش ئەم پابەندبوونەی نەپاراست.

ب ـ ئەگەر چێوەی پابەندبوونەکە قەرەبوویەك بوو لە ئەنجامی کارێکی نادروستەوە هاتبوویە ئاراوە.

ج ـ ئەگەر چێوەی پابەندییەکە گێڕانەوەی شتێك بوو قەرزارەکە دەیزانی کە دزراوە یان شتێك بە ناحەق و بە ئاگاداری خۆی گەشتۆتە دەستی.

د ـ ئەگەر قەرزارەکە بە نووسین ڕایگەیاندبوو کە نایەوێت پابەندبوونەکەی جێبەجێ بکات.[1]

**شەشەم: بەڵگەهێنانەوە بە جیاوازی لە ئەندازەی بەرپرسیاریەتی لە قەرەبووکردنەوەدا لە سەر جیاوازی نێوان ئەو دوو بەرپرسیارییەتیەدا.** وەڵامی ئەمەش بەوە دەدرێتەوە کە هۆی نەگرتنەوەی قەرەبوو لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا بۆ زیانی چاوەڕواننەکراو عادەتەن لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستدا ئەوەیە کە ئەم زیانە بە بیری دوولایەنی گرێبەستەکەدا نەهاتووە لە کاتی گرێبەستەکەدا، چونکە چاوەڕوانی شتی وەهایان نەکردووە لەو کاتەدا و گرێبەستەکە لە سەر ئەوبناغەیە بونیاد دەنرێت کە هەریەکەیان پاش گرێبەستەکە پابەندبوونی خۆی جێبەجێ دەکات.

**حەوتەم: بەڵگە هێنانەوە بە بوونی هاوکاری لە نێوان قەرزارەکاندا لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا و نەبوونی لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا بۆ سەلماندنی جیاوازی ئەم دوو بەرپرسیارییەتییە.** ئەمەش وەڵام دەدرێتەوە بەوەی کە بناغەی هاوخەمی نێوان قەرزارەکان لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا بریتییە لە ڕوودانی زیان، تاوەکو هۆکار هاویەش بێت لە نێوان زیانهێنەرەکاندا بە هۆی هاوکارییەوە، ئەوا قەرەبووش هاویەش دەبێت بە هەمانشێوە.

**هەشتەم: بەڵگە هێنانەو لەسەر جووتبەرپرسیاری بە دروستی بەخشینی ڕێکەوتەنی لە بەرپرسیارێتی گرێبەستیدا و بە ناڕەوادانانی لە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا.** وەڵامی ئەمەش بەوە دەدرێتەوە سەرچاوەی ڕەوابوون و ناڕەوابوون هەر یاسایە نەك سروشتی بەرپرسیارییەکە، چونکە یاسا بڕیار لەسەر حوکمەکانی دەدات کە بەشێکە لە سیستەمی گشتی و دروست نییە کە ڕێکەوتن بکرێت لەسەر سەرپێچی کردنی.

[1] مادەی (٢٥٨) لە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی .

**دووهەم**: جیاوازی لە ماوەی (کاتبەسەرداچوون ) ی هەڵوەشێنەوەی بەرپرسیارییەتی نابێتە بەڵگەیەك لەسەر پێکەوەبوونیان، چونکە ئەم جیاوازییە لە ماوەدا ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازییان لە سروشتی بەرپرسیارییەتیدا، بەڵکو یاسادانەر خۆی ئەو بڕیارە دەدات بە چەند بەڵگەیەکی گونجاوی خۆی و تەنهایی و پێکەوەبوون هیچ ڕۆڵێکیان تێیدا نییە[1]

## باسگەی سێهەم:
## گونجاندنی دووئاراستەکە و
## هەڵوێستی ئێمە دەربارەی بابەتەکە

ئاراستەیەکی سێهەم هەیە کە دەیەوێت لە نێوان ئەو دووئاراستە دژ بەیەکەدا کە لە دوو باسگەکەی پێشوودا باسمانکرد گونجاندنێك دروست بکات لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئاراستەیەکی مامناوەندی میانڕەوە. بەڵگەی لایەنگرانیشی ئەوەیە کە سەرەڕای هەبوونی جیاوازی بنەڕەتی لە نێوان هەردوو بەشی بەرپرسیارییەتی مەدەنیدا، بەڵام هەردووکیان پاداشتی کارێکی ناڕەوان کە لە هەردوو بەشەکەدا بەجێنەهێنانی ئەرکێکی یاساییە، چونکە سەرچاوەی پابەندبوون لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستی و کەمتەرخەمیدا بەریتییە لە یاسا، تەنانەت ئەوکەسانەش کە باوەڕیان وایە سەرچاوەکە لە گرێبەستیدا بریتییە لە گرێبەستەکە ئینکاری ئەوە ناکەن کە یاسا سەرچاوەی بنەڕەتیە گەر چی بە شێوەیەکی ناڕستەوخۆش بێت، گشتیبوونی پابەندبوون لە کەمتەرخەمیدا و تایبەتبوونی لە گرێبەستیدا هیچ کاریگەرییەکی نییە. هەروەها هیچ جیاوازییەك نییە لە ئەسڵی پێکهاتەی هەردوو بەرپرسیارییەکەدا بە هۆی جیاوازی لە سەلماندن یان لە ڕووی پێگەشتنەوە یان بەهانەکانەوە یا ئەو دۆخانەی تر کە لایەنگرانی جووتبەرپرسیاریی باسیان کردووە.

لەگەڵ هەموو ئەوەشدا ئەو دوو بەرپرسیاریەتیە جیاوازن، هەر بۆ نموونە پابەندبوونی گرێبەستیی پەیوەندییەکە لە نێوان دووکەسدا کە پێناسەی ئەم جۆرەیان بەو پەیوەندییە کردووە، بەڵام پابەندبوونی کەمتەرخەمی ئەو پابەندبوونەیە کە لەسەر ڕوودانی کارێکی

[1] بۆ بەڵگەکانی لایەنگرانی جووتبەرپرسیاری بگەڕێوە بۆ سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی پێشوو .

زیانبەخش وەستاوە ولتە لەسەر کارێکی نادروست جگە لە زیان و پەیوەندی هۆکارییەتی لە نێوانیاندا.

بۆیە ئەوە بە ئەرکێکی یاسایی دادەنرێت نەك بە پەیوەندی، کەولتە پێویستە هەموو زیانێك قەرەبوو بکرێتەوە چ چاوەڕوانکراو بێت چ چاوەڕوان نەکرلو، مادام زیانەکە راستەوخۆ بێت.

لە چەند روویەکەوە رەخنە لە ئاراستەی سێهەم گیرلوە وەك ئەوی کە بەرپرسیارییەتی مەدەنی چ گرێبەستی بێت چ کەمتەرخەمی بە پاداشت دلنانرێت بە ولتا وردەکەی، چونکە پاداشت لە هەردوو بەرپرسیارییەتییەکەدا قەرەبووکردنەوەیە، ئەگەر پاداشت بەرپرسیارییەتی بوایە ئەوا هیچ جیاوازییەك نەدەبوو لە نێوان بەرپرسیارییەتی سزایی و مەدەنیدا.

**هەڵوێستی ئێمە دەربارەی بابەتەکە:**

**یەکەم:** پابەندبوون لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستیدا پەیوەندی نێوان دووکەس نییە لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

أ ـ پابەندبوون لە گرووپی گوێڕایەڵی و کارلێکەریە بەڵام پەیوەندی نێوان قەرزلر و خاوەنقەرز لە گرووپی تۆباڵییە(ئیزافەیە) ، ولتە حاڵەتێکی یاساییە لە نێوان خاوەنقەرز و قەرزدلردا کە کەسیان بە بێ ئەوی دی وێنا ناکرێت، ئەم دوو گرووپە ناتەریبن و کەسیان بەوی دی پێناسە ناکرێت، چونکە پێویستە پێناسە و پێناسەکرلو یەکسان بن ولتە لە خودیدا یەك بن و لە ئیعتیباردا جیاواز، وەك پێناسەی تاوان بەوەی کە ئەو قەدەغەکرلوەیە کە سزای لەسەر دەدرێت.

ب ـ پابەند بوون سیفەتێکی تایبەتە بە قەرزلرەوە و پەیوەندی یاساییش سیفەتێکی هاوبەشە لە نێوان قەرزلر و خاوەنقەرزدا. کەولتە ناتوانین پێناسەی سیفەتێکی تایبەت بکەین بە سیفەتێکی هاوبەش، چونکە نە لە زاتی خۆیاندا و نە لە ئیعتیباردا یەك نین.

**دووەم:** هەریەك لەم دوو ئاراستە دژ بە یەکە راست و گونجاوە لەگەڵ واقیعدا لە روویەکەوە و ناراست و پێچەوانەی واقیعە لە روویەکی ترەوە، هەوەك لەم روونکردنەوەیەی خوارەوەدا روونی دەکەینەوە:

أ ـ ئەگەر مەبەست لە دابەشکردنی بەرپرسیارییەتی بۆ گرێبەستی و کەمتەرخەمی دابەشکردنی ئیعتیباری بێت، ئەوا لایەنگرانی ئەم دابەشکردنە و جووتبەرپرسیارییەتی لەسەر

هەقن، چونکە هەریەك لەم دوو بەرپرسیارییەتییە لەوی دی جیاوازە لە ماهییەت و مەفهومدا لە زیهنی مرۆڤدا، لە رووی پیادەبوونەوە لە مەسەلە و دۆزە مەدەنییەکاندا هەندێکجار لە هەندێك حاڵەت و لە هەندێك سیفاتدا کۆدەبنەوە و ئەمەش وڵتای دابەشکردنی ئیعتیبارییە. هەندێکجار یەك کردار لە یەك کاتدا و لە یەك مەسەلەدا دەبێتە تێکدەری پابەندیی گرێبەستی و تێکدەری پابەندبوونی یاسایی.

لە نموونەکردارییەکانی، هەڵەی ئەو کەسەیە کە شتێکی بە کرێ گرتووە و بە هۆی هەڵەیەکیەوە شتە بەکرێگیراوەکە دەفەوتێت، هەڵەی خاوەنی هۆکاری گواستنەوە کە دەبێتە هۆی بریندارکردنی نەفەر ، بێگومان لەم حاڵەتە واقیعییانەدا مەرجەکانی بەرپرسیارییەتی گرێبەستی و کەمتەرخەمی پێکەوە تێدایە و بوونی مەرجەکانی یەکێك لە بەرپرسیارییەتییەکان لە کردارێکی زیانبەخشدا و بوونی مەرجەکانی بەرپرسیارییەکەی تریش نژلیەتی دروست ناکات، کەواتە خاوەنقەرز لەم جۆرە حاڵەتەدا دەتوانێت هەردوو قەرەبوو بەدەست بهێنێت.[1]

ب ـ ئەگەر مەبەست لە دابەشکردن دابەشکردنێکی راستەقینە بێت، کە بریتییە لەوەی هەر بەشێك پێچەوانە بێت لەگەڵ بەشەکەی تر لە زیهندا بە پێی مەفهووم و ماهییەت، لە دەرەوەی زیهندا بە پێی پراکتیزەبوون، لایەنگرانی قبووڵنەکردنی ئەم دابەشکردنە لەسەر هەقن، چونکە بەرپرسیارییەتی گرێبەستی و کەمتەرخەمی لە رووی پراکتیزەبوونەوە پێچەوانەی یەکدی نین، سەرەرای نەگونجانیان لەگەڵ یەك لە مەفهوم و ماهییەتدا لە زیهندا، بەڵکو زۆرجار کۆدەبنەوە لە یەك رووداودا کە ملکەچی رێکخستنی یاساییە وەك باسمان کرد.

نموونەی دابەشکردنی راستەقینە دابەشکردنی ژمارە بۆ تاك و جووت و دابەشکردنی گۆشەکانی سێگۆشە بۆ گۆشەی وەستاو و تیژ و کراوە، دابەشکردنی گرێبەست لە مەسەلە مەدەنییەکاندا بۆ گرێبەستی بەتاڵ و راست، وە دابەشکردنی گرێبەستی راست بۆ وەستاو و بەرکار(نافذ)ی پێویست و بەرکاری ناپێویست.

یاسادانەری عێراقی ئەم دابەشکردنە چواریەشییەی بەکارهێناوە لە یاسای مەدەنی قبوولکراو لە مادەکانی(١٣٣ ـ ١٤١) لە ژێر کاریگەریی زانایانی شەریعەتی ئیسلامدا. بەڵام لە یاسای ئێستای باری کەسییەتی عێراقیدا دابەشکردنە پێنج بەشییەکەی گرێبەستی بەکارهێناوە

---

[1] الاستاذ الدكتور سليمان مرقس ـ لصول الالتزامات ل ٣٣٨.

کە بریتییە لە(بەتاڵ و نادروست و ڕاست کە ئەمیش دابەشدەکرێت بۆ وەستێنرلو و قبولکراوی پێویست و قبوولکراوی ناپێویست) هەروەك لە مادەی(٦ و ٢٢) دا هاتووە و لە ژێر کاریگەریی مەزهەبی ئیمامی ئەبوحەنیفەدایە(رەحمەتی خودای لەسەر).

ئەوەی شایانی باسە کە دابەشکردن لە زۆرینەی زارلوە یاساییەکانی هەموو یاساکاندا دابەشکردنێکی گوێرەیی(اعتباری) یە، چونکە بەشەکان نەگونجاون لە زیهندا لە ڕووی مەفهووم و ماهییەتەوە و دژیەك نین لە بوونی واقیعییان لە دەرەوەی زیهندا، وەك دابەشکردنی یاسا بۆ گشتی و تایبەت و دابەشکردنی ماف بۆ بەرجەستە(عینی)و کەسیی(شخصی) و دابەشکردنی بەرپرسیارییەتی بۆ تاوانکاری و مەدەنی زۆربەی دابەشکردنە یاساییەکانی تر.

لە ئەنجامدا دەڵێم کە پەیوەندی لۆجیکی نێوان دابەشکردنەکان  لە هەموو دابەشکردنەکاندا ئیعتیبارییە، گشتگیری و تایبەتبوونە لە ڕوویەکەوە، لە هەندێك پیادەکردندا یەکدەگرنەوە و لە هەندێکی تردا جیادەبنەوە. بۆ نموونە: بەرپرسیارییەتی تاوانکاری و مەدەنی لە تاوانە داراییەکاندا کۆدەبنەوە، ئەگەر کەسێك ئۆتۆمبیلێکی دزی و بە دەستییەوە فەوتا، ئەوا بەرپرسیارییەکەی تاونکارانەیە لە ڕووی سزاوە و مەدەنییە لە ڕووی قەرەبووەوە. هەروەها فەوتاندنی شتێکی بەکرێگیراو لە لایەن بەکرێگیرەوە، بەرپرسیارییەکەی لە جۆری کەمتەرخەمییە لە ڕووی فەوتاندنەکەوە و گرێبەستییە لە ڕووی پابەندبوونیەوە بە پارێزگاریکردن لە هەموو بەشێکی شتە بەکرێگیراوەکە.

بەڵام پەیوەندی لۆجیکی لە نێوان بەشەکانی دابەشکردنی ڕاستەقینەدا  لە هەموو حاڵەتەکاندا ناکۆکن و دژیەکن، ئەوەتا ژمارەی تاك پێچەوانەی جووتە و هەر گۆشەیەکی سێگۆشە لەگەڵ گۆشەکانی تردا بە ڕەهایی ناکۆکە و لە هەموو حاڵەتەکانیشدا هەر وەهایە.

# بەندی دووەم:
# کاریگەریی تێکدانی پابەندی و کاریگەربوونی ویست و شوێنەوارەکانیان لە ژێر تیشکی کردار و کارتێکرانی فەلسەفیدا

ویستی ئەو دووکەسەی گرێبەستێك ئەنجام دەدەن لە کاتی ئەو کارەدا هەندێك جار دەکەوێتە ژێر کاریگەریی چەند عەیبێکەوە  کە لای زانایانی یاسا بە عەیبەکانی ویست(یان رەزامەندی) ناسراوە بە پێی جیاوازی دەربڕینەکان، بەناوبانگترینیشیان :

(زۆرلێکردن ، هەڵخەڵەتاندن ، ئیستیغلال ، هەڵە).

بەڵام ناونانی ئەم کردارانە بە عەیبەی ویست(جگە لە عەی) هەڵەیەکی بڵاوە، چونکە ئەمانە هۆکاری ناتەواویەکانی (عەیبەکانی) ویستن نەوەك خودی عەیبەکان .

زۆرلێکران کردارێکە لەسەر (زۆرلێکەر ) وەستاوە و سیفەتی ئەوە، بەڵام عەیبەکە سیفەتی ویستی کەسی زۆرلێکراوە و لەسەر ئەو راوەستاوە.  هەردوو سیفەتەکەش جیاوازن لەبەر جیاوازی خاوەن سیفەتەکانیان، هەڵخەڵەتاندن و ئیستیغلالیش بە بەهەمانشێوە، وەك لە جێگای خۆیدا باسی دەکەین.

هەر یەك لەو دوانەش وارسێکی سەربەخۆیە و لەسەر جەوهەرێکی سەربەخۆ راوەستاوە و لە جێگایەکی جیاواز لە جێگای جەوهەرەکەی تر،  بنەمای فەلسەفیش دەڵێت(هەرگیز ئەوە روونادات کە وارسێك لە یەك کاتدا لە دوو شوێندا هەبێت).

عەیبەکانی ویست(یان رەزامەندی) وەك لای ئەو سەرچاوە یاساییانەی لەناو یاساناساندا هەیە چواردانەن هەر وەك باسمان کرد، بۆیە لە چوار باسگەدا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت، هەر باسگەیەك بۆ یەکێك لەو ناتەواوییانە تایبەت دەکرێت.

# باسگەی یەکەم:
# کاریگەریی بارودۆخی عەیبەی زۆرلێکردن و کارتێکرانی ویست و شوێنەوارەکانیان

زۆرلێکردن: کارێکی نادروستە و تێکدانی پابەندبوونە بە یاسایەکی گشتییەوە کە پەیماندانی هەموو مرۆڤێکە - بە گریمانەی(افتراض) یاسا - بەوەی هیچ زیانێکی مادی یان مەعنەوی بەکەس نەگەیەنێت بە بێ پاساوێکی شەرعی یان یاسایی.

ئەو زۆرلێکردنەی تێکدانی پابەندبوونە لە هەڵسوکەوتە یاسایی و رووداوە یاساییەکاندا پێناسە کراوە بەوەی: فشارێکی نایاساییە ویستی یەکێك لە خاوەن گرێبەستەکان پێی کاریگەر دەبێت بۆیە ناچار دەبێت بە ئەنجامدانی گرێبەستەکە[1]

وە زۆرلێکران دابەشدەکرێت بۆ دوو جۆر :

یەکەم : پەنابڕ ، لە لای زانایانی یاسا بە زۆرلێکردنی مادی(بەرجەستە) ناودەنرێت، کەبریتییە لەوەی هۆکارێکی تێدا بەکاردەهێنرێت بە شێوەیەك کە رەزامەندی دەشێوێنێت و ویست ئیفلیج دەکات، وەك ئەوەی کەسێك بەزەبری هێزێك دەستی کەسێك دەگرێت و دۆکیومێنتێکی هەڵبەسراوی پێ واژۆ دەکات.

دووەم : زۆرلێکرانی ناپەنابڕ، زانایانی یاسا پێی دەڵێن زۆرلێکرانی مەعنەوی، کە بریتییە لەوەی کەسێك هەڕەشە لە کەسێك دەکات یان لەکەسێکی خۆشەویستی، بە ترسناکییەکی هەنووکەیی ئەگەر کارێك نەکات یان لە کارێك دوور نەکەوێتەوە.

رەزامەندی و هەڵبژاردن دوو توخمی مەعنەوی هەڵسووکەوتە یاساییەکانن - هەروەك دەربڕینی - پێدان(ایجاب) و قایلبوون(قبول) - دوو روکنی زارەکین -. هەرکات ئەم دووانە

---

[1] لە بابەتی زۆرلێکردن و کاریگەری لەسەر ویست لە هەڵسووکەوت یاساییەکاندا بۆ ئەم سەرچاوانە بگەڕێوە:
یاسای مەدەنی فەرەنسی(م ١١١١ - ١١١٥)، عێراقی (م ١١٢ - ١٢٩)، (میسری (١٢٧ - ١٢٨)" سوری(م ١٢٨ - ١٢٩)، لیبی (م ١٢٧ - ١٢٨)، ئوردونی(م ١٣٥ - ١٤٢)، لوبنانی(م ٢١٠ - ٢١٢)، کوەیتی(م ١٥٦ - ١٥٨)، قەتەری (م ٢٧)، مۆریتانی(م ٦٦ - ٧١)، تونسی (بەندی ٥٣ -٥٤)، مەغریبی (بەندی ٤٦ - ٥٩)، گۆڤاری الاحکام العدلیة (م ) و (مرشد الحیران) (م ٢٨٦ - ٢٩٩).

بەدیهاتن کارەکە دروستە و ئەنجامەکانیشی بەدی دێت، وە ئەگەر بەدی نەهاتن کارەکەش بەتاڵە و هیچ ئەنجامێکی یاسایی یان شەرعی نابێت و وەك نەبوو حسابی بۆ دەکرێت.

ئەگەر هەڵبژاردن هەبوو بەڵام رەزامەندی هەڵوەشایەوە، گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوە. جیاوازی لە نێوان بەتاڵ و هەڵوەشاوەدا ئاشکرایە، چونکە گرێبەستی هەڵوەشاوە بەهۆی مۆڵەتدانەوە دەگۆڕێتەوە بۆ گرێبەستێکی راست، ولە ئەگەر کەسی زۆر لێکراو پاش نەمانی کاریگەریی زۆر لێکردن بڕیاری قبوولکردنی گرێبەستەکەی دا، ئەوا بە راست دادەنرێت و لە کاتی تەواوبوونی گرێبەستەکەوە ئەنجامەکانی بەدیاردەکەونەوە.

بە پێچەوانەی گرێبەستی بەتاڵەوە کە هەرگیز ناگۆڕێت بۆ گرێبەستێکی دروست مەگەر بە سەرلە نوێ دەستپێکردنەوەی و بەدوور لە هۆی بەتاڵییەکەی، وە لقی چوارەم کە بەدیهاتنی راستیی رەزامەندی و نادروستیی هەڵبژاردنە وێنا ناکرێت تێیدا، چونکە بەدیهاتنی رەزامەندی دروست حەتمیبوونی بەدیهاتنی ویستی هەڵبژاردنی لێوە بەدی دێت، بەڵام پێچەوانەکەی وەها نییە.

ئەو کەسەی رووبەڕووی زۆرلێکرانی مەعنەوی دەبێتەوە هەڵبژاردنێکی هەیە گەرچی لە چێوەیەکی تەسکدایە و بریتییە لە کردنی کارەکە یان قبوولکردنی ترسناکییە هەڕەشەپێکراوەکە. بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا رەزامەندییەکەی هەڵوەشاوەیە.

### توخمەکانی زۆرلێکردن:

لە رووی چەندییەتی و چۆنیەتییەوە زانایانی یاسا رای جیاوازیان هەیە:

أ ـ هەندێکیان[1] دەڵێن دوو توخمی هەیە:

یەکەم : توخمی مادی، کە ئەو هۆکارانەن لە زۆرلێکردنەکەدا بەکاردێن.

دووەم: توخمی مەعنەوی، کە بریتییە لە ترس و تۆقین.

ئەم دابەشکردنە ناتەواوە، چونکە توخمەکان لە دوان زۆرترن و هەروەها لە سەر بناغەی پێوەرێکی زانستی بونیاد نەنراون.

---

[1] وەک مامۆستا عبدالرزاق السنهوری: ٣٦٣/١، وە مامۆستا د . حسسن الذنون النظرية العامة للالتزام لا ٨٤ و د . عبدالحی حجازی: النظرية العامه للالتزام ٣١٠/١.

ب ـ وە هەندێکی تریش[1] دەڵێن دوو تـوخمن:

یەکەم: ترس و تۆقین.

دووەم: نادروستیی ترس و تۆقاندن.

ئەم قسەیەش وەك ئاشکرایە لە لۆجیکی یاسایدا وەرناگیرێت، چونکە تۆقاندندن لە خودی خۆیدا رواڵەتێکی نادروستە،چونکە سەرچاوەکەی نادروستە.

ج ـ هەندێکیان[2] بە سێ تـوخمی دادەنێن:

١ ـ هێزێکی فشار بۆ کردنی گرێبەستەکە.

٢ ـ بوونی فشارێك لەسەر یەکێك لە گرێبەستچییان یان لە کەسێکی تر کە گرێبەستچییە سوودوەرگرەکە پێی دەزانێت یان دەتـوانێت پێیی بزانێت.

٣ ـ پێویستە ئەو تۆقینەی لە ئەنجامی هێزی فشارەکەوە دروست بووە بـووبێتە هۆی ئەوەی گرێبەستەکە جێبەجێ بکات.

ئەم ئاراستەیەش ناتەواوە چونکە تـوخمەکانی هەر شتێك راگری ئەو شتەن.

ئەوەی کە روونە ئەوەیە کە زۆرلێکردن بوونی لەسەر پێنج تـوخم وەستاوە کە بریتین لە:

**زۆرلێکەر ، زۆرلێکراو ، زۆر لەسەر کراو ، زۆری پێ کراو ، تۆقین.**

هەریەك لەم تـوخمانەش چەند مەرجێکیان هەیە کە پێویستە بەدیبێت بۆ بەدیهاتنی زۆرلێکران و تێکدانی پابەندبوونی گشتی بەم شێوەیەی خـوارەوە:

**١ ـ مەرجەکانی زۆرلێکەر:**

أ ـ پێویستە بتـوانێت هەڕەشەکە جێبەجێ بکات.

ب ـ پێویستە جیدی بێت لە هەڕەشەکەیدا .

ج ـ پێویستە رووی هەڕەشەکەی بکاتە زۆرلێکراو یان خۆشەویستێکی وەك ژنەکەی یان منداڵەکەی.

---

[1] ١٨ ـ وەك مامۆستا أنور سلطان ـ النظرية العامه للالتزام ١٨٩/١.

[2] ١٩ ـ وەك مامۆستا د . سليمان مرقس ـ أصول الالتزامات لا ١٣٩.

**٢ـ مەرجەکانی زۆرلێکراو:**

أ ـ پێویستە هەڕەشەی ئەوەی لێبکرێت کە ترسناکییەك ئازار بە یەکێك لەو مەسڵەحەتانەی بگەیەنێت کە یاسا دەیپارێزێت یان مەسڵەحەتی کەسێکی خۆشەویستی.

ب ـ خۆی یان بە هاوکاری کەسی تر نەتوانێت دژ بە هەڕەشەکە بووەستێتەوە.

ج ـ گومانی بەهێزی لەسەر ئەوە بێت کە هەڕەشەکە لەوکاتەدا جێبەجێ دەکرێت.

د ـ لە کاتی جێبەجێکردنی ئەو شتەدا کە بەزۆر پێی دەکرێت هیچ نیشانەیەك نەبێت لەسەر ئەوەی کە هەڵبژاردنی خۆی تێدایە.

**٣ـ مەرجەکانی بەزۆر پێ کراو:**

أ ـ پێویستە کردارێکی دیاریکراو بێت .

ب ـ پێویستە کارێکی نادروست بێت، ئەگەر زۆرلێکردن بێت بە دڵنەوەی قەرزێکی کاتهاتوو(حال)ی موستەحەق ئەوا بە زۆرلێکردن دانانرێت.

ج ـ پێویستە ئەو ترسناکییەی هەڕەشە لە قازانج و مەسڵەحەتەکەی دەکات، زۆرتر و بەهێزتر بێت لەو ترسناکییەی بەزۆر رووبەرووی دەبێتەوە، وەك ئەوەی هەڕەشەی مەرگی لێ بکات ئەگەر ئۆتۆمبێلەکەی نەفرۆشێت.

**٤ـ مەرجەکانی زۆرپێکراو یان هەڕەشە پێکراو( ترسناکی ):**

أ ـ پێویستە هەنووکەیی بێت: کەواتە ئەو ترسناکییەی لە داهاتوودا چاوەڕوان دەکرێت بە زۆرلێکرانی یاسایی یان فیقهی دانانرێت.

ب ـ بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجێکی نادروست بێت، بەڵام ئەگەر دروست بێت وەکو ترسناکییەکی چاوەڕوانکراو بۆ ئەو کەسەی بەرگری لە مافێکی تایبەتی یان گشتی دەکات لە ژێر فشارێکدا، ئەمجۆرە زۆرلێکردنە بە چەمکی زاراوەیی ناچارکردنی پێناوترێت.

ج ـ یەکێك لە گرێبەستدارەکان رووبەرووی بێتەوە بە کردەوەی گرێبەستدارەکەی تر یان کەسێکی سێهەم ، گرێبەستداری سوودوەرگر (المستفيد) پێی دەزانی یان دەیتوانی بیزانێت.

د ـ دەبێت گەورە بێت، کەواتە ترسناکییەکی کەم هیچ نرخێکی نییە گەر زیانێکی لێ نەکەوێتەوە ، ئەگەر زیانیش هەبوو کەسی زیانلێکەوتوو قەرەبوو دەکرێتەوە.

**٥- مەرجەکانی ترس یان تۆقین:**

أ- لەسەر بناغەیەکی عەقلانی بێت نەك گومانێکی رووت .

ب - پێویستە بارودۆخی زۆرلێکراو رەچاو بکرێت لە رووی نێرومێ بوونەوە یان گەورەوبچووکی و شارنشینی و گوندنشینی بوونەوە .

ج- پێویستە ئەو ترسە پاڵنەری ئەنجامدانی گرێبەستەکە بێت.

**شوێنەوارەکانی زۆرلێکردن:**

ئەگەر پایەکان و مەرجەکانی زۆرلێکران بەو شێوەیەی باسمانکرد هاتەدی، ئەوا هەندێك شوێنەواری لێوەبەرهەم دێت کە بە پێی ئاراستە جیاوازەکان دەگۆڕێت:

أ- قابیلییەتی بەتاڵبوونەوە: لە فیقهی رۆژئاوادا هەر هەڵسوکەوتێکی یاسایی لە ژێر فشاری زۆرلێکردنێکی نارەوادا بکرێت ئەوا قابیلییەتی بەتاڵبوونەوەی تێدایە.[١]

ب- لە یاسای مەدەنی ئێستای عێراقیدا[٢] کە لەژێر کاریگەریی رای زانای حەنەفی (زوفەر)دایە و بە پێی رای فیقهی شێعەی ئیمامیش[٣] هەڵسوکەوتی یاسایی دەوەستێنرێت و هیچ شوێنەوارێکی لێ بەرهەم نایەت لە ماف و پابەندییەکان مەگەر بە مۆڵەتی کەسی زۆرلێکراو پاش نەمانی شوێنەوارەکانی زۆرلێکران، کە ئەگەر مۆڵەتی دا ئەوا ئەنجامەکانی لە سەرەتای هەڵسوکەوتەکەوە ئەژمار دەکرێت و وەگەر نا بە نەبوو دادەنرێت.

ج- هەڵوەشاوە: هەڵسوکەوتەکە بە هەڵوەشاوە دادەنرێت لەو یاساعەرەبییانەی لە ژێر کاریگەری زۆریەی(جومهور)ی زانایانی حەنەفیدان[٤] .

---

[١] بەتاڵی لە فیقهی رۆژئاوادا بەرانبەر گرێبەستی نافیذی نالازم و گرێبەستی جێبەجێنەکراو (وەستێنراو)ە .

[٢] مادەی (١١٥) لە یاسای مەدەنی ئێستا (هەرکەسێک بە یەکێک لە جۆرەکانی زۆرلێکردن (زۆرلێکردنی ناچار و زۆرلێکردنی چارەدار) زۆرێک بکات بۆ بەدیهێنانی گرێبەستێک ئەوا گرێبەستەکەی جێبەجێ ناکرێت) وە جێبەجێنەکراویش هاوڵاتای وەستێنراوە) .

[٣] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية للعاملي ٢٧٦/١.

[٤] بدائع الصنائع للكاساني ٤٤٨١/٩ ، مرشد الحيران (م ٢٩٧) وە دەڵێت (گرێبەستی زۆرلێکراو گرێبەستێکی هەڵوەشاوەیە و بە مۆڵەتەوە بەستراوە.

ج ـ هەڵوەشاوە: لەو یاساعەرەبییانەی لە ژێر کاریگەری رای زۆربەی زانایانی حەنەفیدان وەك یاسای مەدەنی ئوردونی[1] و یەمەنی[2] هەڵسوکەوتەکە هەڵوەشاوە دەبێت.

ئەوەی شایانی باسە کە هەڵوەشاوە بە هۆی زۆرلێکرانەوە مۆڵەتی پێوە دەنووسێت و ئەگەر خاوەنەکەی پاش نەمانی شوێنەواری زۆرلێکردنەکە مۆڵەتی بەردەوامبوونی دا ، ئیتر دەبێتە گرێبەستێکی دروست.

د ـ بەتاڵ : هەڵسوکەوتی زۆرلێکرلو بەتاڵە لە لای شافیعییەکان[3] و زەیدییەکان[4] و زاهیرییەکان و ئەبازییەکان و هیچ یاسایەکی عەرەبی ئەم ئاراستەیەی وەرنەگرتووە.

هـ ـ تەولوکراوی ناپێویست لە لای مالیکییەکان[5]: واتە گرێبەستی زۆرلێکرلو راستەو ئەنجامەکانیشی لێوە بەرهەم دێت، بەڵام قابیلی هەڵوەشاندنەوەیە لە لایەن ئەو لایەنەوە کە زیانی بەرکەوتووە وهیچ قازانجێکی حەتمی تێیدا نییە.

---

[1] وە لە یاسای ئێستای ئوردونیدا هاودژییەکی(تناقض) ئاشکرا هەیە، چونکە کاری بەزۆرکرلو لە یەك کاتدا هەم بە هەڵوەشاوە و هەم بە راگیرلو دادەنێت، وەك لە مادەی (١٤١) دا دەڵێت:( هەرکەس بە یەکێك لە دووجۆرەی ناچارکران ناچار بکرێت بۆ کردنی گرێبەستێك ئەوا گرێبەستەکە دەوەستێنرێت، بەڵام ئەگەر ناچارکرلو یان میراتگرەکانی پاش نەمانی زۆرەکە بە راشکاولنە یان بە ئاماژە مۆڵەتیاندا، ئەوا گرێبەستەکە دامەزرلو دەبێت) واتە لە هەڵوەشاوە وە دەبێتە دروست، چونکە گرێبەستی وەستێنرلو بە راست دانرلوە بەڵام هیچ ئەنجامێکی نابێت تا مەڵەتی بەردەوامی نەدرێت.راست بوو بڵێت: گرێبەستەکە جێبەجێکراوی پێویست لە سەر هەردوولا(نافذ) دەبێت لەبری ئەوەی بڵێت: دامەزرلو دەبێت.

[2] مادەی (١٧٩) ی مەدەننی یەمەنی ژمارە (١٩ بۆ ساڵی ١٩٩٢) دەڵێت(ئەو گرێبەستە دانامەزرێت ـ واتە گرێبەستی هەڵوەشاوە ـ کە لە کەسێکی زۆرلێکرلوەوە بەرهەم هاتبێت وە پێویستە لەسەر کەسی زۆرلێکەر ئەو شتە بگەڕێنێتەوە کە بەزۆر بە دەستی هێناوە) وە تێبینی کە بە دەکرێت کە یاسادانەری یەمەنی باسی گۆڕانی گرێبەستی هەڵوەشاوەی نەکردووە کە بە مۆڵەتدان دەگۆڕێت بۆ گرێبەستی راست، بەڵکو بە گرێبەستێکی بەتاڵی دلناوەلەسەر بناغەی ئوەی کە هەڵوەشاوە و بەتاڵ هاوولتان،ئەمەش رای جومهوری زانایانی شەریعەتی ئیسلامە.

[3] المهذب لابي اسحاق الشيرازي في فقه الشافعي ١/٢٥٧.

[4] شرح الازهار للعلامة عبدالله بن مفتاح ٣/٣.

[5] الشرح الصغير للدردير مع حاشية الصاوي ٢/٤.

## باسگەی دووەم:

## کاریگەریی بارودۆخی ناتەواویی گرێبەست بەهۆی فریودان و کارتێکرانی ویست و شوێنەوارەکانیان

ئاشکرایە کە فریودان(یان چەواشە کردن) بریتییە لە سەرلێشێواندنی یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەستەکە لە لایەن لایەنەکەی ترەوە بە چەند هۆکارێکی فێڵاوییانەوە بۆ ئەوەی بیخاتە هەڵەوە یان بەردەوامبوونی لە سەر ئەوهەڵەیەی کە لە سەریەتی و پاڵنەری گرێبەستەکەیەتی[1].

هەروەها فێڵکردن تێکدانی پابەندبوونێکی گشتییە کاردەکاتە سەر ویستی کەسی فریودراو بە شێوەیەك ئەگەر بزانێت راستی و واقیعەکە چۆنە ئامادەی کردنی ئەو گرێبەستە نابێت، چونکە گرێبەست لە سەر بنەمای هەبوونی تەوخمی رەزامەندی هەردوو لایەنەکەی دەبێت، لە راستیدا رەزامەندی بوونی نییە مادام کرداری کاریگەر(فێڵکردن) لە یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەستەکەدا نارەوایە و ویستی کارتێکراوی لایەنەکەی تریش ناتەواوە بە هۆی هەڵەوە. شوێنەواری کارتێکەر و کارتێکراو چوونە بۆ ئەنجامدانی گرێبەستێك کەسی هەڵخەڵەتێنراو رەزامەندی لەسەر نییە.

زانایانی یاسا کەوتوونەتە هەمان ئەو هەڵەیەوە کە لە ناونانی زۆرلێکردن وەك ناتەواوییەك لە ناتەواوییەکانی ویست (یان رەزامەندی)دا تووشی بوون، وەك پێشتر باسکرا، چونکە فێڵکردنی کاریگەر کردار و سیفەتی فێڵکەرە، بەڵام ناتەواوی(عەیب) کە هەڵەیە، سیفەتی کەسی هەڵخەڵەتێنراوە(گرێبەستکارەکەی تر). لەبەر ئەوەی ئەو دوو خاوەن سیفەتە دووکەسی جیاوازن و لە یەکدی جودان و سەربەخۆن، کەواتە سیفەتەکانیشیان جیاوازن، بە دەربڕینێکی فەلسەفی: هەردووکیان دوو وارس(عەرەز)ی جێگا جیاوازن و بەڵگە نەویستیشە کە یەك وارس لە یەك کاتدا لە دوو جێگادا نابێت.

---

[1] مامۆستا د. سلیمان مەرقس ـ أصول الالتزامات ، سەرچاوەی پێشوو لا ١٨٦ .

لەسەر ئەم بناغەیە، ناتەولوی ویست ئەو هەڵەیە کە یەکێك لە گرێبەستکاران تێی دەکەوێت بە هۆی خڵەتاندن(چەواشە) و سەلێشولندنی لایەنەکەی ترەوە بۆی، کەولتە خودی خەڵەتاندن ناتەولوی(عەیب) نیە بۆ ویست چونکە کرداری کەسە هەڵخەڵەتێنەرەکەیە.

ئەوەی شایانی باسە کە دەستەواژەی(هەڵخەڵەتاندن ـ التغرير) زاراوەیەکی فیقهی ئیسلامی و ئەو یاسایانەیە کەوتوونەتە ژێر کاریگەرییەوە و دەستەواژەی (چەواشەکردن ـ تدليس) زاراوەیەکی فقهی رۆژئاواییە و ئەو یاسا عەرەبییانە بەکاریدەهێنن کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەرییەوە .

## توخمەکانی هەڵخەڵەتاندن:

وەك چەندینجار باسمانکرد توخمی هەرشتێك بریتییە لەوەی کە لە سەری راوەستاوە، چ پایە بێت چ مەرج .

زانایانی یاسا لە دیاریکردنی توخمەکانی هەڵخەڵەتاندن (یان چەواشەکردن) لە چۆنیەتی و چەندییەتیدا راجیاییان هەیە، هەروەك راجیاییان لە توخمەکانی زۆرلێکردندا هەبوو:

وا لێرەدا روونی دەکەینەوە:

أ ـ لە رووی چەندییەتییەوە: هەندێکیان[1] دەڵێن: دوودانەن.

یەکەم: بابەتی (بەکارهێنانی رێگای فێڵاوی)

دووەم: دەروونی (وادارکردن بە ئەنجامدانی گرێبەست) .

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر ئەم قسەیە ئەوەیە وادارپوون بە گرێبەستەوە(تحمل) ئەنجامی خڵەتاندنەکەیە پاش هەبوونی توخمەکانی نەوەك خۆی توخمێك بێت و وادارپوونیش لە شوێنەوار و ئەنجامەکانە نەك توخمەکان .

ب ـ هەندێکیشیان دەڵێن[2] سێدانەن:

---

[1] لە پێش هەموویانەوە زانای هەڵکەوتوو خوالێخۆشبوو السنهوري لە ـ الوسيط ـ دا دەڵێت:
(لە دەقەکانی (م١٢٥ ـ ١٢٦)ی یاسای ئێستای مەدەنی میسری ئەوە وەردەگیرێت کە فێڵلێکردن دوو توخمی هەیە: یەکەم: بەکارهێنانی رێگا چەواشەکاریەکان، کە ئەمەش توخمی بابەتیە. دووەم: وەدارکردن بە ئەنجامدانی گرێبەست کە ئەمەش توخمی دەروونیە. وە ئەم دوو توخمەش بەسن.

[2] لە پێش هەموویانەوە مامۆستا د . انور سلطان ـ مصادر الالتزام ١٧٥/١.

١ ـ بەکارهێنانی فێڵ .

٢ ـ نییەتی چەواشەکردن .

٣ ـ فێڵەکە کاریگەر بێت .

تێبینی ئەوە لەسەر ئەم دابەشکردنە دەکرێت کە توخمی یەکەم هەمان توخمی دووەمە و جیاوازییان لە مادی و مەعنەوی بووندایە. ئاشکراشە کە توخمی یەکەم بە فێڵ دانانرێت گەر نیازی سەرلێشێوانی لەگەڵ نەبێت، کاریگەری فێڵ لەو شوێنەوارانەیە کە پاش هەبوونی توخمەکانی خڵەتاندن بەدی دێت .

ج ـ هەندێک[1] لەوانەی لە ژێر کاریگەری فیقهی فەرەنسیدان دەڵێن: مەرجەکانی چەواشەکردن حەوتن:

١ ـ بەکارهێنانی رێگا فێڵاوییەکان لە لایەن یەکێک لە خاوەن گرێبەستکارەکانەوە کە کاریگەریی لەسەر ویستی گرێبەستکارەکەی تر دادەنێت.

٢ ـ دەبێت هۆکارەکانی هەڵخەڵەتاندن لە نەریت و باوی خەڵکیدا نەبێت و لە دۆخی ئاساییدا پەنابردن بۆیان رێپێدراو نەبێت لەبەر نامۆییان.

٣ ـ پێویستە هەڵخەڵەتاندنەکە پاڵنەری گرێبەستەکە .

٤ ـ پێویستە یەکێک لە لایەنەکان ئەم کارە بکات دژی لایەنەکەی تر، ئەگەر لە لایەن کەسێکی سێهەمەوە بوو پێویستە کەسی سوودمەند ئاگای لێ بێت یان زانینی ئاسان بێت بۆی.

٥ ـ سەلماندنی هەڵخەڵەتاندن ، چونکە ئەسڵ ئەوەیە کە هەڵخەڵەتاندن لە ئارادا نەبێت.

٦ ـ پێویستە دژ بێت لەگەڵ رەوشتە جوانەکاندا لە رووی یاساییەوە .

٧ ـ پێویستە هەڵخەڵەتاندن لە ژێر تیشکی یاسای مەدەنی عێراقیدا هاوتای هەڵخڵەتاندنی فرلوان بێت .

---

[1] وەک مامۆستا صلاح الدین الناهی ـ مبادئ الالتزامات لا ٧١ .

**هەڵسەنگاندنی ئەم دابەشکردنە:**

أ ـ یەکێك لە مەرجەکانی هۆکارەکان ئەوەیە کە باو و نەریتی کۆمەڵگە نەبێت، ئاشکرایە کە باو و نەریت هەندێکجار راست و دروستە و هەندێکجاریش نادروستە، کەواتە باشتر بوو لەگەڵ باو و نەریتدا وشەی (راست و دروست)بکاتە مەرج .

ب ـ مەرجی چوارەم مەرجی توخمە و خۆی توخم نییە .

ج ـ مەرجی پێنجەم کە کرداری سەلماندنە پاش خودی سەلماندن دێت ،بەڵام مامۆستای بەرێز هەردووکیانی تێکەڵ کردووە و جیاوازییەکەشیان ئاشکرایە . سەلماندن پاش پێشکەشکردنی سکاڵا دێت کە پەیوەندی بە دادوەرییەوە هەیە و لە مەرجەکانی بەدیهاتنی زیندپێگەشتن نییە .

د ـ رەوشت لە لایەن یاسا دەستکردەکانەوە گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نەدراوە ، چونکە رەچاوکردنی لە توخمەکانی پابەندبوونە ئەدەبییەکانە نەك یاساییەکان ، پێویستبوو بڵێت ( دەبێت پێچەوانەی سیستەمی باوی کۆمەڵگە بێت یان ئادابی گشتی) .

هـ ـ هاوتابوونی فریودان و خەڵەتانی گەورە مەرجە بۆ کارکردن پێی و مەرج نییە بۆ بەدیهاتنی .

د ـ لە رووی چۆنیەتییەوە هەندێکیان[1] دەربڕینی (توخمەکان)ی بەکارهێناوە و هەندێکیان دەربڕینی (مەرجەکان)ی بەکارهێناوە و دڵنیاکردوون بۆ توخمەکان، مەرج و توخمەکانیان تێکەڵکردووە لە کاتێکدا مەرج جۆرێکە لە توخمەکان ، چونکە توخم یان پایەیە یان مەرجە وەك پێشتر باسمانکرد .

پێمان وایە کە توخمەکانی خەڵەتاندن پێنجن، کە بریتین لە:

١ ـ کرداری کاریگەر کە بریتییە لە بەکارهێنانی رێگا سەرلێشێوێنە فێڵاوییەکان کەوا زانایانی یاسا ناویان ناوە (توخمی مادی) .

٢ ـ کاریگەربوونی ویست و کارتێکرانی بە کرداری کاریگەری ناوبراو، کە بە توخمی مەعنەوی ناوبراوە .

[1] وەك مامۆستا د . عبدالحي الحجازي ـ النظرية العامة للالتزامات ١/٣٠٥ .

٣ ـ پەیوەندی هۆکارییەتی لە نێوان کارتێکەر و کارتێکراودا .

٤ ـ چوون بەرەو ئەنجامدانی ئەو گرێبەستەی لە ژێر کاریگەری فریودانذا ئەنجام دەدرێت.

٥ ـ ئەو ئامانجە ناڕەوایەی لە ئەنجامی فریودانەکەوە چاوەڕوان دەکرێت .

**شوێنەوارەکانی خەڵەتاندن(چەواشەکردن):**

هەموو شتێکی کاریگەر و کارتێکراو ئەنجامێکی ئەرێنی یان نەرێنی هەیە و پێی دەوترێت شوێنەوار چ سزایی بێت یان مەدەنی، مادی بێت یان مەعنەوی .

خەڵەتاندن(چەواشەکردن) سروشتێکی تاوانکارانەی هەیە چونکە ناپاکی مرۆڤە بەرانبەر برا مرۆڤەکەی بۆ قازانجی تایبەتی خۆی و پیشاندانی ناراستیە وەك شتێکی راست، بۆیە ئەو کەسەی وا بکات شایستەی سزایەکی تاوانکارییە(سزادان) و شایەنی جەزایەکی مەدەنیشە(قەرەبوو) .

**یەکەم: سزای تاوانکاریانەی:**

ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش یاسادانراوە جەزاییەکان پێناسەی چەواشەکردن ( خەڵەتاندن)یان کردووە بە چەند پێناسەیەکی جیاواز لە دەربڕیندا و هاوولاتا لە ناوەرۆکدا. هەندێك لەو پێناسانەش بریتییە لە:

أ ـ هەندێکیان دەڵێن بریتییە لە: شێواندنی راستی دەربارەی رووداوێك کە لە ئەنجامیدا کەوتنە هەڵە دروست دەبێت[1] پوختەی ئەم پێناسەیە ئەوەیە کرۆکی چەواشەکردن درۆیەکە لە ئەنجامیدا تێکچوونێك لە بیرکردنەوەی کەسێکدا دروست دەبێت و بە شێوەیەکی سەفسەتەیی رێگای لێون دەکرێت کە راستی وەك خۆی نەبینێت بۆ قازانج گەیاندن بەوکەسەی سوود لەم رێگاونکردنە وەردەگرێت.

ب ـ هەندێکیشیان[2] تاوانی خەڵەتاندنیان پێناسە کردووە بەوەی ئەو کردەوە و درۆیانەن کە دەتوانن شتەکان وەها لێ بکەن وەك خۆی نەبینرێن یان بەرگێکی وەهایان بە بەردا بکەن جیاواز لە حەقیقەت و واقیعی ئەو شتانە .

---

[1] وەك د . محمود نجیب حسني ـ شرح قانون العقوبات المصری الخاص ـ چاپ ١٩٨٧ ـ لا ٩٩٣ .

[2] وەك د . حسن الجندی ـ شرح قانون قمع التدليس و الغش چاپ ١٩٩٦ لا ٢٦ .

بۆیە وتوویانە: خەڵەتاندن جۆرێکە لە جۆرەکانی چەواشەکردن بەڵام تاوانکارانەیە و جیاوازە لە چەواشەکاریی مەدەنی .

ئاشکراشە کە چەواشەکاری و فێڵکردن پێچەوانەی سیستەمی گشتی کۆمەڵایەتی و ئادابی گشتین .

یەکەمین یاسای جەزایی عەرەبی (بە پێی زانیاری من)ئەم بابەتەی باس کردووە، یاسای سزادانی میسری ئەهلی دەرچووی ساڵی ١٨٨٣ ز و لە مادەی (٢٤٥) دا کە دەڵێت (هەرکەسێك فێڵ بکات لە خواردنەوەکاندا یان لە خشڵدا یان لە دلەوێڵەدا یان جۆرەکانی تری خواردن یان دەرمانی ئامادەکراو بۆ فرۆشتن بەهۆی تێکەڵکردنی شتێکی زیانبەخش بە تەندروستی، یان خواردنەوە و خشڵ و جۆرەکانی خواردن و دەرمانی فرۆشت یان نومایشیکرد بۆ فرۆشتن و زانیبووی کە فێڵی تیا کراوە بە هۆی تێکەڵبوونی بە شتێکی زیانبەخش بە تەندروستی، گەرچی کڕیاریش ئاگاداربێت بە ناساغییە، یان خشڵی گرانبەهای فرۆشت بە بێ وەرگرتنی کەفالەت کڕیار بەو شێوەیەی لە ئاگادارییە یاساییەکاندا نوسراوە، ئەوا زیندان دەکرێت بۆ ماوەی سێ مانگ تا دوو ساڵ و غەرامە دەکرێت لە دووسەد قیرشی دیوانییەوە تا دووهەزار قیرش .

دروستە غەرامە کردنەکە بگاتە چواریەکی نرخی ئەو زەمانەتەی بڕیاری لەسەر دەردەکرێت و چواریەکی نرخی ئەو شتەی فەرمان دەکرێت بە گێڕانەوەی بۆ سەر ئەو کەسەی کە یەکێك لەو کارانەی کردووە کە باسکران )[1] .

بە شوێنیدا یاسای سزادانی ئەهلیی میسری دێت کە لە ساڵی ١٩٠٤ دا دەرچوو، پاشان یاسای سزادانی میسری لە ساڵی ١٩٣٧، پاشان یاسای ژمارە ٤٨ ی ساڵی ١٩٤١ و یاسای ژمارە ١٠٦ ی ساڵی ١٩٨٠ ، پاشان یاسای ژمارە ٢٨١ی ساڵی ١٩٩٤ .

لە دەقی مادەی یەکەمی ئەم یاسایەدا دەڵێت: (سزا دەدرێت بە ئەندازەیەك کەوا کەمتر نەبێت لە پێنج هەزار جونەیە و پتر نەبێت لە بیست هەزار جونەیە یان بەو ئەندازەیەی بەرانبەر نرخی کەلوپەلی بابەتی تاوانەکە کامیان گەورەتر بێت، یان بە یەکێك لەم دوو سزایە: هەرکەسێك ئەوکەسەی گرێبەستی لەگەڵ دەکات بخڵەتێنێت یان دەستبکات بە خڵەتاندنی، بە هەر

---

[1] مامۆستا ابراهیم المنجي: جرائم التدليس والغش چ ١٩٩٧ لا ٣٢.

ڕێگەیەکی نادروست[1] ، وە سزاکەی بەندکردن دەبێت کە کەمتر نەبێت لە ساڵێك و پتر نەبێت لە پێنج ساڵ ، بە غەرامەیەکیش کە کەمتر نەبێت لە دە هەزار جونەیە و پتر نەبێت لە سی هەزار جونەیە یان بەو ئەندازەیەی بەرانبەر نرخی کەلوپەلی بابەتی تاوانەکەیە کامیان گەورەتر بێت، یان بە یەکێك لەم سزایانە، ئەگەر تاوانی ئاماژەپێکراو لە پەرەگرافی پێشوودا بکات یان دەست بکات بە کردنی ) .[2]

لە یاسای ئێستای سزادانی عێراقیدا[3] بابەتی چەواشەکردن(تدلیس) لە ژێر سەردێڕی (فێڵکردن)دا لە بەندی چوارەم لە پەرەگرافی یەکەم لە مادەی(٤٥٦)یدا دانراوە کە دەڵێت:

١ ـ ئەوکەسەی بە یەکێك لەم ڕێگایانەی خوارەوە بکاتە بەدەستهێنانی یان گواستنەوەی مولکایەتی مولکی کەسێکی تر بۆ خۆی یان بۆ کەسێکی تر بەند دەکرێت:

أ ـ بە بەکارهێنانی ڕێگا فێڵاوییەکان.

ب ـ بەکارهێنانی ناو یان سیفەتێکی درۆ یان راپۆرتێکی درۆ دەربارەی ڕووداوێکی دیاریکراو ، هەرکاتێك ئەو کارەش بوویە هۆی خڵەتاندنی تاوانبەسەرداکراو و ناچارکردنی بە کردنی کارێك.

---

[1] وەک ئەم ڕێگایانەی خوارەوە:

ا ـ لە ڕووی خوێنییەتی کەلوپەلەکەوە ئەگەر ئەو شتەی رادەستی کردووە هەمان شتی ناو گرێبەستەکە نەبوو.

ب ـ لە ڕووی حەقیقەتی کەلوپەلەکەوە یان سروشتی کەلوپەلەکەوە یان سیفاتە بناغەییەکانیەوە یان توخمە سوودبەخشە ناوەکییەکانی و بە شێوەیەکی گشتی توخمە ناوەکییەکانی پێکهاتەکەی .

ج ـ لە ڕووی جۆری کەلوپەلەکەوە یان بنە و سەرچاوەکەی.

د ـ لە ڕووی ژمارەکەی یان ئەندازەکەی یان شتی لەم بابەتە .

[2] سەرچاوەی پێشوو لا ٣٧ ـ ٣٨.

[3] وەک یاسای مەدەنی میسری ئێستا (م ١٢٥) کە دەڵێت( دروستە گرێبەست هەڵبووەشێنرێتەوە بەهۆی چەواشەکارییەوە ئەگەرئەو فێڵانەی کە یەکێک لەو لایەنانە یان جێگرەکەی بەکاریان هێناوە ئەوەندە گەورە بووبێت کە ئەگەر ئەو فێڵە نەبوایەت ئەم گرێبەستەی ئەنجام نەدەدا). وە یاسای کوەیتی ئێستای (م ١٦٢) کە باسی زیان لێکەوتنی کردووە بەڵام باسی هەڵخەڵەتاندنی نەکردووە، بەڵام دڵبەشی کردووە بۆ زیانلێکەوتنی بەرهەمی چەواشە و بەرهەمی شتی تر، لە حاڵەتی یەکەمدا گرێبەست قابیلییەتی هەڵوەشاندنەوەیە بەڵام لەوانی تردا هیچ کاریگەرییەکی نییە .

دووەم: سزای مەدەنی:

کاریگەری فێڵکردن و کارتێکردنی ویست لە گرێبەستەکاندا لە فیقهی رۆژئاوا و ئەو یاسایانەدا پێی کاریگەرن ئەوەیە کە گرێبەست دادەمەزرێت و ئەنجامەکانی دەردەکەوێت بەڵام قابیلییەتی هەڵوەشانەوەی تێدایە لە یاسای رۆژئاوادا[1]. یاسادانەری عێراقی لە یاسای ئێستای مەدەنیدا لە مادەی (م ١٢١ ـ ١٢٤) لە ژێر سەردێڕی (چەواشەکردن لەگەڵ زیانلێکەوتندا) باسی کردووە. بەڵام هەروەك لە بابەتی رێڕلێکرلندا کەوتۆتە ژێر کاریگەری (زوفەر) لە حەنەفییەکان و فیقهی ئیمامی لە وەستاندنی گرێبەستەکەدا لە کاتێکدا دامەزراو و ناپێویستە(نافذ غير لازم) لای زۆربەی زانایانی فیقهی شەریعەت، واتە قابیلییەتی هەڵوەشاندنەوەی تێدایە لە لایەن ئەو لایەنەوە کە خەڵەتێنراوە و زیانی لێکەوتووە، ئەم ئاراستەیە لە رووی ئەنجامەوە هاورێیە لەگەڵ فیقهی رۆژئاوادا، بەڵام هەڵخەڵەتاندن بە تەنها هیچ کاریگەرییەکی نییە (لای یاسادانەری عێراقی کە بە فیقهی ئیسلامی کاریگەرە) مادام زیانی گەورەی لەگەڵ نەبێت[2].

بە پێچەوانەی فیقهی رۆژئاواوە کە هەریەك لە هەڵخەڵەتاندن و فێڵ بە هۆکاری سەربەخۆی هەڵوەشێنەرەوەی گرێبەست دادەنێت. هەروەك فێڵ بەبێ خەڵەتاندن کاریگەری لەسەر گرێبەست نییە و بەربەستی دامەزراندنی نییە. بەڵام ئەگەر فێڵەکە زۆر بوو (گەورە بوو) وە فێڵلێکراوەکە حیجری لەسەر بوو(واتە رێگای کڕین و فرۆشتنی پێ نەدرابوو) وەك منداڵی

[1] ئەوەی شایانی باسە کە فیقهی رۆژئاوا دژەکوییەکی ئاشکرای تێدایە بە نیسبەت ئەو گرێبەستەوە کە قابیلییەتی هەڵوەشاندنەوەی تێدایە لە لایەن ئەو لایەنەوە بڕیاری هەڵوەشاندنەوە بۆ قازانجی ئەو دراوە لە کاتێکدا زانایانی یاسای رۆژئاوا دەڵێن ئەم گرێبەستە تەواو نییە گەرچی وتوویانە ئەنجامە یاساییەکانی دێنێتە بەر، چۆن دەگونجێت تەواو نەبێت و شوێنەوارە یاساییەکانی وەک مافەکان ء پابەندبوونەکانی لێوە بەدی بێت.

[2] زیانی گەورە : باشتر بوو لە یاسای عێراقیدا لە بریتی وشەی (الفادح) وشەی (الفاحش) بەکاربهێنرابا . وە زیانی کەم راجیایی لەسەرە لای زانایانی یاسا، لە گۆڤاری الاحكام العدلية (م ١٦٥) دا دەڵێت کە زیانی گەورە ئەوەیە کە پتر بێت لە (نیوەی یەک لەسەر دە) لە کەلوپەلدا ء (یەک لە سەر دە) لە ئاژەڵ و (یەک لەسەر پێنج )لە موڵکدا، وە لە یاسای مەدەنی کوەیتیدا (م ١٦٢) زیان بە گەمرە دادەنرێت ئەگەر لە کاتی گرێبەستەکەدا لە پێنجیەک پتر بوو. وە ئەوەی لە واقیعەوە نزیکە ئەوەیە کە زیانی بچووک ئەوەیە دەکەوێتە ژێر هەڵسەنگاندنی شارەزایانی ئەو بوارە و زیانی گەورەش ئەوەیە کە ناکەوێتە ژێر ئەو هەڵسەنگاندنەوە.

جیانەکەرەوە(بێ تەمیین) و شێت و کەسێك لە حوکمی ئەواندا بێت، یان ئەو پارەیەی خڵەتاندنەکەی تیابووە پارەی دەوڵەت یان وەقف بوو ئەوا گرێبەستەکە بەتاڵە[1] .

مەرجی کاریگەر بوونی خەڵەتاندن ئەوەیە کە لە لایەن یەکێك لە گرێبەستکارانەوە کرابێت، ئەگەر لە کەسێکی سێهەمەوە بوو هیچ کاریگەرییەکی لە سەر گرێبەستەکە نییە مەگەر بسەلمێت کە گرێبەستکاری زیانلێکەوتوو بزانێت لایەنەکەی تر دەیزانی یان بە ئاسانی دەیتوانی بزانێت بەم خەڵەتاندنە لە کاتی گرێبەستەکەدا، بە پێچەوانەی ئەوەوە کەسی زیانلێکەوتوو داوای قەرەبوو بکات لەو کەسەی فێڵەکەی کردووە. ئەگەر زیانێکی کەمی لێکەوتبوو یان زیانی زۆری لێکەوتبوو بەڵام گرێبەستکارەکەی تر بەو فێڵەی نەزانیبێت و زانینیشی ئاسان نەبێت یان شتەکە پێش ئاگاداربوونەوە لە زیانەکە بەکارهێنرابێت، یان فەوتابێت یان عەیبێکی تیا پەیدا بووبێت کە رێگر بێت لە هەڵوەشاندنەوەی یان گۆڕانێکی ریشەیی تێدا بووبێت، گرێبەستەکە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا دامەزراو دەبێت[2] . ئەوەی شایانی باسە کە باس نەکردنی روونکردنەوە پێویستەکان پێش گرێبەستەکە بە فێڵ دادەنرێت لە گرێبەستەکانی ئەمانەتدا کە (مورابەحە)یە: کە بریتییە لە فرۆشتن بە نرخی کڕین لەگەڵ قازانجێکی دیاریکراودا، (تەولیە) یە: کە بریتییە لە خاوەندار بوون بە نرخی کڕین، (وەزیعە)یە : کە بریتییە لە فرۆشتن بە نرخی کڕین لەگەڵ کەمکردنەوەی ئەندازەیەکی دیاریکراو، و(الاشراك)ە: کە شەریککردنی کەسێکی تر لە بەشێك لە فرۆشراوەکەدا بە ئەندازەی بەرانبەرەکەی لە نرخ. یەکێك لە پابەندبوونەکانی فرۆشیار پێش گرێبەست ئەنجامدان لەم گرێبەستانەدا باسکردنی ماوەکەیە ئەگەر هەبوو و باسکردنی ئەوەی کە نرخی پێشوو قەرزێك بووە لە گەردنی فرۆشیاری یەکەمدا یان لەسەر بنەمای سوڵح و شتی لەو بابەتە وەریگرتووە[3]

---

[1] مادەی (١٢٤ ) ی مەدەنی عێراقی .

[2] مادەی (١٢٣) ی مەدەنی عێراقی .

[3] تبیین الحقائق ، للزیلعي٤/٧٨ .

# باسگەی سێهەم:
# کاریگەریی بارودۆخی خەوشی هەلپەرستی و کاریگەربوونی ویست و شوێنەوارەکانیان[1]

لە زمانی عەرەبیدا (الاستغلال) داواکردنی بەرهەمی قازانجیی موڵکە[2].

لە زاراوەی فیقهیشدا : بەکارهێنانی باری دەروونی یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەست لە لایەن لایەنەکەی ترەوە بۆ قازانجی خۆی[3].

کارتێکەر بریتییە لە کرداری کەسی هەلپەرست و کارتێکراویش کەسی چاوبەستکراوە و ئەنجامیش بریتییە لە پاڵنانی کەسی دووەم بۆ گرێبەستکردن لە قازانجی کەسی یەکەم.

زانایانی یاسا بە دانانی کرداری لایەنێکی گرێبەستەکە(هەلپەرستی) بە عەیب و ناتەواویەك بۆ ویستی لایەنەکەی تر، کەوتوونەتە هەڵەوە، هەروەك لە زۆرلێکردن و خەڵەتاندنیشدا کەوتوونە هەڵەوە. لە دوو باسگەی رابوردوودا باسمان کرد و پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات. بەڵام داکۆکی لەسەر ئەو دەکەین کە کرداری هەلپەرست و ناتەواویی ویستی چاوبەستی لێکراو لە رووی فەلسەفییەوە وارسێکە و لەسەر شتێکی تر راوەستاوە و ئەستەمە یەك وارسی دیار لە دوو جێگادا هەبێت و تێیدا جێگیر بێت.

---

[1] ئەم یاسا مەدەنییانەی خوارەوە باسی ئەم بابەتەیان کردووە: مەدەنی فەرەنسی (م ١٦٧٤ ـ ١٦٨٥)، ئەڵمانی (م ١٣٨)، یاسای ئیلتیزاماتی سویسری (م ٢١)، پرۆژەی فەرەنسی ئیتالی (م ٢٢)" مەدەنی عێراقی (م ١٢٥)، میسری (م ١٢٩)، سوری (م ١٣٠ ـ ١٣١)، لیبی (م ١٢٩ ـ ١٣٠)، لوبنانی ( م ٢١٣ ـ ٢١٤)، کوەیتی (م ١٥٩ ـ١٦١)، جەزائیری (م ٩٠ ـ٩١)، قەتەری (م ٢٨)، مۆریتانی (م ٧٥)، یەمەنی (م ١٨٣)، ئوردونی (م ١٤٦ ـ ١٥٠)، تونسی (بەندی ٦٠ ـ٦١)، مەغریبی (بەندی٥٥ ـ ٥٦)، گۆڤاری الاحکام العدلیة (م ٣٥٦)، مرشد الحیران (م ٣٠٠).

[2] لسان العرب ـ بەندی غەین ـ پیتی لام ١٤/١٧.

[3] مامۆستا د. سلیمان مرقس ـ اصول الالتزامات ـ لا ٢٠٠ ، مامۆستا عبدالحی حجازی ـ سەرچاوەی پێشوو ٣١٢/١.

## توخمەکانی هەلپەرستی:

هەندێك لە زانایانی یاسا رایان وایە کە هەلپەرستی دوو توخمی هەیە: مادی و مەعنەوی.

**١ - توخمی مادی(بابەتی):** بریتییە لە تێکچوونی هاوسەنگی نێوان پابەندییەکانی دووگرێبەستکارەکە بە شێوەیەکی خراپ، خەملاندنی رادەی ئەم خراپییە بەجێدەهێڵرێت بۆ دادوەری بابەتەکە.

**٢ - توخمی مەعنەوی (مەعنەوی):** قۆستنەوەی گرێبەستکار بۆ کەسی زیانلێکەوتوو لە رووی لاوازی و ناتەواوییەوە وەك ئارەزووپەرستیی سەرکەش و سەرەڕۆیی ئاشکرا و هەرشتێکی لەم بابەتەی حاڵە دەروونییەکانی گرێبەستکار [1].

ئەوەی تێبینییە لەسەر ئەم دابەشکردنە کە هەلپەرستی توخمێکی مادییە نەك مەعنەوی(دەروونی)، چونکە کاری ئەوکەسە بریتییە لە هەلپەرستی، کەواتە توخمی مەعنەوی (ئەو شتەی هەلپەرستییەکەی پێدەکرێت) بریتییە لەو لاوازییەی لە گرێبەستکارەکەی تردا هەیە

هەندێکیش [2] رایان وایە کە توخمەکانی هەلپەرستی، کە ناویان ناوە مەرجەکان، چوارن:

١ - تێکچوونی هاوسەنگیی پابەندییەکانی نێوان هەردوو لایەنی گرێبەستکار بە شێوەیەکی زۆر خراپ، یان نەبوونی بەرانبەر لە بنەڕەتدا. بەم گشتگیرییەش جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانەی تر کە دەڵێن هەلپەرستی لە گرێبەستەکانی بەخشینەکاندا نییە. پێمان وایە کە ئەم ئاراستەیەی مامۆستا مەرقەس راستە. نموونەی پیادەکردنەکانی هەلپەرستیی ژنێکی لاوە بەرانبەر مێردە پیرەکەی بۆ ئەوەی کە هەندێك لە داراییەکەی یان هەمووی ببەخشێت بە ژنەکەی تا لە ژیاندایە.

٢ - بوونی سەرەڕۆییەکی ئاشکرا و ئارەزوویەکی سەرکەش لای گرێبەستکاری زیانلێکەوتوو بە شێوەیەك کە لایەنەکەی تر بیقۆزێتەوە، چونکە ئەگەر نەقۆزێتەوە هیچ شوێنەوارێکی یاسایی نابێت. [3]

---

[1] وەک نەبوونی شارەزایی گرێبەستکار .

[2] وەک مامۆستا سلیمان مرقس ـ اصول الالتزامات ـ لا ٢٠٣.

[3] هەمان سەرچاوە .

٣ ـ لایەنەکەی تر نیازی قۆستنەوەی ئەم حاڵەتانەی هەبێت.

٤ ـ گرێبەستەکە لە ئەنجامی ئەم هەلپەرستییەوە ئەنجام بدرێت.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر مەرجی سێهەم: ئەوەی هەلپەرستی لەگەڵ دەکرێت مەرج نییە تەنها سەرەڕۆیی و سەرکەشی بێت.

لە راستیدا تـوخمەکانی هەلپەرستی پێنجن:

هەلپەرست، هەڵخەڵەتێنرلو، فێڵتیاکرلو، ئەو شتەی هەلپەرستیی پێدەکرێت، فێڵکردن.

هەریەك لەم تـوخمانە مەرجی تایبەتی خۆی هەیە بەم شێـوەیەی کە باسی دەکەین:

**١ ـ هەلپەرست:** ئەو گرێبەستکارەیە کە ویستی ناتەواوی لایەنەکەتر دەقۆزێتەوە بۆ گەشتن بە ئامانجێکی نارەوا ، مەرجەکانیشی بریتین لە:

أ ـ هەلپەرست یەکێك بێت لە گرێبەستکاران،چ خۆی بێت یان وەکیلەکەی .

ب ـ پێویستە نییەتی بەدەستهێنانی ئامانجێکی(مەسڵەحەت) نادروست بێت.

**٢ ـ کەسی خەڵەتێنرلو:** ئەو گرێبەستکارەیە کە ناتەواویی ویستەکەی قۆسترلوەتەوە و لە مەرجەکانی:

أ ـ لایەنێکی گرێبەستەکە بێت،چ خۆی بێت یان وەکیلەکەی .

ب ـ لاوازییەکی وەهای تێدا بێت کە لە لایەن کەسانی ترەوە بقۆزرێتەوە .

**٣ ـ فێڵتیاکرلو:** بریتییە لە گرێبەستلەسەرکرلو ، لە مەرجەکانی:

أ ـ پێویستە بەرلنبەرێکی هەبێت (بریتی). کەولتە هەلپەرستی تەنها لە گۆڕینەوەکاندا دەبێت نەك دیاری و بەخشینەکان لای زۆربەی زانایانی یاسا. هەندێکیش[١] پێیان ولیە لەبەخشینیشدا دەبێت و ئێمەش ئەم رایەمان پەسەندکردووە.

ب ـ جێگا(بابەت)ی گرێبەستێکی دیاریکرلو بێت نەك ئەگەری(ئیحتیمالی)، چونکە سروشتی ئەگەریی خەڵەتان و زیانی تێدایە و کەسی زیانلێکەوتـوو پێشتر ئاگای لەم سروشتە هەیە، کەولتە بە زیانلێکەوتن مافی تانەدانی لەو گرێبەستە ئەگەرییە نییە، وەك فرۆشتنی ماڵێك لە بەرلنبەر مووچەی بەردەوام تا لە ژیاندا بێت و هەروەك گرێبەستی بیمە و هاوشێـوەکانی.

---

[١] وەک مامۆستا مەرقەس .

هەروەو گرێبەستکارەکە پێشتر دەزانن کە چی دەدەن بە یەکتر یان وەریدەگرن. لە نموونەی مووچە بە درێژایی ژیان خاوەن ماڵ دەزانێت چی دەدات بە کڕیار بەڵام ئەندازەی ئەو شتەنازانێت کە وەریدەگرێت، هەروەها فرۆشیار ئەو ئەندازەیە نازانێت، چونکە بەسترلوەتەوە بە شتێکی نادیارەوە کە ماوەی ژیانی دلهاتووە. هەروەها لە گرێبەستی بیمەدا لایەنی بیمەکەر نازانێت ئەو ئەندازەیە چەندە کە دەیبات لە بیمە بۆکرلو، وە بیمە بۆکرلو نازانێت چەند قیست دەدات.

بۆیە ئەم گرێبەستە بە گرێبەستی (ئیحتیمالی ـ لەوانەیی) ناونرلوە، چونکە ئەگەری زیان و قازانج لە بەستنیدا هەیە. وە بە (گرێبەستی خەڵەتان)یش ناونرلوە، چونکە ئەنجامەکەی نادیارە لە رووی زیان و قازانجەوە. ئەم جۆرە گرێبەستانە لەبەر زیانلێکەوتن تانەی لێنادرێت، چونکە پێشتر چاوەڕوانکرلوبووە.

۳ ـ **فێڵلێکراو:** لە نموونەکانی:

أ ـ پێویستی: وەك قۆستنەوەی پێویستیی نەخۆش بە نەشتەرگەری لە لایەن دوکتۆرەوە و دلوای پارەیەکی زۆری نائاسایی لێ دلوا بکات.

ب ـ هەڵەشەیی روون: کە خاوی و پەلەکردنی بێجێ و خراپی بەڕێوەبردن .

ج ـ ئارەزووی سەرکەش: کە بریتییە لە ئارەزووی بەهێز بۆ بەدەستهێنانی شتێك بە هەرنرخێك بێت.

د ـ نەبوونی پسپۆڕی لە مامەڵەدا .

هـ ـ لاوازیی پەیبردن (گەمژەیی و بێئاگایی و هاووێنەکانیان).

و ـ جیاوازی ناقۆڵا لە نێوان تەمەنی ژنێکی لاو و مێردێکی پیردا کە ژنەکە ئەم جیاوازییە و خۆشەویستیی پیاوەکە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی وا بکات لە پیاوەکە هەموو دلراییەکەی یان هەندێکی بکات بەناوی ژنەکەوە لە فەرمانگەی تاپۆدا.

هەوەها هەر لاوازی و ناتەولوییەکی تر لە یەکێك لە گرێبەستکاراندا کە یەکێکیان بۆ قازانجی تایبەتی خۆی بیقۆزێتەوە و ئەنجامەکەی بە زیانێکی گەورە تەولو بێت.

**وە خەڵەتان لە زاراوەی فیقهیدا:** بریتییە لە ناهاوسەنگی لە نێوان ئەوەی گرێبەستکار دەیدات و ئەوەی وەریدەگرێت.

لەسەر بناغەی ئەم پێناسەیە زۆربەی زانایانی یاسا دەڵێن بواری پراکتیکیی زیان و هەلپەرستی گرێبەستەکانی گۆڕینەوەی نائیحتیمالییە، لە گرێبەستەکانی خۆبەخشیدا بەدینایەت، چونکە یەکێك لەگرێبەستکارەکان شتێك پێشکەش دەکات بەبێ بەرانبەر ، کەواتە زیانلێکەوتن بەو ئیعتیبارەی کە ناهاوسەنگیی ماددییە تەنها لە گۆڕینەوەکاندا دێتە دی.[1]

لە مەرجەکانی:

أ - بوونی لاوازییەك لە شێوەیەك لە شێوەکانیدا و لە یەکێك لە گرێبەستکارەکاندا .

ب - یەکێك لە گرێبەستکارەکان ئەو لاوازییە بقۆزێتەوە بۆ قازانجی خۆی .

ج - ئەم قۆستنەوەیە ببێتە مایەی گرێبەستەکە، گرێبەستەکەش شوێنەواری کارتێکردن و کارتێکرانە، کە کردار و کارتێکرانی فەلسەفین.

د - لە ئەنجامی گرێبەستەکەوە خەڵەتانێکی گەورە روویدات لە خەڵەتێنراو.

**٥ - خەڵەتان - غبن - (بەهۆی هەلپەرستییەوە):** نەبوونی هاوسەنگییە لە نێوان دوو بریتییەکەدا وەك باسمانکرد. لە مەرجەکانی:

أ - پێویستە خەڵەتانەکە گەورە بێت و خەڵەتانی بچووك هیچ شوێنەوارێکی هەلپەرستیی لێ بەدینایەت.

ب - ئەو هەلپەرستییەی گرێبەستکارەکەی بەرانبەر بەکاریهێناوە هۆکاری زیانەکە بێت .

**هەڵوێستی یاسادانەری عێراقی دەربارەی هەلپەرستی:**

یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی هاوڕایە لەگەڵ یاسا عەرەبییەکانی تردا کە هەلپەرستی ناتەواوییەکە لە ناتەواوییەکانی ویست ئەگەر تـوخمە ناوبراوەکانی تێدا بوو.

بەڵام رای وەهایە کە گرێبەستی خۆبەخشیش هەلپەرستی دەیگرێتەوە، هەروەها رای هەندێك لە زانایانی یاسایە[2] هەروەك گرێبەستەکانی گۆڕینەوەش دەگرێتەوە . ئەوەتا لە گرێبەستەکانی گۆڕینەوەدا مافی کەسی هەلپەرستی لەگەڵ کراو(خڵەتاو)ە کە داوا بکات بەشخورانی گەورە نەمێنێت، یان بە زیادکردنی پابەندبوونەکانی هەلپەرستەوە(زیانلێدەر) یان بە

[1] مامۆستا سەنهوری لە لایەنگرانی ئەم ئاراستەیە - الوسیط ٣٨٦/١ .

[2] وەک مامۆستا سلیمان مرقس - کە پێشتر باسمان کرد .

کەمکردنەوەی پابەندبوونەکانی هەڵخەڵەتێنراو، وەك کاریگەریی ئەو نۆخە کتوپڕانەی جێبەجێکردنی پابەندییەکانی قەرزار سەخت دەکاتەوە، سەرەڕای ئەمەش مافی هەڵوەشاندنەوە بە هیچ لایەکیان نادرێت .

بەڵام لە گرێبەستە خۆبەخشەکاندا مافی دواکردنی هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست بە زیانلێکەوتوو دەدرێت لە ماوەی ساڵێکدا لە بەدیهێنانی گرێبەستەکەوە:[1]

لە کۆتایی ئەم باسگەیەدا دەمەوێت ئاماژە بۆ چەند خاڵێکی زۆر گرنگ بکەم:

أ ـ وشەی (فادح) لە دەقە عەرەبییەکاندا بگۆڕدرێت بە (فاحش)، چونکە شایانی ئەم جێگایە نییە .

ب ـ ماوەی دیاریکراو بۆ بەرزکردنەوەی سکاڵا لە هەلپەرستیدا بۆ لابردنی زیانی گەورە بریتییە لە ماوەی هەڵوەشاندنەوەی دواکە (تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر کرانی گرێبەستەکەدا) نەوەك ماوەی کاتبەسەرچوون، چونکە وەستان و دابڕان قبوڵناکات، بۆیە ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا لە کاتی گرێبەستەکەوە سکاڵای بەرزنەکردەوە، سکاڵاکەی ڕەفز دەکرێت و وەرناگیرێت .

ج ـ فەرمانەکانی هەلپەرستی جێبەجێ ناکرێت بەسەر گرێبەستەکانی مـوزایەدەدا .

د ـ جگە لەوەی باسکرا ، یاسادانەری عێراقی لە یاسای ئێستای سزاکاندا هەلپەرستی بەرانبەر کەسێکی خوار هەژدەساڵ لە مامەڵەی پارەدا بە تاوانێك دادەنێت کە سزای لە سەرە[2]

---

[1] یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی لە مادەی(١٢٥)دا دەڵێت (ئەگەر یەکێک لە گرێبەستکاران پێویستییەکەی و هەڵەشەیی و سەرەڕۆیی و نەشارەزایی و لاوازیی تێگەشتنی قۆزرایەوە و ناچاری کرد بە بەستنی گرێبەست و زیانی گەورەی پێگەشت، بۆی هەیە تا ماوەی ساڵێک لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەوە داوای لابردنی ئەو زیانە بکات کە پێی گەشتـووە تا ئاستێکی مەعقـوول و ئەگەر ئەو کارەی کردووشیەتی خۆبەخشانە بـوو هەر لەم ماوەیەدا دەتـوانێت هەڵی بـووەشێنێتەوە)

[2] یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی لە مادەی(١٢٥)دا دەڵێت (ئەگەر یەکێک لە گرێبەستکاران پێویستییەکەی و هەڵەشەیی و سەرەڕۆیی و نەشارەزایی و لاوازیی تێگەشتنی قۆزرایەوە و ناچاری کرد بە بەستنی گرێبەست و زیانی گەورەی پێگەشت، بۆی هەیە تا ماوەی ساڵێک لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەوە دواوی لابردنی ئەو زیانە بکات کە پێی گەشتـووە تا ئاستێکی مەعقـوول و ئەگەر ئەو کارەی کردووشیەتی خۆبەخشانە بـوو هەر لەم ماوەیەدا دەتـوانێت هەڵی بـووەشێنێتەوە)

# باسگەی چوارەم:
# کاریگەری بارودۆخی هەڵەکردن و کاریگەربوونی ویست و شوێنەوارەکانی

هەڵە خەوشێکە لە خەوشەکانی ویست بێ هیچ لێتێکچوون و بەزاندنێك، وەك لە دەربڕینەکانی پێشدا هەبوو ( زۆرلێکران و خەڵەتاندن و ئیستیغلال)، چونکە خەوشەکە بەستراوەتەوە بە ویستی یەکێك لە گرێبەستکارەکانەوە، چ لەخۆوە ببێت یان بە هۆی خەڵەتاندنەوە.

لە زماندا هەڵە بە چەند واتایەك هاتووە و نزیکترینیان لە واتا زاراوەییەکەوە ئەوەیە کە مرۆڤ بە نائەنقەست رێگای راست ون بکات.[1]

لە زاراوەدا : نزیکەی هەموو زانایانی یاسا هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە بریتییە لە (وەهمێك لە مێشکی کەسێکدا کە شتی بە شێوەیەکی ناراست بۆ دەنوێنێت).[2]

ئەم پێناسەیە پێچەوانەی لۆجیکی یاساییە، چونکە دەرککردنی واقیع لە لایەن گرێبەستکارەوە لەو هەڵەیەدا کە پاڵی پێوە دەنێت بۆ گرێبەستەکە پاش عەیبدارکردنی ویستی، زۆر کەمترە لە وەهم کە کەمترین پلەی دەرککردنەکانی مرۆڤە . پاشان وەهم بریتییە لە پەیبردنی بەرانبەر گومان، بریتیشە لە پەیبردن بە رێژەی کەمتر لە پەنجا لەسەدی هەر شتێك. پەیبردن بە رێژەی پتر لە پەنجا لە سەدی لە هەرشتێك گومانە، وە لەبەر ئەوەی بەرانبەرن وەهم بەدی نایەت تاکو گومان بەدی نەیەت.

ئەم چەسپین(تلازم)ەی نێوانیان ئەوە دەگەیەنێت وەهمکردنی کڕیارێك لە ئەو گوڵدانەی دەیەوێت بیکڕێت بۆ (نموونە)لە پێشدا گومانی وەهابووە کە مێژوویی نییە

---

[1] لسان العرب فصل الغين حرف الطاء ٢٣٨/٩ .

[2] مامۆستا السنهوري ٣١١/١، د . صوفي ابوطالب ـ الوجيز في القانون الروماني، لا ١٧٥ ، د . حشمت ابو ستيت ـ سەرچاوەی پێشوو ٦٤/١ ، د . أنور سلطان ـ سەرچاوەی پێشوو ١٦٠/١ ، د ز عبدالحي حجازي ـ سەرچاوەی پێشوو ٢٩٥/١ .

بەڵام کار بە گومانەکەی ناکات (پتر لە سەداپەنجاکە) و کار بە وەهمەکەی دەکات (کەمتر لە سەدا پەنجاکە)، بۆیە گوڵدانەکە دەکڕێت سەرەڕای ئەوەی گومانی وایە کە گوڵدانەکە مێژوویی نییە، دیارە هیچ کەسێکی عاقڵ کاری وەها ناکات .

وە پێشنیار دەکەم کە هەڵە بەم شێوەیە بناسێنرێت بکرێت: وێناکردنی شتێك دوور لە حەقیقەتی خۆی .

ئەگەر گرێبەستکارێك بەم مانایە کەوتە هەڵەوە و لە ژێر ئەم کاریگەرییەدا گرێبەستێکی ئەنجامدا، خواستەکەی عەیبدارە. هەڵەش چ کوتوپڕ بێت یان لە ژێر کاریگەری خەڵەتاندا بێت هەر بە عەیبداریی ویست دادەنرێت و بە سیفەتی دانرێت و بە بارودۆخی کاریگەر دادەنرێت .

### توخمەکانی هەڵە:

هەڵە یان لە خەڵەتاندنەوە سەرهەڵدەدات(کە بەکارهێنانی رێگا فێڵاوییە سەرلێشێوێنەکانە)، یان خۆبەخۆیە و گرێبەستکار بە هۆی خودی کەسەکەوە تووشی دەبێت (خودی یە):

أ ـ ئەگەر لە ئەنجامی کرداری خڵەتاندنەوە بێت، ئەوا لەسەر هەمان توخمەکانی خڵەتاندن رادەوەستێت بە چەمکە یاساییەکەی کە پێشتر باسمانکرد لە باسگەی دووەمدا.

ب ـ ئەگەر لە خودەوە بوو، توخمەکانی ئەمانە دەبن:

١ ـ پێویستە واقیعێك هەبێت ئەو کەسە پێی نەزانیبێت کە کەوتۆتە هەڵەوە.

٢ ـ پێویستە وێناکردنی شتێکی تر لە ئارادا بێت

٣ ـ شتی وێناکراو پێچەوانەی واقیع بێت .

٤ ـ هۆیەکی خودی(کەسیی) هەبێت کە بۆتە هۆی درکنەکردنی واقیع .

٥ ـ ئەنجامەکەی چوون بێت بەرەو بەستنی گرێبەستەکە .

ئەوەی شایانی باسە زانایانی یاسا باسی توخمەکانی هەڵەیان نەکردووە .

### هەڵە و لێتێکچوون:

پەیوەندی نێوان هەڵە و لێتێکچوون گشتیبوون و تایبەتبوونی رەهایە، هەموو لێتێکچوونێك هەڵەیە، چونکە مرۆڤ لە هەردوو حاڵەکەدا راستی بە شێوەیەکی جیاواز لە

خودی راستی وێنا دەکات ، بەڵام گەر پێچەوانەی بکەینەوە هەمووکات وەها دەرناچێت، چونکە هەڵە دوو واتای هەیە:

**یەکەم** : ئەو واتایەی باسکرا (وێناکردنی شتێك جیاواز لە خودی خۆی). وە هەڵەش یان لێتێکچوون بەم واتایە تووشی هەموو مرۆڤێك دەبێت، تەنانەت پێغەمبەران و نێرراوانی خودا کە زاراوەی (مەعصوم)یان بۆ بەکار دێت .

**دووەم: تێکدانی ئەرکێکی** یاسایی یان شەرعی بە ئەنقەست یان بە هەڵە، کە پێشتر لە بابەتی بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمیدا باسکرا و لە باسی هەڵەی جینایی و هەڵەی مەدەنی و هەڵە بە واتای رۆژئاوایی و هەڵە بە چەمکی فیقهی ئیسلامی، ئیتر پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات. هەڵەش بەم واتایەی دووهەم تووشی پێغەمبەران و نێرراوان و مەعصومەکان نابێت، چونکە پەروەردگار ئاگاداریان دەکاتەوە لێی .

### شوێنەوارەکانی کاریگەریی لێتێکچوون و کاریگەربوونی ویست:

شوێنەوارەکانی خەوشی هەڵە جیاوازە لە شوێنەوارەکانی زۆرلێکردن و خەڵەتاندن و ئیستیغلال بە پێی جۆر و سروشتی هەڵەکە، وەك لێرەدا روونی دەکەینەوە:

١ ـ ئەگەر لێتێکچوون لە چییەتی(ماهییەت)و سروشتی گرێبەستەکەدا بوو : وەك ئەوەی زەید ناوێك پارەیەك وەك ئەمانەت بداتە دەستی کەسێك کە بۆی بپارێزێت، بەڵام ئەو کەسە وەکو دیارییەك بۆ خۆی وەری بگرێت .

٢ ـ ئەگەر لێتێکچوون لە شوێنی گرێبەستەکەدا روویدات: وەك ئەوەی کەسێك خانوێکی دیاریکراو لە خانوەکانی بە کرێ بداتە کەسێکی تر و ئەویش بە حسابی ئەو خانوە دیاریکراوە وەری بگرێت، بەڵام پاشان دەرکەوێت کە هەڵە بووە و خانوە دیاریکراوەکە نەبووە . ئەوکات گرێبەستی بەکرێگرتنەکە بەتاڵە، چونکە پێدانەکە لەسەر جێگایەکی تر بووە و قبوڵکردنەکەش جێگایەکی تر. یان وەك ئەوەی وەلی ئەمرێك کچە گەورەکەی (کە ناوی فاتیمەیە)بدات بە شوو بە خوازبێنیکارێك کە وا تێگەشتووە کە ئەو کچە بچووکەکەیانە و ناوی (عائیشەیە)، لەم کاتەدا هاوسەرگیرییەکە بەتاڵە، چونکە پێدان و وەرگرتنەکە جیاوازن.

٣ ـ لێتێکچوون لە بوونی هۆکارێکی پابەندبووندا: یەکێك لەو بنەما یاساییە گشتییانەی یەکدەنگی لەسەرە ئەوەیە کە هەر پابەند بوونێك کە هۆکارێکی ڕەوای نەبێت بەتاڵە.

نموونەی جێبەجێ بوونی ئەم بنەمایە: ڕێکەوتنی میراتگرەکان لەگەڵ کەسی وەسیەتبۆکراودا کە هەندێك پارەی پێ بدەن لە ماڵە میراتییەکە وەك جێبەجێکردنێك بۆ وەسیەتەکە، بەڵام پاشان روون ببێتەوە کە وەسیەتەکەی بەتاڵ بووە یان وەسیەتکارەکە لە وەسیەتەکەی پەشیمان بۆتەوە پێش مردنی، کەواتە ئەو ڕێکەوتنەی نێوان میراتبەرەکان و وەسیەتبۆکراوەکە بەتاڵە بە هۆی نەبوونی هۆکارەکەوە .

٤ ـ ئەگەر لێتێکچونەکە لە بوونی شوێنی ئەو گرێبەستەدا بوو کە بابەتی ئەو پابەندبوونەی لێ بەرهەم دێت: یەکێك لە وێنەکانی ئەوەیە کەسێك ئۆتۆمبیلەکەی بفرۆشێت بە کەسێك کە پێشتر ئەو ئۆتۆمبیلەی بینیوە، بەڵام پاشان دەرکەوت کە ئەم ئۆتۆمبیلە سووتابوو یان دزرابوو پێش ئەنجامدانی گرێبەستەکە، لەم حاڵەتەدا گرێبەستەکە دەخرێتە سەر شوێنێکەوە کە نەبووە لەکاتی گرێبەستەکەدا، کە بریتییە لەو شتەی لای هەردوولا دیاریکراوە .

بەڵام ئەگەر گرێبەستەکە لەسەر شوێنێکی وەها بوو کە بە چەند نیشانەیەك دیاریکرابوو، وەلەو داراییانە بوو کە هاووێنەی هەیە، ئەوا مەرج نییە لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەدا بوونی هەبێت، وەك لە جێگەی گرێبەستی (سەلەم)دا کە بە سیفەتەکانی دیاریدەکرێت .

**دووەم:** شوێنەواری لێتێکچوون یان دەبێتە هۆی پێویستنەبوونی جێبەجێکردن(عدم لزوم)ی گرێبەست، هەروەك لە فیقهی ئیسلامیدا و لای جمهوری زانایانی فیقهدا و ئەو یاسایانەدا کەکاریگەرن پێی وەك یاسای مەدەنی میسری و سوری و لوبنانی کە پێشتر باسمانکرد .

وە لە نموونە پراکتیکییەکانی:

أ ـ لێتێکچون لە سیفەتی شتێکدا کە جەوهەرییە لە لای هەردوو لایەنی گرێبەستەکە یان پێویستە وەها بێت بۆ هەر بارودۆخێك کەتێکەڵە لەگەڵ گرێبەستەکەدا بێت .

ب ـ ئەگەر لێتێکچونەکە لە خودی گرێبەستکارەکەدا یان لە سیفەتەکەیدا روویدات، لە کاتێکدا ئەو کەسە یان سیفەتەکەی هۆکاری سەرەکی بێت بۆ بەستنی ئەوگرێبەستە[1].

**سێیەم:** لێتێکچوونی ناکاریگەر : کە ئەوەیە کە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر گرێبەستەکە نییە، نە لە دروستی و نە جێبەجێبـوون(نفاذ) و پابەنبوونیدا.

وە لە نموونە پراکتیکییەکانی:

أ ـ لێتێکچوون لە وەسفێکی ناریشەییدا.

ب ـ لێتێکچوون لە کەسێکی گرێبەستکاردا کە کەسایەتیەکەی جێگای ئیعتیبار نەبێت لە گرێبەستەکەدا .

ج ـ لێتێکچوون لە نرخی شتەکەدا[2] .

---

[1] تەماشای یاسای مەدەنی سوری (م ١٢٢ )، لیبی (م ١٢١)، لوبنانی (م ٢٠٥) .

[2] بۆ درێژەی ئەم بابەتە سەیری نوسرلومان (نظرية الالتزام برد غير المستحق) بکرێت .

# بەندی سێهەم:
# کاریگەریی کرداری تێکدانی پابەندیی و کاریگەربوونی لێکرازیبوون و شوێنەوارەکانیان لە هەڵسووکەوتی یاساییدا

بە پێی شەرع و یاسا ئەو کەسەی دەیەوێت گرێبەستێك بکات پێویستە لەسەری پابەند بێت بە دەرخستنی ئەو زانیاریانەی پێویستن بۆ بەدیهاتنی گرێبەستێکی راست و دامەزراو و ئامادەی پیادەبوون و دوور لە هەموو کاریگەرییەکی نەرێنی لەسەر توخمی لێکرازیبوون کە زیان بە قازانجی ئابووری لایەنەکەی تر دەگەیەنێت و لەوێشەوە ناتەواوییەك لە هەڵسوکەوتە یاساییەکەدا دروست دەکات.

تێکدانی پابەندبوونی گرێبەستکارانە هەندێکجار لە پابەندبوونی دەرخستنی ئەو زانیاریانەیە کە پێش گرێبەستەکە پێویستە، جاری واش هەیە لە کاتی گرێبەستەکەدایە و جارجاریش تێکدانی پابەندبوونی کەمتەرخەمییە و پاش گرێبەستەکەیە و پێش رادەستکردنە و هەندێکجاریش پاش رادەستکردنە و پێش بەکارهێنانە و هەندێکجاریش پاش بەکارهێنانە .

کەواتە لێکۆڵینەوە لە باسی کاریگەریی کرداری تێکدان و کارتێکرانی لێکرازیبوون بە پێنج باسگە دەکرێت:

**یەکەمیان** تایبەت دەکرێت بۆ: تێکدانی پابەندبوون پێش گرێبەست .[1]

**دووەم:** بۆ تێکدانی کاتی گرێبەست .[2]

---

[1] وەک تێکدانی پابەندبوون بە دەرخستنی ناتەواوییە نادیارەکان .

[2] وەک تێکدانی پابەندبوون بە دەرخستنی زانیارییە پێویستەکانی گرێبەستی بیمە .

**سێهەم:** بۆ پاش گرێبەست پێش رادەستکردن .[1]

**چوارەم:** بۆ تێکدانی پابەندبوون بە دەرخستنی ئەو زانیارییانەی پێویستە پاش رادەستکردن .

**پێنجەم:** بۆ تێکدانی پابەندبوون پاش بەکارهێنان .[2]

## باسگەی یەکەم:
## کاریگەریی تێکدانی پابەند بوون بە دەرخستنی ناتەواوییە پەنهانەکان(پێش گرێبەست)

لە زمانی عەرەبیدا (العیب) لە (عاب یعیب عیباً الشیء ) وەرگیراوە گەر عەیبداری کرد، وە (عیب) چاوگە و بە واتایی ناتەولویە و بە (عیوب) کۆ دەکرێت.[3]

لە زاراوەدا : پێشنیاردەکەین کە پێناسە بکرێت بەوەی: هەرشتێك کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی نرخی شتێك یان سوودەکەی یان هەردووکیان لای بازرگانان یان شارەزایان، هەرشتێکیش یەکێك لە ئامانجە رەواکانی فرۆشراوەکە لە دەست بدات ئەگەر زۆربەی جاران لە جۆرە فرۆشراوانەدا شتی وەها نەبوو، نەبوونی هەر سیفەتێکیش گرنگییەکی تایبەتی لای کڕیار هەیە.

(زەیلەعی)یش لە زانایانی حەنەفی بەم شێوەیە پێناسەی کردووە:[1] ئەو شتەیە کە خاوەن سروشت(فیترەت)ی ساغ نییەتی. ئەم پێناسەیە ناتەواوە، چونکە نەبوونی ئەو سیفەتەناگرێتەوە کە لای کڕیار خوازراوە.

---

[1] وەک تێکدانی پابەندبوون کە لە کەمتەرخەمی لە رادەستکردنی شوێنی گرێبەست و نرخ لە گرێبەستی گۆڕینە وەدا، یان لە شوێنی گرێبەستەکەدا لە بەخشینەکاندا .

[2] وەک تێکدانی بەرهەمهێن یان ئەو کەسەی نوێنەریەتی بۆ ئەو زانیاریە زەرورییانەی پەیوەندی بەو پارە وە هەیە کە بەهەمهێنراوە بۆ بەرکار، وە تێکدانی پابەندبوون بە باسنەکردن یان پابەندبوون بە باسکردنی ئەوەی کە جێگای گرێبەستەکە بە شێوەیەکی گشتگیر یان جوزئی موستەحەققی کەسیتر نییە .

[3] ـ لسان العرب ـ فصل العین ـ حرف البا ء .

گۆڤاری (احكام العدلية) [2] بەم شێوەیە پێناسەی کردووە: ئەو شتەیە کە نرخی فرۆشراوەکە کەمدەکاتەوە. ئەم پێناسەیەش گشتگر نییە، چونکە ناتەواویی قازانج(منفعة) و لەدەستچوونی ئەو سیفەتەی خوازراوە ناگرێتەوە .

یاسادانەری عێراقیش بەم شێوەیە پێناسی کردووە: [3] ئەو شتەیە کە نرخی فرۆشراو کەمدەکاتەوە لای بازرگانان و کەسانی شارەزا یان هەرشتێك یەكێك لە ئامانجە رەواکانی فرۆشراوەکە لەدەست بدات ئەگەر زۆربەی جاران لەو جۆرە فرۆشراوانەدا شتی وەها نەبوو.

ئەم پێناسەیە لە هەموو پێناسەکان نزیکترە لە واقیعەوە لەو رووە وە کە گشتگیرە (جامع ) و نامۆبرە ( مانع).

## شاراوەیی خەوش:

خەوش بە شاراوە دادەنرێت ئەگەر کڕیار سەلماندی نەیدەتوانی ئەو خەوشە بدۆزێتەوە گەرچی بە دیقەتی کەسێکی ئاسایی سەرنجی دابێت . وە خەوشەکەش بە پەنهان دادەنرێت و فرۆشیارە زامنی دەبێت ئەگەر لە کاتی رادەستکردنی دا بۆ فرۆشیار کە وەك کەسێکی ئاسایی دیقەتی بدات یاریبوو .

وە یاسادانەری عێراقی حوکمەکانی خەوشی شاراوەی چارەسەر کردووە لە مادەکانی(٥٥٨ ـ ٥٧٠) لە یاسای مەدەنیدا. بەم کارەشی گرێبەستی فرۆشتن بەو ئیعتیبارەی کە گرنگترین گرێبەستەکانی گواستنەوەی خاوەندارییەتییە، بکاتە بوارێك بۆ دامەزراندنی بنەما گشتگیرەکان بۆ زەمانەتکردنی خەوشە شاراوەکانلە هەموو گرێبەستەکاندا .

ئاشکرایەشە کە پابەند بوون بە دەرخستن و روونکردنەوەی خەوشە شاراوەکان لە پێویستییەکانی دامەزرانی گرێبەستێکی راست و جێبەجێکراو(نافذ) و پێویست (لازم). پێویستەئەم جۆرە روونکردنەوانە راستەوخۆ پێش بەستنی گرێبەستەکە باس بکرێت،

---

[1] زانای هەڵکەوتوو عزالدین عثمان بن علی الزیلعی الحنفی لە پەرتووکەکەیدا ـ تبیین الحقائق ٣١/٤ .
[2] مادەی ٣٣٨ .
[3] مادەی ٢/٥٥٨ لە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی .

چونکە لێکرازی بوون توخمێکی سەرەکی هەموو گرێبەستێکە لە گرێبەستەکانی ئاڵوگۆڕ، توخمی هەرشتێکیش وا پێویستدەکات کە پێش خودی شتەکە بێتە بوونەوە، جا لێکرازیبوون بەدینایەت پێش ئەنجامدانی ئەو شتەی جێگاکەی بەدووره لەو خەوشانەی نرخەکەی کەمدەکاتەوە یان سوودەکەی دادەبەزێنێت، یان دەبێتە رێگر لە بەدیهاتنی ئامانجی دیاریکراو لە بەستنی گرێبەستەکە.

ئەو خەوشانەی کاردەکەنە سەر گرێبەست و بەرپرسیارییەتی و زەمانەتی لێبەرهەم دێت، ئەو خەوشە شاراوانەن کە ئاشکرا و روون نین بە شێوەیەك کە کەسێکی ئاسایی لێی ورد بێتەوە و بیبینێت.

بێگومان لەسەر بناغەی ئەم پێشەکییە لێکۆڵینەوە دەربارەی ناتەواوییە پەنهانەکان پێویستی بە زانینی هەموو ئەو توخمانە هەیە کە خۆی لە مەرجەکان و حوکمەکاندا(شوێنەوارەکاندا) دەبینێتەوە.[1]

بۆیە لێکۆڵینەوەی ئەم باسەمان دابەشکردووە بۆ دوو خواسگە، یەکەمیان بۆ تایبەتە بە توخمەکان و دووەمیش بۆ باسی شوێنەوارەکان.

[1] لەو یاسایانەی باسی توخمەکانی ناتەواوییە پەنهانەکان و حوکمەکانی کردووە ئەم یاسایانەی ئێستان: مەدەنی عێراقی، مادەکانی (٥٥٨ ـ ٥٧٠) و میسری ، مادەکانی (٤٤٧ ـ ٤٥٥) ، ئوردنی " مادەکانی (٥١٢ ـ ٥٢١) .

## خواسگەی یەکەم:
## توخمەکانی ناتەواوییە پەنهانەکان

گرنگترین مەرجی ئیعتیباردانان بۆ خەوشە شاراوەکان بۆ بەدیهاتنی شوێنەوارەکانی لە تێکدانی پابەندبوون بە باسکردنی پێش گرێبەستکردن ئەمانەن:

١ ـ خەوشەکان لەو جۆرە بن کە چاوپۆشی لێناکرێت لە ئاڵوگۆرە ئاسایی و بازرگانییەکاندا. بەڵام ئەو خەوشانەی کەمێك لە نرخ و سوودەکەی کەم دەکاتەوە و نەریت و باو وەهایە چاوپۆشی لێ دەکەن، باسنەکردنی نابێتە کێشە. وە پێوەری چاوپۆشی و نەکردنی چاوپۆشی دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی باوی ئەو وڵاتە.

٢ ـ خەوشەکە کاریگەر بێت: بۆ کاریگەریی تێکدانی پابەندبوون بە باسکردنی خەوش دەبێت خەوشەکە کاریگەری لەسەر گرێبەستەکە هەبێت و بایسی بەرپرسیارییەتی بێت، بە شێوەیەك کە خەوشەکە لە خودی شتەکەدا بێت یان نرخەکەی یان سوودەکەی یان لە ئامانجەکەیدا بێت، لەو خەوشانە بێت کە مەبەستی گرێبەستکارەکە و پاڵنەری بۆ بەستنی گرێبەستەکە دەفەوتێنێت، ئەوەی کە زانایانی یاسا ناوی دەنێن (هۆکاری پاڵنەر).

پێوەری جیاکردنەوەی خەوشی کاریگەر و ناکاریگەر بابەتییە و بە پێی ئەو چوارچێوانەیە کە یاساکان دایدەنێن، بەڵام هەندێکجار کەسییە وەك حاڵەتی بەدینەهاتنی وەسفێکی خوازراو لای گرێبەستکار، یان مەرجێك لەو مەرجانەی گرێبەستکارەکە بەستوویەتەوە بە گرێبەستەکەوە.

٣ ـ خەوشەکە کۆن بێت: مەبەست لە کۆنی ئەوەیە کە لە کاتی لە کاتی گرێبەستەکەدا هەبێت و بەردەوام بێت تا پاش گرێبەستەکەو وەرگرتنی شوێنەکەی(شتی ناتەواو)، یان کاتی گرێبەستەکە نەبێت بەڵام پاش گرێبەستەکە و لای فرۆشیار و پێش رادەستکردنی پەیدا بێت، یان پاش رادەستکردن پەیدا بێت لای فرۆشیار بە هۆکارێکی پێشووەوە یان میکرۆبێکی زیانبەخش کە پێش رادەستکردن هەبوویێت، بەڵام خەوشەکە پاش رادەستکردنی پەیدا بوویێت.

بۆ نموونە ئەگەر ئاژەڵێکی فرۆشراو نەخۆشییەك یان میکرۆبێکی زیانبەخشی تێدا بوو پێش ئەوەی کڕیار وەریبگرێت و پێی نەزانیبوو، ئەوا ئەو خەوشەی هۆکاری راستەوخۆیەی

دەگەڕێتەوە بۆ پێش رادەستکردن بە هەبوو دادەنرێت لە کاتی رادەستکردندا و پێش تەواوکردنی گرێبەستەکە، لێرەوە فرۆشیارەکە بەرپرسە لە تێکدانی پابەندبوون بە باسکردنی ئەو ناتەواوییە گەر پێی زانیبوو.

ئەگەر ئەنجامە نەرێنییەکان گەورە بوون ئەوا فرۆشیارەکە بەرپرسی ئەنجامەکانی دەبێت، گەرچی ئاگای لەو میکرۆبە یان ئەو نەخۆشیە نەبوو.

هەندێکجاریش لەو دارە کڕراوەدا کرمی دارخۆرەی هەیە و پاشان بڵاو دەبێتەوە، لەم حاڵەتەشدا بە ناتەواوی کۆن دادەنرێت.

٤ ـ خەوشەکە شاراوە بێت: تەنها کاریگەر بوون و کۆنی مەرج نین بەڵکو پێویستە شاراوەش بێت.

ئاشکرایە کە دادگەری قبووڵی ئەوە ناکات بەرپرسیارییەتی بخاتە سەرشانی ئەو کڕیارەوە کە شتێکی کڕیوە و خەوشێکی وەهای تێدابووە کە بە سەرنجدانی کەسێکی ئاسایی نادۆزرێتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت فرۆشیار پابەندبوونەکەی نەپاراستووە کە پێش گرێبەستەکە کڕیارەکە لەو خەوشە ئاگادار بکاتەوە[١].

ئەوەی شایانی باسە ئەو پاداشتەی لە ئەنجامی کەمتەرخەمییەکەش پەیدا دەبێت لەبەر خودی خەوشەکە نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شاراوەییەی لەو فرۆشراوەدا هەیە.

ئەوەی ئەم راستییە پتەوتر دەکات ئەوەیە کە فرۆشیار زامنی ئەو خەوشانە ناکات کە کڕیار زانیویەتی یان دەیتوانی بیزانێت گەر وەك کەسێکی ئاسایی سەرنجی لەو شتە کڕراوە بدایە، بە مەرجێك کڕیار ئەوە نەسەلمێنێت کە فرۆشیار دڵنیای کردوەتەوە لەوەی فرۆشراوەکە بێ عەیبە، بە ئەنقەست بە شارینەوەی خەوشەکە ناپاکی لێکردوە.

پێوەری جیاکەرەوەی ناتەواوی ئاشکرا و شاراوە پێوەرێکی کەسییە و بابەتیی نییە، رەنگە خەوشێك لای کەسێکی پسپۆڕ و شارەزا ئاشکرابێت بەڵام لای کەسێکی تر کە پسپۆڕ نییە ئاشکرا نەبێت.

شایانی باسیشە هەندێك ناتەواوی راستەوخۆ پاش وەرگرتن و پشکنینی دەرناکەوێت، بەڵکو لەسەر ئەوە وەستاوە کە ماوەیەك بەکاربهێنرێت کە دەسەڵاتی دادوەری خەمڵاندن

---

[١] مامۆستا السنهوری : الوسیط ٧٢٢/٤.

دیاری دەکات.

بۆ نموونە ناتەواوی لە مەکینەکاندا بە شاراوە دادەنرێت ئەگەر لە تاقیکردنەوەکانی یەکەمجاردا دەرنەکەوت، هەروەها لە ئۆتۆمبێلدا ئەگەر دەرنەکەوت تا پاش رۆشتنی چەند هەزار کیلۆمەترێك.

بەم شێوەیە دۆزینەوەی هەر ناتەواوییەك دەگۆڕێت بەپێی سروشتی شتە فرۆشراوەکە (کە پێی دەوترێت شوێنی گرێبەست).

٥ ـ نابێ کڕیارەکە بەو خەوشە شاراوەیەی زانیبێت پێش گرێبەست و نەشیتوانیبێت کە بزانێت. کەواتە فرۆشیار زامنی ئەو خەوشە نییە کە کڕیار پێش کڕین پێیزانیوە یان دەیتوانی بیزانێت بە سەرنجدانێکی وردی لە فرۆشراوەکە.

بەڵام ئەگەر فرۆشیارەکە لە گرێبەستی فرۆشتندا سەلماندی کە کڕیارەکە بەو خەوشەی زانیبوو پێش گرێبەستەکە یان پێش رادەستکردنی یان دەیتوانی بیزانێت، ئەوا هیچ دەستەبەرییەکی لەسەر نییە بۆ ئەم ناتەواوییە زانراوە کۆنە. چونکە بێدەنگبوونی پاش زانین بە رازیبوون دادەنرێت بەم خەوشە و بە وازهێنانیش دادەنرێت لە مافی زەمانەتی فرۆشیار ، بۆیە ئەگەر فرۆشیار ویستی لەبەرپرسیارییەتی رزگار بێت، دەبێت بیسەلمێنێت کە کڕیار ئاگای لە خەوشەکە هەبووە کاتی وەرگرتنی فرۆشراوەکە و هیچ ناپاکییەکی نەکردووە و هیچ پەیمانێکی نەداوە بەوەی کە فرۆشراوەکە خەوشی شاراوەی تێدا نییە ، یان بیسەلمێنێت کە ناتەواوییەکە ئاشکرا بووە بۆ هەرکەسێکی ئاسایی کە سەیری فرۆشراوەکەی کردبا .

ئاشکراشە کە هەبوونی زانیاری لەسەر شتێك رووداوێکی هەستپێکراوە و فرۆشیار دەتوانێت بە هەموو رێگا یاساییەکان بیسەلمێنێت.

٦ ـ ئاگادارکردنەوەی فرۆشیار بە بێ دواخستن: ئەگەر کڕیار خەوشی شاراوە پاش وەرگرتن دۆزییەوە بە یارمەتی کەسێکی تر، پێویستە لە سەری یەکسەر فرۆشیارەکە ئاگادار بکاتەوە لە ماوەیەکی گونجاودا، وەگەر نا مافەکەی دەفەوتێت لە زامنکردنی فرۆشیاردا بۆ نموونە.

٧ ـ هەردوو گرێبەستکار لە سەر ئەوە رێکنەکەوتبن کە خاوەنی گرێبەست لەسەرکراوەکە بەرپرس نەبێت لەسەر هەر خەوشێ کە لە داهاتوودا دەردەکەوێت. وە ئەم

ڕێککەوتنە قبوولْ دەکرێت و کاریش بە ناوەڕۆکەکەی دەکرێت بە مەرجێك ناپاکی و خڵەتاندنی تێدا نەکرابێت، چونکە هەموو نابەرپرسیارییەك لە ناتەواوی بەتاڵە ئەگەر دەرکەوت کە خڵەتاندن و ناپاکی تێدا کرابوو، لەبەر نەگوتجانی لەگەڵ سیستەمی گشتیی کۆمەڵگە .

٨ ـ نابێت خاوەنەکە چ فرۆشیار بێت چ کڕێدەر یان هاووێنەیان بە ئاشکرا لە کاتی گرێبەستەکەدا باسی هەبوونی ناتەواوییەکەی کردبێت و گرێبەستکارەکەی تریش قبوولی کردبێت سەرەڕای ناتەواوییەکە، مادام ئەم باسکردنەی تێکەڵ بە ناپاکی و فێڵ نەکردبێت، وەگەر نا باسکردنی ناتەواوییەکە گرنگی نییە ، چونکە بەو ناپاکی و فێڵەوەیە کە شتەکەی بەو ناتەواوییەوە وەرگرتووە. بۆ نموونە وەك ئەوەی کڕیارەکە بیسەلمێنێت کە فرۆشیارەکە ئەو ناتەواوییەی شاریوەتەوە کە بە ئاسانی دەکرا بە سەرنجێکی ئاسایی بدۆزرێتەوە. وەك ئەوەی پەیکەرێکی مەرمەڕی کەسایەتییەکی گەورە بفرۆشێت و شکاوییەکی تێدا بێت بەڵام بە دانانی نەخشێك لەسەر جێگا شکاوەکە وەها بگەیەنێت کە ئەو نەخشە بەشێکە لە پەیکەرەکە.

٩ ـ فرۆشتنەکە لەو فرۆشتنانە نەبێت کە دادگا یان فەرمانگەیەك دەیکات، ئەگەر بە ڕێگەی زیادکردنی(موزایەدە) ئاشکرا ئەنجامدرا، ئەوکات فرۆشیار زامنی خەوشە شاراوە کە نابێت گەر لەو زیادکردنەدا و لە لایەن داگاوە فرۆشرا. وەك ئەوەی ماڵی قەرزار بفرۆشرێت بۆ دانەوەی قەرزەکانی لەسەر داوای گلدانەوە(حیجزکردن)ی خاوەن قەرزەکان یان فەرمانگە(فەرمانگە حکومییەکان ڕەسمی بن یان نیمچە ڕەسمی) سەرپەرشتی فرۆشتنی سامانی قەرزارەکە بکات لە زیادکردنەکەدا بۆبەدەستهێنانی سامانەکەی لە گەڕدنیدا بەهۆی نەدانی ئەو باج و زەرییەی کە لە سەرییەتی یان هەر شتێکی لەو بابەتانە، ئەم هەڵاوێردنەش فرۆشتنی ئەو موڵکە شەریکییەش دەگرێتەوە کە بەشبەش ناکرێت لە زیادکردنەکەدا بە ئاگاداریی دادگا[1] .

---

[1] یاسای مەدەنی عێراقی ( م ٥٦٩) ، مەدەنی میسری (م ٢/٤٤٧)، لـەبنانی (م ٤٦٠) ، وە یاسای پابەندبـوونەکانی سـویسری (م ٢٠٠)، مـەدەنی فەرەنسـی (م ١٦٤٢)، یاسـای پابەندبـوونەکان و گرێبەستەکانی مـەغریبی (بەنـدەکانی ٥٤٩ ـ ٥٧٥)، مـەدەنی کـووەیتی (م ٤٨٩ ـ ٤٩٩)، تـونسی ←

## خواستگەی دووەم:
## شوێنەوارەکانی کاریگەریی و
## کارتێکرانی فەلسەفی لە گرێبەستەکاندا

لە ئەنجامی کاریگەریی کرداری تێکدانی پابەندبوون بە دەرخستنی ئەو روونکردنەوانەی پێویستە پێش گرێبەست بدرێن و کاریگەریوونی ویست لەو گرێبەستەدا نیاز هەیە ئەنجام بدرێت چەندین شوێنەواری فەلسەفی یاسایی دێتەدی و ئەنجامە نەرێنی و ئەرێنییەکانی رووەکاتە گرێبەستکاران، ئەنجامەکانیشی کورتدەکرێنەوە لە بژاردەی کڕیار لە نێوان هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە و گێڕانەوەی فرۆشراوەکە و وەرگرتنەوەی نرخەکەیدا و، لە نێوان قبوولکردنی نرخەناویرلوەکە یان کەمکردنەوەی فرۆشیارەکە بۆ نرخەناویرلوەکە، ئەو پرۆسەیەی لە زاراوەی زانایانی شەریعەتدا پێی دەوترێت (ئەرش) کە بریتییە لە جیاوازی نێوان نرخی فرۆشراوەکە بە ساغی و نرخەکەی بە خەوشداری، وە ئەم دیاریکردنی جیاوازییەش لە لای کەسانی پسپۆڕ و شارەزاوە دەبێت.

ئەم دوو ئەنجامەش پێکەوە کۆنابنەوە، چونکە لە رووی چەمك و بەدیهاتن و حوکمەکانەوە ناتەبان، وەك لەم روونکردنەوەیەدا باسی دەکەین:

### یەکەم: بژاردەی خەوش لە نێوان هەڵوەشاندنەوە و رێپێداندا:

ئەو شوێنەوارەی پەیوەندی بە کڕیارەوە هەیە ئەوەیە کە دەتوانێت فرۆشراوە ناتەواوەکە بە نرخی ناویرلو قبووڵ بکات، یان هەڵیبوەشێنێتەوە و فرۆشراوەکە قبوولنەکات[1] و نرخەکە وەربگرێتەوە گەر رادەستی کردبوو، بەمەش هەردوو لایەنی گرێبەستەکە دەگەڕێنەوە دۆخی پێش گرێبەستەکە.

هەڵوەشاندنەوە(وشەی الفسخ لە زمانی عەرەبیدا) بە واتای هەڵوەشاندنەوەی رەهایە.

---

(بەندی ٦٤٧ ـ ٦٧٤)، پرۆژەی یاسای مەدەنی عێراقی (م ٦٥٧ ـ ٦٧٠) دادگای تەمییز ژمارە (١٤٤/حقوقية/١٩٧٠) بڕیار ١٩٧٠/٢/١ النشرة القضائية ع.

[1] ئەگەر مابوو، وە بریتییەکەی ئەگەر نەمابوو.

لە زاراوەدا بەولتای: هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی گرێبەستانەیە بە هۆیەك لە هۆکارە خودی یان وارسییەکانەوە.

هەندێك لە زانایانی یاسا[1] و یاسا عەرەبییە نوێکان[2] هەڵوەشاندنەوە تەنها لەو گرێبەستانەدا دەبینن کە پێویستی سەرشانی هەردوولایەنی گرێبەستەکەیە و یەکێك لە لایەنەکان نایەوێت پابەندییەکەی جێبەجێ بکات.

لەسەر ئەم بناغەیە سێ مەرجیان بۆ هەڵوەشاندنەوە داناوە:

١ ـ پێویستە گرێبەستەکە پابەندکەر (ملزم) بێت بۆ هەردوولا.

٢ ـ یەکێك لە دوولایەنەکە سەرپێچی بکات لە جێبەجێکردنی پابەندییەکانی بە بێ پاساوێکی یاسایی .

٣ ـ پێویستە خوازیاری هەڵوەشاندنەوەکە پابەندییەکەی خۆی بەجێ بهێنێت یان ئامادە بێت بۆ بەجێهێنانی .

بە رای ئێمە سنووردارکردنی هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوە لەو سێ مەرجەدا پشتیوانییەکی عەقڵانیی لۆجیکیی نییە، چونکە هۆکارە پاساودارەکانی هەڵوەشاندنەوە زۆرن، وەك بوونی خەوشێکی شاراوەلە جێگەی گرێبەستەکەدا(واتە ئەو شتەی گرێبەستەکەی لە سەر کراوە) کە پێی دەوترێت بژاردەی خەوش(خیار العیب) .

**لە شوێنەوارەکانی هەڵوەشاندنەوە:**

ئەگەر کڕیار ئەوەی هەڵبژارد کە فرۆشراوەکە هەڵبوەشێنێتەوە لە بری ئەوەی نرخە دیاریکراوەکە وەربگرێتەوە، چەند شوێنەوارێکی یاسایی و شەرعی لێ بەرهەم دێت و لە پێش هەموویانەوە گەڕانەوەی هەردوولایانە بۆ دۆخی پێش گرێبەستەکە و هەردوولایان

[1] مامۆستا سلیمان مرقس، اصول الالتزامات ٣١٠ . مامۆستا د . اسماعیل غانم، سەرچاوەی پێشوو ، ل٣٢٦ . مامۆستا انور سلطان ، سەرچاوەی پێشوو، ٤١٣ و پاشتر.

[2] مەدەنی عێراقی (م ١٧٧) میسری (م ١٥٧ )، سوری (م ١٥٨) لیبی (م ١٥٩) لوبنانی (م٢٣٩).

ئەوەی هەیانبووە وەریدەگرنەوە لە یەکدی و ئەگەر ئەوەش ئەستەم بوو فەرمان دەکرێت بە قەرەبوو بۆ کەسی زیانلێکەوتوو.[1]

ئەوەی شایانی باسە شوێنەواری گەڕاوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست لەو گرێبەستانەدا دەبێت کە جێبەجێکردنیان فەوری بووە و نەمانی پشت بە کاتی بەستنی دەبەستێت و گرێبەستەکە حسابی نەکراوی بۆ دەکرێت و هەریەك لە دووگرێبەستکارەکە ئەوەی لایەتی دەگێڕێتەوە بۆ ئەوی دی.

بە پێچەوانەی ئەو گرێبەستانەوە کە جێبەجێکردنیان بەردەوامە وەك جێبەجێکردنی گرێبەستی کرێ ، کە شوێنەواری گەڕاوەی تێدا ئەستەمە و شوێنەوار لە کاتی هەڵوەشاندنەوەکەوەیەو بەرەو داهاتووە.

بەڵام ئەو شتە زیادە مادییە جودایانەی پەیدا دەبن لە شتی فرۆشراودا فرۆشیارەکە نایگەڕێنێتەوە و لەسەر بنەمای(الغنم بالغرم) یان (الخراج بالضمان)[2] مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و واتاکەی ئەوەیە کە: ئەوکەسەی زەرەر و زیانی شتێك دەگرێتە ئەستۆ هەر ئەو کەسەش شایانترین کەسە بە قازانج و بەرهەمی ئەو شتە، چونکە ئەگەر ئەو شتە فرۆشراوە لە دەستی کڕیاردا پاش وەرگرتن بفەوتێت ئەوا لەسەری دەکەوێت، چونکە زیادەکان پاش وەرگرتن لە مولکداری ئەمدا روودەدات .

### هەڵوەشێنەرانی بژاردەی خەوشداری :

هۆکارەکانی نەهێشتنی بژاردەی خەوشداری زۆرن وەك:

١ ـ دەرکەوتنی ناتەواوییەکی نوێ لای کڕیار.

٢ ـ زیادبوونی شتێکی پێوەنووساوی بەرهەمنەهاتوو بۆ سەر فڤرۆشراو، وەك زیادکردنی ژوورێك بۆ ئەوماڵەی کڕاوە.

٣ ـ مامەڵەکردن لەگەڵ فرۆشراوەکەدا وەك مامەڵەی خاوەن .

٤ ـ گۆڕینی شێوەکەی .

---

[1] مەدەنی عێراقی (م ١٨٠) و میسری (م ١٦٠) و لیبی (م ١٦٢) و لوبنانی (م ٢٤٢) و تونسی (بەندی ٣٣٦) .

[2] گۆڤاری لحکام العدلیة مادەی ٨٥ .

٥ ـ تیاچوونی یان بەکارهێنانی فرۆشراو .

٦ ـ زانین و بێدەنگبوون لەسەر ناتەواوی .

٧ ـ مەرجداریکردنی بێ عەیبی .

٨ ـ ماوەبەسەرچوونی هەڵوەشێنەوە. کە پاشتر بە درێژی باسی دەکەین .

**دووەم: لێکرتن(انتقاص)ی نرخ، (کە پێشی دەوترێت ـ الارش):**

باسی ئەوەمان کرد کە لێگرتنی نرخ بریتییە لە جیاوازی نێوان نرخی شتی فرۆشراو بە ساغی و هەمان شت بە عەیبداری . جا ئەگەر نەکرا پەنا بەرین بۆ هەڵوەشاندنەوە کە بژاردەی کڕیارە بەهۆی خەوشەکەوە، ئەوا فرۆشیار ناچار دەکرێت کە لە نرخەکە کەم بکاتەوە بەمەرجێك بەریەستێك لەئارادا نەبێت، بە پشتبەستن بەوەی کە فرۆشیار زامنی ئەو ناتەواوییە شاراوانەیە کە پابەندبووە بە دەرخستنی بۆ کڕیار پێش گرێبەستەکە، بەڵام ئەو کارەی نەکردووە [1]

**گرنگترین حاڵەتەکانی لێکرتنی نرخ:**

زانایانی یاسا و شەریعەت پاساوەکانی کەمکردنەوە و لێگرتنی نرخیان روونکردۆتەوە لە چەند حاڵەتێکدا کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

أ ـ روودانی خەوشێك لە فرۆشراوەکەدا لای کڕیار پاش وەرگرتنی ، لەم حاڵەتەدا بۆی نییە کە گرێبەستەکە هەڵبووەشێنێتەوە، بەڵکو دەتوانێت داوا لە فرۆشیار بکات کە لە نرخەکە کەم بکاتەوە گەر رازی نەبێت بە هەڵوەشاندنەوە و گێڕانەوەی فرۆشراوەکە و گەڕاندنەوەی نرخەکە سەرەڕای دەرکەوتنی خەوشەکە نوێیەکە لای کڕیار، جا ئەگەر رازی بوو ئەوا گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوە و دەگەڕێنەوە بۆ دۆخی پێش گرێبەستەکە گەر بەریەستێکی تر لە ئارادا نەبوو، بەڵام ئەگەر خەوشە نوێیەکە نەما ئەوا مافی هەڵوەشاندنەوە دەگەڕێتەوە بۆ کڕیار لەگەڵ گەڕاندنەوەی فرۆشراوەکە بە هۆی خەوشە کۆنەکەوەو و وەرگرتنەوەی نرخ .

[1] بۆ سەیری دانراومان (نظرية الالتزامات برد غير المستحق لا ١٣٣ و پاشتر درێژەی پتر.

ب ـ روودانی زیادەیەکی پێوەنووساوی بەرهەمنەهاتوو (زيادة متصلة غير متولدة ) لە فرۆشراوی خەوشداردا دەبێتە بەربەست لە هەڵوەشاندنەوەدا ، لەم حاڵەدا پەنا بۆ داشکاندنی نرخەکە دەبرێت، وەك ئەوەی کەسێك زەوییەکی کڕی و خەوشێکی پەنهانی تێدا بوو و ماڵێك یان پرۆژەیەکی تری لەسەر دروستکرد، ئەم کارە بەربەستی هەڵوەشاندنەوەیە، بۆیە فرۆشیاری زامن لەسەریەتی کە داشکان و کەمکردنەوەی نرخەکە قبووڵ بکات .

بەڵام زیادەی جودا یان پێوەنووساوی بەرهەمهاتوو وەك (کەرە) نابێتە هۆی هەڵوەشاندنەوە و گێڕانەوەی فرۆشراوەکە وەك بەرهەمی ئاژەڵی خەوشدار و بەری درەختی خەوشدار پاش لێکردنەوەی .

ج ـ ئەستەمبوونی گەڕاندنەوە، وەك فەوتانی یەکجاریی فرۆشراوی خەوشدار، وەك سووتان یان فەوتانی حوکمیی، وەك دزران لە دەستی کڕیاردا .

د ـ ئەگەر کەسێکی سێهەم فرۆشراوەکەی خەوشدارکرد، ئەوکات کڕیار سەرپشك دەبێت لەوەدا کە لە گرێبەستەکەدا بەردەوام بێت یان هەڵیبووەشێنێتەوە، ئەگەر بەردەوام بوو و فرۆشراوەکەی قبووڵ کرد ئەوا لە نرخەکەی دادەبەزێنێت، ئەگەر هەڵیوەشاندەوە فرۆشیارەکە پێی دەبژێرێت .[1]

ئەوەی شایانی باسە هەردوو گرێبەستکار دەتوانن یەکدەنگ بن لەسەر ئەوەی زەمان زیاد یان کەم بکەنەوە یان هەر لاشی ببەن، بەڵام هەر مەرجێك زەمان کەمبکاتەوە یان لایببات بەتاڵ دەبێت ئەگەر فرۆشیارەکە بە ئەنقەست و ناپاکی خەوشێك لە فرۆشراوەکەدا بشارێتەوە.

هـ ـ ئەگەر فرۆشیار پێش زانینی بە خەوشەکە فرۆشراوەکەی بەکار هێنا و ئەوەش بووە هۆی کەمبوونەوەی نرخەکەی ، ئەوا ماف هەڵوەشاندنەوەی نامێنێت، بەڵام ماف داواکردنی دابەزاندنی نرخەکەی هەیە .

---

[1] شرح المنهج بحاشية الشيخ سليمان البجيرمي ٢/٢٧٠ .

و ـ ئەگەر پێش زانینی بە خەوشەکە بەکارهێنرا و نەما، ئەوا دەگەڕێتەوە سەر فرۆشیارەکە بۆ داشکانی نرخەکە بە ئەندازەی خەوشەکە.[1]

**سەرچاوەکانی دەستەبەریی خەوشی شاراوە:**

رای باو لە یاسادا ئەوەیە کە سەرچاوەی زەمانکردنی خەوشە شاراوەکان گرێبەستە، چونکەسەرچاوەی پابەندبوون بە باسکردنی ئەو زانیارییانەی پەیوەندی بە خەوشە شاراوەکانەوە هەیە گرێبەستە. بەڵام ئەگەر بەسەرچاوەزانینی گرێبەستەکە راستیش بێت ئەوا بەکەڵکی ئەم پابەندبوونە نایەت کە دەبێت پێش گرێبەستەکە بێت .

راستییەکە ئەوەیە سەرچاوە یاسایە و زەمانیش بە بەرپرسیارییەتی کەمتەرخەمی رێکدەخرێت .

**بناغەی دەستەبەری خەوشی شاراوە:**

بناغەی دەستەبەری فرۆشیار بۆ ئەو خەوشە شاراوەی باسی نەکردووە بۆ فرۆشیار لە پێش بەجێهێنانی گرێبەستەکەدا، ئەم تـوخمە لە گرێبەستی ئاڵوگۆڕدا چ فرۆشتن بێت چ گرێبەستی تر لە راستی و واقیعدا بەدینایەت ئەگەر شتە فرۆشراوەکە خەوشێکی شاراوەی تیابێت نرخەکەی یان سوودەکەی کەم بکاتەوە یان ئامانج و مەبەستی گرێبەستەکە لەدەست گرێبەستکارەکەی دەردەکات ، یان ئەو وەسفەی رەغبەتی لەسەرە یان بە مەرج گیراوە بەدینایەت، پاشان گرنگ ولتا و مەبەستەکانە نەك وتە و بونیادەکان[2] ، رەزامەندیی رووکەشیی بونیادنراو لەسەر نەناسینی واقیع ئیعتیباری پێناکرێت.

**فەلسەفەی دەستەبەریخەوشی شاراوە:**

فەلسەفەی دەستەبەریی خەوشی شاراوە بریتییە لە بەدیهێنانی یەکسانی لە نێوان مافەکان و ئەو پابەندییانەی لە گرێبەستەکەوە سەرهەڵدەدەن ، چونکە ئەگەر مافەکان پتر

---

[1] مەدەنی عێراقی (م٥٦٨) ی میسری (م ٤٥٥) .

[2] گۆڤاری احکام العدلیة (م ٢): الامور بمقا×دها (م٣): العبرة في العقود للمقاصد والمعاني لاللالفاظ و المباني .

بوون لە پابەندبوونەکان خاوەنی جێگەی گرێبەستەکە زیانی پێدەگات، وە ئەگەر پابەندبوونەکان پتر بوون لە مافەکان ئەوا لایەنەکەی تر زیانی پێدەگات .

## بەربەستەکانی گەڕاندنەوە و لێگرتنی نرخ پێکەوە

لە گرنگترین بەربەستەکانی گەڕاندنەوە و لێگرتنی نرخ ئەمانەن:

١ ـ ئاگاداریی فرۆشیار یان جێگرەکەی لە ناتەواوی پێش وەرگرتن.

٢ ـ رازیبوون بەو خەوشە بە راشکاوی یان بە قسەیەکی ناوەدار(ضمناً) پاش وەرگرتن ، وەك داواکردنی (اقالة) واتە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە بە رەزامەندی و دروستکردنەوەی دانەیەکی نوێ پاش ئاگاداربوون لە خەوشە کە، چونکە لە جێگەی رەزامەندی دادەنرێت .

٣ ـ هەوڵدان بۆ چاککردنەوە و چارەسەری خەوشەکە پاش پێزانینی .

٤ ـ نەمانی خەوشەکە پاش دەرکەوتنی بە شێوەیەك هەرگیز چاك نەکرێتەوە .

٥ ـ بەکارهێنان و سوود لێوەرگرتنی فرۆشراوەکە لەلایەن کڕیارەوە پاش ئاگاداربوونی لە خەوشەکە .

٦ ـ ئەگەر فرۆشیار ئەستۆی خۆی ئازاد کرد لە رەگەزی خەوشێك لە کاتی فرۆشتنی شتێکدا، ئەوا ئەوخەوشە نابێتە کێشە بۆ فرۆشتنەکەی، بەڵام لە هەموو خەوشێك رزگاری نابێت بە مەرج .[1]

٧ ـ دواکەوتنی کڕیار لە گێڕانەوە بە بێ پاساو، ئەوە دەگەیەنێت کە بە هەبوونی خەوشەکە رازی بووە .

---

[1] الانوار فی الفقه الشافعی١/٣٤٦ ، بە پێچەوانەی حەنەفییەکانەوە کە : ئەگەر هیچ خەوشێکی تێدا نەبوو دامەزراوە. تبیین الحقائق للزیلعی ٤/٣٤. وە مالیکییەکان دەڵێن (الخرشی ٥/١٢٩) فرۆشیار ئەستۆی ئازاد نابێت لەو ناتەواوییە نەبێت کە پێی نەزانیـوە. وە هەندێک لە زانایانی وە ک زەیدییەکان دەڵێن (المنتزع المختار٣/١١٨): دواکەوتن مافی کڕیار نافەوتێنێت لە گەڕاندنەوە و لێگرتنی نرخ، بەڵکو بە ئەو مافە بە رەزامەندی.و ناتە واوی دەفەوتێت. وە هەندێک رایان وایە وەک شافیعییەکان کە یەکسەر فرۆشراوەکە هەڵدەوەشێتەوە . وە شەعرانی دەڵێت: لای ئیمامی مالیک بڕاردەی ناتەواوی تەنها بە مۆڵەتدان یان بە رەفزکردن دەفەوتێت.(المیزان الکبری للشعرانی ٢/٣٤٦).

٨ ـ هەبوونی ماف کەسێکی تر لە سەر فرۆشراوە خەوشەکە . ئەگەر خستییە بارمتە(رەهن)ەوە و پاشان بە خەوشەکەی زانی، ناتوانێت یەکسەر بیگەڕێنێتەوە یان لە نرخەکەی کەمبکاتەوە، بەڵام ئەگەر بەربەستی گەڕانەوە نەما دەتوانێت لەسەر بنەمای (گەڕانەوەی یاساغ پاش نەمانی بەربەست) بیگەڕێنێتەوە.[1]

## بەربەستەکانی گەڕاندنەوەبە بێ نرخ لێگرتن:[2]

أ ـ فەوتانی فرۆشراو بە تەواوی یان هەندێکی لە دەستی کڕیاردا یان لە دەستی کەسێکی تردا بە مۆڵەتی ئەم، لەم حاڵەتەدا گەڕاندنەوە ئەستەمە و مافی لێگرتنی نرخیش پارێزراوە بۆ کڕیار.

ب ـ چوونەدەرەوەی هەمووی یان هەندێکی فرۆشراوە خەوشدارەکە لە مولکداریی کڕیار هۆی بریتییەوە یان بە بێ بریتی، جا ئەگەر فرۆشتی و کڕیاری دووەم گەڕایەوە سەری بۆ داواکردنی لێگرتنی نرخ، بۆی هەیە ئەمیش بگەڕێتەوە سەر فرۆشیار بە لێگرتن.

بەڵام کڕیاری دووەم گەڕاندییەوە بۆ سەر کڕیاری یەکەم بە هۆی خەوشەوە، ئەوا مافی گەڕاندنەوە بۆ سەر فرۆشیاری یەکەم ئەم وردەکارییەی تێدایە:

ئەگەر گەڕاندنەوەکە بە رەزامەندی هەردوولا بوو ئەوا مافی نامێنێت، بەڵام ئەگەر بە فەرمانی دادوەر بوو ئەوا مافی گەڕاندنەوەی هەیە، بێگومان هەندێك لە زانایانی حەنەفی نهێنی جیاوازی نێوان ئەم دوو حاڵەتەیان باسکردووە[3]

---

[1] مادەی (٢٤) گۆڤاری الاحکام العدلیة (اذا زال المانع عادالممنوع) .

[2] المنتزع المختار ١١٢/٣ و پاشتر .

[3] لە پەرتووکی تبیین الحقائق للزیلعی ـ زانای حەنەفی ـ ٣٧/٤ ـ ٣٨ .( ئەگەر شتێکی کڕی و پاشان فرۆشتی و لەبەر ناتەواوی گەڕاندیانەوە بۆی ، دەتوانێت بیگەڕێنێتەوە بۆ فرۆشیارەکە ئەگەر بە فەرمانی دادگا بۆی گەڕابووبەوە، چونکە گەڕاندنەوە بە فەرمانی دادگا هەڵوەشاندنەوەیەکی هەمەلایەنەیە و وەک ئە وەهایە نەیفرۆشتبێت. وە ئەگەر گەڕاندنەوەکە بە رەزامەندی هەردوولا بوو نەک فەرمانی دادگا، ئەوا ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە بۆ سەر فرۆشیارەکە، چونکە هەڵوەشاندنەوە بە رەزامەندی دوولایەنەکە بە مامەڵەیەکی نوێ دادەنرێت بۆ کەسانی تر، چونکە ویلایەتیان بەسەر کەسانی تردا نییە، بە پێچەوانەی دادوەرەوە کە ویلایەتی گشتی هەیە و بەسەر هەموولایەکدا جێبەجێی دەکات. هەموو ئەمەش لە کاتێکدایە کە گەڕاندنەوەکە پاش وەرگرتن ←

ج ـ ئەگەر لە فرۆشراوی خەوشداردا خەوشێکی نوێ لای کڕیار پەیدا بوو، ئەوا پەیدابوونی ئەم خەوشە مافی کڕیار هەڵدەوەشێنێتەوە لە گێڕانەوە بە هۆی خەوشە کۆنەکەوە، لەوێشەوە مافی بژاردە هەڵدەوەشێنێتەوە بەڵام مافی لێگرتنی نرخی دەمێنێت.[1]

بۆ ئەوەی خەوشی نوێ ببێتە بەربەست، ئەوەیە کە تەنها ڕێگەیەك نەبێت بۆ زانینی ناتەواویی کۆن، وەگەر نا ئازادە لە نێوان وەرگرتنی و داواکردنی لێگرتنی نرخ یان گەڕاندنەوەی و نرخی ئەو لێگرتنە بدات کە بەهۆی ئەو خەوشەوە لای ئەم دروست بووە.

د ـ پەیدابوونی پێوەنووساوی بەرهەمنەهاتوو لە فرۆشراوەکەدا دەبێتە بەربەستێك بۆ گەڕاندنەوە و نابێتە بەربەست بۆ لێگرتنی نرخ.[2]

---

بێت، بەڵام ئەگەر پێش وەرگرتن بوو ئەوا دەتوانێت بیداتەوە بەسەر فرۆشیاری یەکەمدا، گەرچی بە ڕەزامەندییان بێت جگە لە حاڵەتی سزادان، چونکە فرۆشتنی شتی عەیبدار پێش وەرگرتن دروست نییە ، بۆیە ناکرێت بە مامەڵەیەکی نوێ بۆ کەسانی تر، ئیتر بە هەڵوەشێنراوە دانراوە بۆ هەموو لایەک).

[1] لە پەرتووکی الانواردا ٣٤٦/١ (ئەگەر لەو شتانەی کڕی کە ناوەکەی دەخورێت، وەک کاڵەک و هەنار و گوێز..پاشان شکاندی و بینی کە خراپ بووە و نرخی نییە، ئەوا هەموو نرخەکەی دەکەوێتەوە، وە ئەگەر نرخی هەبوو ، ئەگەر تەنها هاوێنەی دەست دەکەوت ئەوا پێویستە لە سەری بیگەڕێنێتەوە بە بێ لێگرتنی نرخ، وە ئەگەر کەمتری لە هاوێنەکەی دەست دەکەوت" ئەوا گێڕانەوە نییە ولێگرتنی نرخی دەکەوێتە سەر) .

هەندێک لە زانایانی وەک زەیدییەکان (المنتزع المختار ١١٣/٣) سێ مەرجیان داناوە:

ا ـ پێویستە خەوشە تازەکە بەهۆی دەستدرێژییەوە بوبێت، بۆیە ئەگەر بەهۆی بەکارهێنانەوە بووبێت بژاردەی نامێنێت.

ب ـ خەوشە نوێکە لەو خەوشانە نەبێت کە تەنها ڕێگایەك بێت بۆ ناسینەوەی خەوشە کۆنەکە.

ج ـ بەهۆی بەڵای سروشتییەوە نەبووبێت.

وە هەندێک لە زانایانی شافیعی و زەیدی مەرجی دووەم و سێهەمیان دانەناوە.

[2] المنتزع المختار ـ سەرچاوەی پێشوو ١١٣/٣، تبيين الحقائق٣٥/٤، كتاب الخلاف للطوسي٦٥/١ ـ ٥٦٢ .

## باسگەی دووەم:
## کاریگەری تێکدانی پابەندبوون لە کاتی گرێبەستدا وە کاریگەربوونی رەزامەندی و شوێنەوارەکەیان

تێکدانی پابەندبوون بە ئاشکراکردنی ئەو روونکردنەوە زەروورییانەی کاتی رێوشـوێنی ئەنجامدانی گرێبەست و لەوێشەوە کاریگەربوونی رەزامەندی ، دەکرێت بیگەڕێنینەوە بۆ دوو جۆر لە تێکدان لە گرێبەستدا:

یەکەمیان: تێکدانی پابەندبوون بە ئاشکراکردنی ئەو روونکردنەوە پێویستانەی لە رێوشوێنی گرێبەستی بیمەدا پێویستە. دووەم: تێکدانی پابەندبوون بە ئاشکراکردنی ئەو روونکردنەوە پێویستانەی لە کاتی گرێبەستی ئەمانەتدا پێویستە. لەسەر ئەم بناغەیەش لێکۆڵینەوە لە بابەتی ئەم باسگەیە دەکرێت بە دوو خواستگەوە، بۆ روونکردنەوە و سوودی پتر.

### خواستگەی یەکەم:
### تێکدانی پابەندبوون بە ئاشکراکردنی روونکردنەوە پێویستەکان لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستی بیمەدا و کاریگەربوونی رەزامەندی و شوێنەوارەکەیان

بیمە: گرێبەستێکە بیمەکار پابەند دەبێت بەوەی ئەندازەیەکی دیاریکراو پارە یان موچەیەکی زنجیرەیی یان هەر بریتییەکی تر بدات بە بیمەبۆکراو یان سوودمەند، لە حاڵەتی روودانی ئەو رووداوەدا کە بیمەی دژ کراوە، ئەمەش لەبەرانبەر چەند قیستێك یان هەر گوژمە پارەیەکی تر کە بیمەبۆکراو دەیدات بە بیمەکار لەبەرانبەر چەند قیستێك یان هەرگوژمەپارەیەك کە بیمەکار پێی دەدات.[1]

---

[1] یاسای مەدەنی جێبەجێکراوی عێراقی (م٩٨٣) . بیمە بۆکراو: ئەو کەسەیە کە ئەو پابەندبوونانە بەجێدەهێنێت کە لەبەرانبەر پابەندبوونەکانی بیمەکاردایە.

←

وا لێرەدا وردکردنەوەی بابەتەکە بە کورتی دەخەینە روو:

**یەکەم: ئەو بنەما یاساییانەی گرێبەستی بیمەی لەسەر وەستاوە:**

بنەماکان زۆرن و لێرەدا هەندێکیان باسدەکەین:

أ - پێویستە بیمەخواز زۆر بە وردی بیمەکەر (کۆمپانیای بیمە) ئاگاداربکاتەوە دەربارەی سنوورەکانی ئەو پابەندبوونەی دەیگرێتە ئەستۆ. وە ئەوەی زانراوە کە کۆمپانیای بیمە نەریتی وەهایە کە ئیستیمارەیەکی چاپکراو دەداتە خواستیاری بیمە و دەبێت ئەو شوێنە بەتاڵانەی کە تێیدایە بە روونکردنەوە پێویستەکان پڕی بکاتەوە، نەك تەنها ئەوەی پەیوەندی بە ئاشکراکردنی بوونی مەترسیەوە هەیە لە بیمەکەدا، بەڵکو پێویستە کۆمپانیا پێش ئەنجامدانی گرێبەستی کۆتایی هەموو باروبۆخە کاریگەرەکانی سەر ئەم گرێبەستە بزانێت.

ب - سەرەڕای ئەوەی کە بیمەکەر دەتوانێت هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی ئەو زانیارییانەی دەیەوێت، وەك ئەوەی چەند کەسێکی پسپۆڕ بنێرێت بۆ دیتنی ئەو بینایەی بیمەی بۆ دەکرێت دژ بە سووتان و زانینی سروشتی ئەو کەرەستانەی لەو بینایەدا بەکارهاتوون یان داوای راپۆرتێکی پزیشکی بکات دەربارەی تەندروستی ئەوکەسەی بیمەی ژیانی بۆ دەکات، بەڵام ناتوانێت وێنەیەکی راستەقینە دەربارەی ترسناکییەکە دەستکەوێت، گەر خوازیاری بیمە لەم بوارەدا هاوکاری نەکات.

هەروەها ناتوانێت نەخۆشییە رابوردووەکانی کەسی بیمەکراو بزانێت ، یان نەخۆشییە زگماکییەکانی خێزانەکەی، لەبەر ئەم هۆیانە و هۆکاری تریشە کە یاسا هاوچەرخەکان لە وڵاتانی جیهاندا داوا لە بیمە دەکات کە بیمەکار لە کاتی رێوشوێنی جێبەجێکردنی بیمەکەدا ئاگای لە هەموو ئەو دۆخانە بێت کە پەیوەندی بە مەترسیەوە هەیە لە رووداو وو مولابەساتی دەوروبەری ئەو مەترسیەی بیمە کراوە، چونکە لە کاتی گرێبەستەکەدا جێگای ئیعتیبارە.

---

وە مەبەست لە (سوودمەند) ئەو کەسەیە کە بیمەکەر نرخی بیمەکەی ئەداتێ، وە ئەگەر بیمەبۆکرلو خاوەنی مافەکە بوو لە نرخی بیمەکەدا، ئەءا هەر خۆی ئەبێتە سوودمەند.

بەڵام پابەندبوونی بیمەخواز درێژنابێتەوە بۆ ئاشکراکردنی هەموو ئەو باروودۆخانەی لەگەڵ مەترسیەکەدان، بەڵکو تەنها ئەو باروودۆخانە باس دەکات کەوا کاریگەری راستەوخۆ یان ناراستەوخۆی لەسەر چارەنووسی گرێبەستەکە هەیە.

**دووەم: سەرچاوەی پابەندبوونی بیمەخواز بە روونکردنەوە پێویستەکان:**

پابەندبوونی خوازیاری بیمە بە ئاشکراکردنی روونکردنەوە پێویستەکان لە کاتی رێوشوێنی تەواوکردنی گرێبەستەکەدا پابەندبوونێکی گرێبەستکارانەی هەڵقوڵاوی گرێبەستی بیمە نییە، بەڵکو پابەندبوونێکی پێش تەواوبوونی گرێبەستەکەیە و پێویستە بەجێ بهێنرێت لە کاتی بەستنی گرێبەستی بیمەدا، چونکە ئەگەر گرێبەستەکە تەولو بوو ئیتر جێگایەك نامێنێتەوە بۆی. سەرچاوەی ئەم پابەندبوونە یاساییە لەوەدایە کە پەیوەندی بە پابەندبوونە یاساییەکانەوە هەیە. ئەگەر ناتەواوی لەو پابەندبوونانەدا پەیدا بوو ئەوکات پەرپرسیارییەتی گرێبەستکار بەرپرسیارییەتیەکی کەمتەرخەمییە و نەك بەرپرسیارییەتی گرێبەستیی.

ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە جۆرەکانی بارودۆخی کاریگەر و ناکاریگەر لەسەر گرێبەستی بیمە بزانین بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١ ـ بارودۆخ لە رووی ئاستەوە یان گشتییە یان تایبەتە:**

أ ـ نموونەی گشتی: تەمەن و مردن لە بیمەی ژیاندا و خێرایی سوتان و زۆرتر دووچاری ترسناکی ئاگرکەوتنەوە بوون لە کەرەستەی بیناکردندا لە بیمەکردنی بینادا.

ب ـ نموونەی تایبەت: نەخۆشیی بیمەبۆکراو بە شێوەیەك ئومێدی چاکبوونەوەی لێ نەکرێت لە بیمەی ژیاندا.

**٢ ـ لە رووی بوون و نەبوونی رۆڵی ویستەوە یان بارودۆخی بابەتییە یان کەسییە:**

أ ـ لەو بارودۆخە کەسیانەی کە دەگەڕێتەوە بۆ ویستی خاوەن بیمە: نییەتهێنانیەتی بۆ بەشداریکردن لە پێشبڕکێی ئۆتۆمبیل.

ب ـ لەو بارودۆخە بابەتییانەی ملکەچ نییە بۆ ویستی مرۆڤ ئەوەیە کە بیمەخواز تووشی نەخۆشییەکی ترسناکی وەك شێرپەنجە و ئایدز بووبێت.

**٣ ـ لە رووی چۆنیەتیەوە یان ئەرێنییە یان نەرێنی:**

أ ـ نموونەی بارودۆخە ئەرێنییەکان: نزیکیی سەنتەری ئاگرکوژێنەوەلەوماڵەی بیمەی بۆ کراوە.

ب ـ نموونەی بارودۆخە نەرێنییەکان: نەبوونی نەردەی ئاسنین لەسەر پەنجەرەی ئەو کۆگایەی بیمەکراوە.

**٤ ـ لە رووی کاتەوە بارودۆخەکان یان رابوردوون یان ئایەندەیین:**

أ ـ نموونەی بارودۆخە رابوردووەکان : بیمەی رابوردوو بۆ زیانی ئەوترسناکییانەی پێشتر هاتۆتە دی و ئەو قەرەبووانەی کە دراون.

ب ـ نموونەی بارودۆخی ئایندەیی : بیرکردنەوەی بیمەخوازی ژیان لە گۆڕینی پیشەکەی لە ئەفسەری ئیعاشەی سوپاوە بۆ ئەفسەری فڕۆکەوان.

**٥ ـ لە رووی باشی و خراپییەوە:**

أ ـ یەکێك لەو بارودۆخە باشانەی یارمەتیدەرە بۆ کەمکردنەوەی ترسناکی، هەبوونی بنکەی پۆلیس لە نزیك ئەو کۆگایەوە کە بیمە کراوە دژ بە دزی .

ب ـ نموونەی بارودۆخی خراپ: ئەو ماڵەی بیمە کراوە دژ بە سووتان نزیك بێت لە کارگەیەکی بەرهەمهێنانی تەقەمەنی.

## شوێنەوارەکانی کاریگەریی تێکدانی پابەندبوونی بیمەبۆکراو و کارتێکرانی ویستی بیمەکار:

هەرکات بیمەبۆکرلو یەکێك لەو پابەندبوونانەی تێکدا کە باسمانکرد، ئەوا سزایانەی بەسەردا دەسەپێنرێت کە لە یاسادا باسکراوە، چ یاسای مەدەنی بێت یان یاسای بیمە. بۆ نموونە:

هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی بیمە: بیمەکار دەتوانێت گرێبەستی بیمە هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر چەسپا بوو کە بیمەبۆکراو یەکێك لە پابەندبوونەکانی نەهێنایە جێ. لە ئەنجامدا نەمانی شوێنەوارەکانی گرێبەستی لێ بەدیدێت تەنها سەبارەت بە داهاتووە وە، چونکە لەو گرێستە جێبەجێکراوە خێرایانە نییە تا هەردوو لایەنی گرێبەستەکە بگەڕێنەوە بۆ حاڵەتی رابوردوو لە گەڕاندنەوەی هەردوولایان بۆ ئەو شتەی لە یەکدی وەریان گرتووە، بەڵکوو لەو گرێبەستانەیە کە جێبەجێکردنیان بە بەردەوامبوونیانە. شوێنەوارەکان تەنها بە نیسبەت داهاتووەوەیە، وە ماف

بیمەبۆکراویش لە قەرەبووکردنەوەدا دەفەوتێت ئەگەر هەڵوەشاندنەوەکە پاش بەدیهاتنی ئەو ڕووداوە بوو کە بیمەکەی دژ کراوە.

وە لە ڕووی کاریگەریی نییەتپاکی ئەوکەسەی ڕوونکردنەوەی درۆ دەخاتە ڕوو یان بێدەنگ دەبێت لە باسکردنی ئەو ڕوونکردنەوانەی زەروورین، یاساکان لەبارەی ئەم کاریگەرییەوە یەکڕا نین ، هەندێکیان جیاوازییان نەکردووە لە نێوان نییەتپاکی و نییەتخراپی[1]

هەندێکیشیان جیاوازییان خستۆتە نێوانیان،[2] ، سزای ئەو کەسەی نییەتی خراپە هەڵوەشاندنەوەی بیمەکەیە بە دەرکەوتنی ئەنجامەکانی لە نەمانی مافی بیمەبۆکراو لە قەرەبووکردنەوەدا، لە کاتێکدا بە ئەنقەست یان ئاگاداربێت لە دانی ڕوونکردنەوەی درۆ یان بە ئەنقەست بێدەنگ بێت لە بەخشینی ڕوونکردنەوە پێویستەکان.

بەڵام بیمەبۆکراوی نییەتپاک ، ئەگەر بیمەبەخش بۆی دەرکەوت کە تێکدانی پابەندییەکە پێش بەدیهاتنی ڕووداوی بیمەدژکراوەکە بوو، گرێبەستەکە دەمێنێتەوە لەگەڵ زۆربوونی مەبلەغی قیستەکاندا، وە گەرنا لە لایەن بیمەبەخشەوە هەڵدەوەشێتەوە، لە حاڵەتی دەرکەوتنی تێکدانی پابەندی لە پاش بەدیهاتنی ڕووداوەکە بوو ئەوا سزاکە سووککردنێکی ڕێژەیی مەبلەغەکانی قەرەبووە.[3]

داوای گرێبەستی بیمەش بە تێپەڕبوونی سێ ساڵ دەفەوتێت لە کاتی ڕوودانی ئەو ڕووداوەوە کە ئەم داوایەی لەسەر دەکرێت.[4]

جا ئەگەر بیمەبۆکراو بە نییەتخراپی شتێکی شاردەوە یان ڕوونکردنەوەیەکی ناراستی پێشکەشکرد، بە شێوەیەك کە کاریگەریی نەرێنی بێت لەسەر بیمەکە، پێویستە لەسەر بیمەدەر لە کاتی هەڵوەشاندنەوەدا ئەو قیستانە بگەڕێنێتەوە بۆ بیمەبۆکراو کە داویەتی یان

---

[1] وەک یاسای بیمەی ئەڵمانی .
[2] وەک یاسای بیمەی فەرەنسی، مادەی (٢١ ـ ٢٢).
[3] بۆ درێژەی پتر لە بابەتەدا تەماشای: دکتۆر عبدالودود، .....
[4] مەدەنی عێراقی (م ٩٨٨).

ئەو ئەندازەیەی لێ بگەڕێنێتەوە کە لە بەرانبەریەوە هیچ ترسناکییەکی نەخستۆتە سەرشان.[1]

## خواستگەی دووەم:
## کاریگەریی تێکدانی پابەندبوون و
## کاریگەریوونی رەزامەندی لە گرێبەستی مورابەحەدا

کاریگەریی تێکدانی پابەندبوون لە کاتی گرێبەستدا ، زۆرجار لەسەر دوو جۆر گرێبەست دەبێت: کە گرێبەستی بیمە و گرێبەستی مورابەحەیە. بێگومان پێشتر ئەوەی پەیوەندی بە گرێبەستی بیمەوە هەبوو باسمان کرد. باس لە تێکدانی پابەندبوون لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستدا دەکەین لە گرێبەستی مورابەحەدا و کاریگەریوونی رەزامەندی وشوێنەوارەکانیان.

مورابەحە لە وشەی (ربح)[2] ەوە وەرگیراوە کە بە واتای زیادەیە. لە زاراوەدا : فرۆشتنێکە بەهەمان نرخی یەکەم لەگەڵ زیادە قازانجێکدا.

مورابەحە : فرۆشتنی ئەو شتەیە کە فرۆشیار خاوەنیەتی بەو پارەیەی پێی کڕاوە لەگەڵ زیادەیەکدا[3] وەك ٪۱۰ . یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی (م ۲/۵۳۰) پێناسەی کردوە بەوەی کە بریتییە لە (فرۆشتنەوە بە وێنەی ئەو نرخی یەکەمەی کە فرۆشیارەکە پێی کڕیوە لەگەڵ زیادە قازانجێکی دیاریکراودا).

### مەرجەکانی فرۆشتنی مورابەحە:

لەم جۆرە گرێبەستانەدا چەند مەرجێك پێویستە کە لە راستیدا چەند پابەندبوونێکە کە بوونیان پێویستە لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستدا و گرنگترینیان ئەمانەن:

---

[1] مەدەنی ئوردونی جێبەجێکراو (م ۹۲۸).

[2] لسان العرب، الفصل الرابع، حرف الحاء .

[3] بدائع الصنائع فی ترتیب الشرائع، لأبی بکر بن مسعود الکاسانی .

١ ـ پێویستە گرێبەستی یەکەم کەوا گرێبەستە نوێیەکەی لەسەر کراوە راست بوو بێت، چونکە مورابەحە فرۆشتنێکە بەهۆی نرخی ناوبراوی یەکەمەوە پەیدا بووە و لەسەری راوەستاوە، ئەمەش راست و دروستبوونی گرێبەستە پێشووەکە دەخوازێت.

٢ ـ دەبێت کریاری دووەم راستگۆ بێت لە باسکردنی ئەندازەی گرێبەستلەسەرکراو لە فرۆشراو و نرخ بۆ کریاری نوێ، جا ئەگەر زیادەیەك بەرهەمهات لە فرۆشراوەکەوە پێویستە باسبکرێت لای کریار چونکە بەشێکە لە فرۆشراو.

٣ ـ پێویستە نرخەکە لەو شتانە بێت کە هاوێنەی هەبێت، چونکە مورابەحە فرۆشتنە بە هەمانئەندازەی نرخی یەکەم لەگەڵ زیادەیەکدا، ئەم جۆرە فرۆشتنانە عادەتەن تەنها بەو نرخانە دەکرێن کە هاوێنەیان هەبێت وەك پارە و شتی پێوانە وکێشانە و ئەندازەدار و ژمێرراوەکان.

٤ ـ پێویستە لەسەر فرۆشیار ئەو خەوشە شاراوە باس بکات کە لە فرۆشراوەکەدا هەیە، چ لای خۆی پەیدا بووبێت یان لای فرۆشیاری یەکەم، یان لە ئەنجامی هۆکارێکی پێش وەرگرتن لە فرۆشتنی یەکەمدا پەیدا بووبێت.

٥ ـ هەروەها پێویستە فرۆشیار هەموو ئەو شتانە باس بکات کە دەکرێت کاریگەریی لەسەر گرێبەستلەسەرکراو دابنێن، وەك ئەوەی بێدەنگ بێت یان خەوشێك بشارێتەوە لە فرۆشراوەکەدا پێش رادەستکردنی لە لایەن کریارەوە، هەروەك کرین بە کاش یان بە دواخستن یان قیست، چونکە دواخستن و قیست رۆڵێکی دیاریان هەیە لە زیادوکەمکردنی نرخدا. وە بناغەی ئەم پابەندبوونەش ئەوەیە کە نرخی دواکەوتوو گرانترە لە نرخی ئێستا، بۆیە ئەو کەسەی مورابەحە دەکات باش ئاگای لە خۆی بێت و ئەوەی کە باشە بۆخۆی هەڵی بژێرێت، دەتوانێت بگاتە بریارێك کە خۆی لێی بەرپرسە پاش ئەوەی ئەو زانیارییانەی دەستکەوت کە گونجاوە لەگەڵ ئەو ئەمانەتدارییەی لەم مامەڵەیەدا گریمانەکراوە.

پوختەی قسان ئەوەیە دروست نیە بۆ کەسێك شتێکی بە قەرز(نەسیئە)کری دوایی بە مورابەحە بیفرۆشێتەوە تاوەکو بۆ کریارەکە روون نەکاتەوە کە بە نەسیئە کریویەتی، چونکە فرۆشتنی مورابەحە ئەمانەتێکە هەموو تۆمەت و خیانەتێکی لێ دوور دەخرێتەوە و لە هەموو درۆیەك دەپارێزرێت.

٦ ـ پێویستە فرۆشیار ئەو زیادە بەرهەمهاتووە باس بکات کە لە فرۆشراوەکەوە سەری هەڵداوە، وەك بەچکەی ئاژەڵ و بەری باخ و هاووێنەکانیان. کەواتە دروست نییە بۆ فرۆشیار کە مورابەحە بکات تا ئەو جۆرە زیادانەی باسکران باس نەکات، چونکە ئەو زیادانە بە بەشێکی جیابوویەوە دادەنرێت لە گرێبەستلەسەرکراو(فرۆشراو)، ئەوەش لە نرخەکە دەردەکرێت یان لەگەڵ ئەسڵە فرۆشراوەکەدا رادەست دەکرێت.

بەڵام سوودوەرگرتن لە فرۆشرلو لەو شتەی کە زیدەی بەرهەمهاتوو نییە وەك نیشتەجێبوون لە ماڵی کڕراودا و بەکارهێنانی ئۆتۆمبیل، ئەگەر ئەو بەکارهێنانە نەبوە هۆی کەمبوونەوەی نرخی فرۆشراو یان سوودەکەی یان پەیدابوونی ناتەواوییەك تێیدا. ئەگەر هیچ کاریگەرییەکیشی لەسەر فرۆشراوەکە نەبوو ئەوکات پێویست نییە لەسەر فرۆشیار باسی بکات.

٧ ـ ئەگەر بناغەی فرۆشتنی یەکەم رێککەوتن (سولحکردن) بوو لە سەر شتێکی ناکۆکی لەسەر ئەوا پێویستە لەسەر فرۆشیار باسی بکات، چونکە یەکلاکردنەوەی ناکۆکی لە رێگەی سولحەوە بەو شێوەیەی کە لایەکیان شتێك بفرۆشێت بەوی دی، کاریگەریی لە سەر نرخی راستەقینەی فرۆشراوەکە هەیە، لەبەرئەوەی کەسی ناکۆك رەنگە شتی ناکۆکی لەسەر بە نرخێکی پتر یان کەمتر لە نرخی راستەقینە بکڕێت بۆ ئەوەی ناکۆکییەکە لە رێگەی سولحەوە چاربکرێت.

٨ ـ پێویستە فرۆشیار ئاستی خزمایەتی خۆی لەگەڵ فرۆشیاری پێشوو باس بکات، وەك پەیوەندی هاوسەری و خزمایەتی، چونکە ئەم پەیوەندییە هەندێکجار کاریگەری لەسەر نرخەکە دادەنێت، رەنگە نرخەکە لە نرخی راستەقینە زۆرتر بێت یان رەنگە کەمتریش بێت، وەك ئەوەی بۆ خاترگرتن(موحابات) نرخەکە لە نرخی راستەقینە کەمتر بێت، لە حاڵەتی پێدانی نرخی پتر لە نرخی ئەسڵی لەبەر رەچاوکردنی پەیوەندی هاوسەریی یان خزمایەتی، فرۆشیار پابەند دەبێت بە باسکردنی بۆ کڕیار لە فرۆشتنی مورابەحەدا، چونکە لەو فرۆشتنانەیە کە پشت بە ئەمانەت و متمانە و نیەتباشی لە مامەڵەدا دەبەستێت. کەواتە هەموو تێکدانێکی ئەم پابەندبوونە بە ناپاکی دادەنرێت لە ئەمانەتدا و لەوێشەوە کار دەکاتە سەر رەزامەندی کڕیار ئەگەر ئەم راستیە بزانێت.

## شوێنەوارەکانی کاریگەریی تێکدانی پابەندبوون و کارتێکرانی رەزامەندی لە فرۆشتنی مورابەحەدا:

لە ئەنجامەکانی فەلسەفەی کاریگەریی تێکدان و کارتێکرانی لێکرازیبوون لە بەرپرسیارییەتی فروشیاریی تێکدەری پابەندبوونی و کەوتنەسەرشانی ئەنجامەکانی کارە ناڕەواکەی، ئەوەیە کە کڕیار لە حاڵەتی سەلماندنی تێکداندا سەرپشك دەکرێت لە نێوان قبوولکردنی فرۆشراوەکە بە نرخی دیاریکراو سەرەڕای پابەندنەبوونی فرۆشیار و وازهێنان لە مافی خۆی، یان گەڕاندنەوەی فرۆشرلو و وەرگرتنەوەی نرخەکە یان داواکردنی جیاوازی یان قەرەبووی ئەو زیانەی تووشی بووە.

هەموو توخمەکان و حوکمەکانی فرۆشتنی مورابەحە لە گرێبەستەکانی تری ئەمانەتەکاندا هەیە وەك ئەمانەی خوارەوە:

أ ـ فرۆشتنی لێکەمکردن (بيع النقيصة يان الوضيعة): کە پێچەوانەی فرۆشتنی مورابەحەیە، واتە فرۆشتن بە وێنەی هەمان نرخی یەکەم کە فرۆشیارەکە پێی کڕیوە لەگەڵ لێکەمکردنەوەیەکی دیاریکرلو، وەك ئەوەی بڵێت بە کڕیار :ئەم شتەم پێ فرۆشتی بەوەندەی لەسەرم کەوتووە لەگەڵ داشکانی ١٠٪ .

ب ـ فرۆشتنی هاوبەشکردن لە فرۆشراودا (بيع الاشراك): ئەوەیە کە کڕیاری یەکەم کەسێکی تر بکات بە شەریك لە بەشێکی فرۆشراوەکەدا وەك: نیوەی یان چارەکێکی بەرانبەر هەمان ئەندازە لە نرخەکەی، یان بە ئەندازەی مەسرەف و تێچوونەکەی.

ج ـ فرۆشتنەوە بە هەمان نرخی کڕین (بيع التولية): ئەوەیە کە کڕیار فرۆشراوەکە بەوەی لەسەری بونیادنراوە بفرۆشرێتەوە بە بێ قازانج و زیان.

ئەم چوار جۆرە گرێبەستە لە زاراوەی زاناکانی فیقهدا بە گرێبەستەکانی (ئەمانات) دەناسرێن، چونکە لەسەر بناغەی متمانە و بروا و نیەتپاکی بونیادنراون و بەم رادەیە لە گرێبەستەکانی تردا نین.

# باسگەی سێهەم:
# کاریگەریی تێکدانی پابەندبوون و کارتێکرانی خاوەنداریی پاش گرێبەست و پێش رادەستکردن

لە گرنگترین پابەندبوونەکانی فرۆشیار - بۆ نموونە - پاش دامەزرانی گرێبەست و پێش رادەستکردنی فرۆشراو بە کڕیار یا نوێنەری ئەو ، لە رووی سروشتی جێگای ئەم پابەندبوونە(شتی گرێبەستلەسەرکراو)وە دوو جۆرە:

**یەکەم:** پابەندبوون بە گواستەوەی خاوەندارییەتی شتی گرێبەستلەسەرکراو بۆ کڕیار.

**دووەم:** رادەستکردنی هەموو خاوەندارییەکە.

هەریەك لەمانەش خواستگەیەکی بۆ تایبەت دەکرێت بۆ روونکردنەوە و سوودی پتر.

ئەوەی شایانی باسە کە نموونە پراکتیکییەکان گەرچی لە فرۆشتندایە، بەڵام بەسەر هەڵسوکەوتە یاساییەکانی تردا جێبەجێ دەبێت. ئەریتی زانایانی یاسا و فیقهی ئیسلامییش وەهایە کە تەنها باسی توخمەکان و حوکمەکانی گرێبەستی فرۆشتن بکەن و حوکمەکای گشتگیر بکەن بەسەر گرێبەستەکانی تردا، بۆ دوورکەوتنەوە لە درێژدادری .

## خواستگەی یەکەم:
## تێکدانی پابەندبوون بە گواستنەوەی خاوەندارییەتی پاش بەستنی گرێبەست

**ئەسڵ** لە هەموو گرێبەستێکدا ئەوەیە کە لەگەڵ بەسرانی گرێبەستەکەدا خاوەندارییەتیش دەگوێزرێتەوە، چونکە لە شوێنەوارەکانی گرێبەستی دامەزراوە، چونکە شوێنەوارەکانی هەر گرێبەستێك پاش دامەزران و جێبەجێبوونی بریتییە لە مافەکان و پابەندبوونە بەرانبەرەکان، بۆ نموونەلە مافی کڕیارە کە خاوەندارییەتی جێگای گرێبەستەکە(فرۆشراو)ی دەسکەوێت، وە بەشێك پابەندبوونەکانیەتی نرخەکە بداتە دەست فرۆشیار، هەروەك چۆن یەکێك لە مافەکانی فرۆشیار ئەوەیە ببێتە خاوەنی نرخەکە، وە بەشێك لە پابەندبوونیشی ئەوەیە کە ئەو شتەی گرێبەستی لەسەر کراوە رادەست بکات.

بەڵام هەندێك هەڵاوێردن لەم ئەسڵەدا هەیە، هەندێك گرێبەست خاوەندارێتی ناگوێزێتەوە لەبەر چەند هۆیەکی ناوەکی(ناو گرێبەست) و دەرەکی (دەرەوەی گرێبەست)، کە دەبێتە هۆی نەگواستنەوەی مافی خاوەندارێتی سەرەڕای پەیدابوونی پابەندی لەگەڵ کردنی گرێبەستەکەدا لە هەموو گرێبەستەکاندا بە مەرجێك دامەزراو وئامادەی جێبەجێکردن بێت.

لەم هەڵاوێردنانە : گرێبەستە عەینییەکان کەوا گواستنەوەی خاوەندارییەتی تەنها بە رادەستکردن دەبێت. وە ئەو گرێبەستانەی بەسەر ئەو شتە هاوێنەدارانەدا دەکرێت کە بە جۆر یان پۆل یان سیفەت دیاری دەکرێن لە داراییە هاوێنەدارەکان، خاوەندارییەتی شوێنی فرۆشتنەکە ناگوێزێتەوە بۆ لایەنەکەی تر بە جیاکردنەوە نەبێت.

نموونەی تری ئەم گرێبەستانە فرۆشتنی ماڵ لە دەرەوەی بازنەی تایبەتە لە هەندێك یاسادا. هەموو ئەم گرێبەستانە پابەندبوون بەدیدێنن نەك ماف، وەك لەم روونکردنەوەی خوارەوەدا هەیە:

### یەکەم: گرێبەستە راستینەکان(عەینییەکان):

زانایانی یاسا بە هەڵە پێناسەیان کردووە، کە وتوویانە: ئەو گرێبەستانەیە کە تەنها بە لێکڕازیبوون تەواو نابێت گەر شوێنی گرێبەست(بابەتی گرێبەست لەسەرکراو) رادەستی لایەنەکەی تر نەکرێت.

ئەم گرێبەستانەش پێنج جۆرن کە بریتین لە: گرێبەستی بارمتەی قەرزپارێز(الرهن الحيازي)، گرێبەستی خواستن، گرێبەستی سپاردە(وديعة)، گرێبەستی بەخشینی گواستراوە، گرێبەستی قەرز.

وە فیقهی ئیسلامییان بەوە تاوانبار کردووە کە لە ناو گرێبەستەعەینییەکاندا نوقم بووە، وە رادەستکردن یەکێکە لە پایەکانی. لە کاتێکدا فیقهی ئیسلامی بەرییە لەم تۆمەتە، بەڵکو رادەستکردن لە تەرازووی ئەم فیقهەدا پایە نییە و مەرجیش نییە بۆ دامەزراندن و راستبوونی ، بەڵکو تەنها بە رەزامەندی هەردوولا و بوونی ویستی هەردوولا لەسەر کردنی دادەمەزرێت.چونکە پابەندبوون لە شوێنەوارەکانیەوە بەرهەمدەهێنێت نەك ماف ، بۆیە وتوویانە گرێبەستە عەینییەکان بە رادەستکردن نەبێت دانامەزرێن، کەواتە مەبەست(شوێنەوارەکانی نایەنە جێ لە کۆی مافەکان و پابەندبوونەکان)، بەڵکوو لە ئەنجامیەوە هەندێك شوێنەوار پەیدا دەبێت (کە پابەندبوونەکانە) و هەندێك شوێنەواریشی لێ پەیدا نابێت ( کە مافەکانە) مەگەر کاتی رادەستکردن .

دەستەواژەی(لا تتم ـ تەواو نابێت) لە مادەی (٦٠٣) لە یاسای جێبەجێکراوی مەدەنی عێراقیدا( بەخشین تەواو نابێت(لاتتم) لە گواستراوەدا بە رادەستکردن نەبێت) لێکدانەوەکەی لە لایەن وتارزانانی یاساوە بە (نائامەزرێت) هەڵەیەکی بڵاوە، چونکە مەبەست لەو دەستەواژەیە بەدینەهاتنی هەموو شوێنەوارەکانیەتی نەك نەبوونی هەموو توخمەکانی . دەستەواژەی (لاتتم ـ تەواو نابێت) لە وتەی فەقیهەکاندا بە نیسبەت ئەم گرێبەستانەوە روو لە توخمەکان ناکات(پایە و مەرجەکان) بەڵکو روو دەکاتە شوێنەوارەکان و هەندێکیان بەرهەم دێنێت(پابەندبوونەکان) و هەندێکیشیان بەرهەم ناهێنێت(مافەکان) مەگەر بە رادەستکردن وەك ئەمانەی خوارەوە:

أ ـ گرێبەستی بەخشینی گواستراوە: پابەندبوونی بەخشەر بە رادەستکردنی بەخشراو بە پێبەخشراو بەدی دەهێنێت، بەڵام کەسی دووەم هیچ مافێکی نابێت لە فرۆشراوەکەدا لە دەسکاری کردن و بەکارهێنان و بەهەمهێنان مەگەر پاش وەرگرتنی:

ب ـ گرێبەستی بارمتەی قەرزپارێز: ( ئەوەی کە رەهن تیاکراوەکە دراییەکی گواستراوە بێت) پابەندبوونی قەرزاری بارمتەدەر بە رادەستکردنی بارمتەکراوەکەوەی لێوە بەرهەم دێت، بەڵام قەرزدەری بارمتە وەرگر ماف فرۆشتنەوەی بارمتەکەی نیە (بۆ ئەوەی لە نرخەکەی قەرزەکە وەریگرێتەوە گەر پاش تێپەربوونی کاتی قەرزەکە نەدرایەوە) تا وەرینەگرێت.

د ـ گرێبەستی خواستن: بریتیە لە رەوادانی بەکارهێنان(ئیباحە) یان بەخشینی سوودی دراییە خواستراوەکە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە بێ بەرانبەر، ئەم گرێبەستە پابەندبوونی (خواستەبەخش ـ معیر)ەکەی لێ بەرهەم دێت بە رادەستکردنی دراییە خوازراوەکە بە پێی گرێبەست و پەیماندانەکە، بەڵام خواستەگر(مستعیر) مافی دەستکاری و بەکارهێنان و سوودلێگرتنی نیە تا وەرینەگرێت.

هـ ـ گرێبەستی سپاردن: پابەندیی سپاردەدەر(المودع) بە رادەستکردنی سپاردە بە سپاردەگری لێ بەرهەم دێت، بەڵام تا وەرینەگرێت هیچ مافێکی لێ بەرهەم نایەت وەك گرێبەستی پارەدانان لە بانکدا .

**شوێنەوارەکانی کارتێکردن و کارتێکران:**

تێکدانی ئەم پابەندییانە و هەروەها کاریگەربوونی ماف مولکداری پێی، بەرپرسیاریەتی ئاینی و گرێبەستی لێوە بەرهەم دێت.

بەرپرسیاریەتی ئاینی لە فەرموودەی قورئانەوە وەردەگرین کە دەفەرمێت:﴿ وأوفوا بالعهد أن العهد كان مسئولا﴾. سورە الاسرا ـ ٣٤

بەڵام بەرپرسیارییەتی گرێبەستیی کەوتنەسەرشانی ئەو ئەنجامانەی قەرزارە کە بەهۆی تێکلنی پابەند نەبوونیەوە دێتە رێی، بۆیە بەرپرسیارییەتی قەرەبووکردنەوە کە دەکەوێتە سەری بۆ هەر زیانێك لەم کەمتەرخەمیەوە دروست دەبێت، بە بەرپرسیارییەتی گرێبەستییە، چونکە بە هەبوونی (پێشنیاز) و (رەزامەندی ـ قبوولکردن) گرێبەست دادەمەزرێت.[1]

**دووەم: فرۆشتنی هاوێنەداری بە جۆر(نوع) یان بە پۆل(صنف) یان سیفەت دیاریکراو:**

ئاشکرایە یەکێك لە مەرجەکانی دامەزرانی هەر گرێبەستێك ئەوەیە کە جێگاکەی(بابەتی مامەڵەکە) وەك خوێنێکی بەرجەستە دیاریکرابێت، وەك لە حاڵەتی بینین و ئاماژە پێکردن، یان لە رووی جۆر و سیفەت و تایبەتمەندییەکانەوە بناسرێت. فرۆشتنی هەر شتێکی گواستراوەی دیاریکراو بە جۆر و پۆل و سیفەتەکان خاوەندارییەتی فرۆشراو ناگوێزرێتەوە بۆ کڕیار تا جیانەکرێتەوە لە رێگەی پێوانە(الکیل) یان کێشان یان ژماردن یان ئەندازەگرتنەوە(القیاس).

پێشنیار دەکەم دەربڕینی (جۆر) بگۆڕدرێت بە (پۆل) چونکە شتی مامەڵە لەسەرکراو پێویستە بە پۆل دیاری بکرێت، لەبەر جیاوازی نرخی جۆر بە پێی گۆڕانی پۆلەکانی وەك جۆرەکانی برنج و خورما و شتی تری لەم جورە.

ئەوەی شایانی باسە کە خاوەندارییەتی لە کاتی جیاکردنەوەکەوە دەستپێدەکات نەك لە کاتی کردنی گرێبەستەکەوە، واتە ئەم خاوەندارییەتییە کاریگەریی گەڕاوەی نییە، بەڵام فرۆشتنی گواستراوەی هاوێنەدار (المنقول المثلي)بە گوترە، لەم بنەمایە جیادەکرێتەوە و خاوەندارییەتییەکەی لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەوە دەبێت وەك فرۆشتنی شتی گواستراوەی دیاریکراو بە خودی خۆی، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بەرهەمە کشتوکاڵییەکەی بە گوترە فرۆشت، ئەوا

---

[1] بۆ درێژەی پتر سەیری ئەم سەرچاوە فیقهییانەی خوارەوە بکە:
لە فیقهی حەنەفیدا: بدایه المبتدی بشرح الهدایه ـ للمیرغینانی ١٢٤/٤ .
لە فیقهی مالیکیدا: الشرح الصغیر ـ للدردیر. ١٠٤/١ .
لە فیقهی حەنبەلیدا: المغنی ـ ابن قدامه. ٢٦٤/٤ .
لە فیقهی زەیدیدا: الروض النضیر. ٢٤/٤ .
لە فیقهی ئیمامیدا: شرئع الاسلام ـ الحلی . ٦٦/١ .
هەر لەم بارەیەوە سەیری دانراومان بکە: نظریة الالتزام برد غیرالمستحق ـ لا ١٢٢ و پاشتر .

خاوەندارێتییەکەی لە کاتی پەیدابوونی بەرهەمەکەوە دەبێت، گەر ڕێکەوتنیان لەسەر پێچەوانەی ئەم بابەتە نەکردبێت.

پێوەری جیاکردنەوەی نێوان گوترە و دیاریکردن بە پۆل ئەوەیە کە فرۆشیار لە دووەمەکەدا شتێکی دیاریکراو بە پۆل دەفرۆشێت لە سەر بناغەی پێوەرێکی دیریکراو لە پێوانە و کێشانە و ئەندازە و ژماردن، بە پێچەوانەی فرۆشتنی گوترەوە کە هیچ پێوەرێك لەم پێوەرانە بەکارناهێنێت لە کاتی ڕادەستکردندا.

### شوێنەوارەکانی تێکدانی پابەندبوون بە گواستنەوەی خاوەندارێتی بە جیاکردنەوە:

ئەگەر فرۆشیار هەڵنەدەسا بە جێبەجێکردنی پابەندبوونەکەی بە گواستنەوەی خاوەندارێتی لە ڕێگەی جیاکردنەوەوە، کڕیار دوو بژاردەی هەیە:

یەکەم: دەتوانێت گواستراوەیەك لە هەمان پۆل بکڕێت پاش ئاگادارکردنەوەی فرۆشیار و وەرگرتنی مۆڵەت لە دادگا[1] و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای فرۆشیار بۆ وەرگرتنەوەی ئەو نرخەی کە شتەکەی پێ کڕیوە و ئەو مەسرەفانەی کردوویەتی بۆ بەدەستهێنانی فرۆشراوەکە.

دووەم: فرۆشیار دەتوانێت داوای نرخی شتە فرۆشراوەکە بکات.

جگە لەم دوو بژاردەیە کڕیار مافی ئەوەی هەیە داوای قەرەبوو بکاتەوە بە هۆی ئەو زیانەی پێیگەشتووە لە ئەنجامی ئەوەی فرۆشیاری پابەندکار ئامادە نەبووە پابەندبوونەکەی جێبەجێ بکات لە ڕێگەی جیاکردنەوە وە ئەگەر قەرزدەر بتوانێت ئەم زیانە بسەلمێنێت.[2]

### سێهەم: گواستنەوەی خاوەندارێتی خانووبەرە (العقار):

فرۆشتنی نەگوێزراوە دانامەزرێت مەگەر لە فەرمانگەی تایبەت (فەرمانگەی تۆمارکردنی خانووبەرە) تۆمار کرابێت و بەو شێوەیەی کە یاسا باسی کردووە کرابێت.[3]

---

[1] وە دەتوانێت بە بێ مۆڵەتی دادگا بیکڕێت لە حاڵەتی پەلەکردندا ، بە شێوەیەک بارودۆخەکە بوار نەدات بە دواخستن تا کاتی مۆڵەت.

[2] یاسای مەدەنی ئێستا (م ٢/٢٤٨) .

[3] مادەی (٥٠٨) لە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی.

ئەو ڕێوشوێنە رووکەشانەی پێویستە بگیرێتە بەر بۆ تۆمارکردن لە فەرمانگەی تۆماری عەقاری تەنها بۆ پاراستنی مافەکانی خەڵک و زەمانەتی جێگیربوونی مامەڵە داراییەکان.

ئەندازەی سوودی راستاندن(توثیق)ی پەیماندان بە گواستنەوەی خاوەندارییەتی لای دادنووس (دادنووس)پێش تۆمارکردن لە فەرمانگەی تایبەت:

دادنووس ئەم راستاندنە ناکات چونکە لە دەرەوەی پسپۆری خۆیەتی[1] ئەگەر ئیعتیبار بە فرۆشتنی خانوویەرە لە دەرەوەی بازنەی پسپۆڕ بێت، هیچ پابەندبوونی لێ وەدی نایەت و گواستنەوەی خاوەندارییەتی لێ وەدی نایەت. کەواتە پاداشتی تێکدانی فرۆشیار بۆ ئەو پەیمانەی بە تۆمارکردنی لە فەرمانگەی تایبەت چیە؟

پاداشت قەرەبووکردنەوەیە چ بە مەرج گیرابێت لە پەیمانەکەدا یان نا بە مەرجێك ئەم قەرەبووکردنەوەیە کەمتر نەبێت لە جیاوازی نێوان نرخی ئەو عەقارەی لە پەیماننامەکەدا دیاریکراوە و نرخەکەی لە کاتی مل نەداندا بە بێ ئەوەی قەرەبووی زیانێکی تر تێك بچێت.[2]

لە بەر زۆری حاڵەتەکانی تێکدانی پابەندی فرۆشیار بە گواستنەوەی خاوەندارییەتی مخانوویەرە لە رێگەی تۆمارکردنی گرێبەست لە فەرمانگەی تایبەت، بریاری (ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) ی هەڵوەشاوە ژمارە(١١٩٨) لە ١٩٧٧/١١/٢ کە لە برگەی (أ) دا ئەو بریارە دەدات کە باسکرا.

هەروەها لە برگەی (ب) ی دا هاتووە کە ( ئەگەر کەسی پەیمانپێدراو نیشتەجێ بوو لەو مولکەدا کە پەیمانەکەی لەسەر دراوە یان چەند بینایەك یان دەمەزراوەی تری تیادروستکرد بە بێ دژایەتیەکی نووسراوەیی لە پەیماندەرەوە، ئەوە بە هۆکارێکی راست و دروست دادەنرێت و رەوای دەکات بۆ پەیمانپێدراو ببێتە خاوەنی مولکەکە بەو نرخەی لە پەیمانەکەدا دیاریکراوە یان داواکردنی قەرەبوو، بە پێی برگەی (أ) بە خستنەسەری نرخی خزمەتگوزارییەکانی کاتی سەرپێچی).

پاشان ئەم بریارە گۆررا بە بریاری(١٤٢٧) لە ١٩٨٣/١٢/٢١[1] هەردوو برگەی (أ) و (ب)ی دەسکاری کراوە و گواستنەوەی مافی بەکارهێنان و زەوی کشتوکاڵی بۆ زیاد کراوە.

---

[1] مادەی (١١) لە یاسای کاتب عەدلەکان ژمارە ٢٧ ساڵی ١٩٧٧.

[2] مادەی (١١٢٧) لە یاسای ئێستای مەدەنی دەڵێت ( پەیماندان بە گواستنەوەی خاوەندارییەتی عەقارێک تەنها بریتییە لە پابەند بوون بە قەرەبوو ئەگەر یەکێک لە لایەنەکان پەیمانەکەی نەبردە سەر چ قەرەبوو بە مەرج گیرابوو یان نا).

ئەوەی شایانی باسە ئەم بڕیارە هێشتا کاری پێ دەکرێت، چونکە (وەك بزانم) هیچ یاسایەك دەرنەچووە کە هەڵی بووەشێنێتەوە.

پێشنیار دەکەم یاسادانەری عێراقی لەم بابەتەدا ئاراستەی یاسادانەری میسری وەربگرێت لە دانانی تۆمارکردن لە بازنەی تایبەت وەك مەرج بۆ گواستنەوەی خاوەندارییەتی.

فرۆشتنی موڵك لە یاسای (ناساندنی ماف و بابەتە یاساییەکانی موڵك ـ ی میسری) [2] (مادەی ٩) کەوا دەڵێت: ( فرۆشتنی موڵك دادەمەزرێت لە دەرەوەی بازنەی تایبەت و دەبێتە هۆی پابەندبوونی فرۆشیار بە تۆمارکردنەوە)، هەرکاتێك پابەندبوونەکەی تێکدا کریار داوای بڕیارێك دەکات لە دادگاوە و ئەو بڕیارەش دەبێتە بەڵگەی تۆمارکردن لە فەرمانگەی تایبەتدا.

## خواستگەی دووەم:
## کاریگەریی تێکدانی پابەندبوون
## بە رادەستکردن و کارتێکرانی خاوەنداری

ئاشکرایە کە رادەستکردن لە گرێبەستی فرۆشتندا (بۆ نموونە) شوێنی پابەندبوونی فرۆشیارە و بابەتی ئەم پابەندبوونەش بریتییە لە جێگەی گرێبەستەکە(فرۆشراو) و بۆ رادەستکردنی فرۆشراوەکەش چەند رێگەیەك هەیە کە لە وڵاتی دووگرێبەستکارەکەدا باوە یان یەکدەنگن لە سەری.

لە مەرجەکانی ئەم رادەستکردنە:

١ ـ پێویستە بابەتەکەی یەکپارچە و نەپچڕاو بێت.

٢ ـ لە سەر هەمان ئەو حاڵەتە بێت کە لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەدا بووە.

٣ ـ لە هەمان شوێن و کاتدا بێت کە بە رێکەوتن یان داب و نەریت دیاریکرابێت.

ئەگەر کەسی پابەند یەکێك لەم مەرجانەی لە دەستدا، بە تێکدەری پابەندییەکانی دادەنرێت و تێکدانیش کردارێکە مەسڵەحەتی کەسی پابەندی بۆکراو پێی کاریگەر دەبێت. ئەنجامی فەلسەفەی کارتێکردن و کارتێکران جێدەستی کارگەری لەسەر دوو لایەن هەیە:

---

[1] بڵاوکراوە لە (الوقائع العدلیە) ژمارە ٢٩٧٤ لە ١٩٨٤/١/١٢ .

[2] یاسای ژمارە (١١٤)ی ساڵی ١٩٦٤ . تنظیم الشهر العقاری المصري.

لە رووی کەسی پابەندەوە کاریگەریی بریتییە لە بەرپرسیارییەتی گرێبەستکارانە(تعاقدی) کە بریتییە لەوەی ئەنجامەکانی تێکدانی پابەندی بخاتە ئەستۆی خۆی .

لە رووی (کەسی پابەندییۆکراو)ەوە ئەنجامەکەی زیانلێکەوتن و بەدینەهاتنی ئەو قازانجەی ئامانجی بەستنی گرێبەستەکە بووە.

پاش ئەم پێشەکییە بە کورتی پێداویستییەکانی رادەستکردنی تەواو بەم شێوەیە باس دەکەین:

**رێگاکانی رادەستکردن:**

رادەستکردن یان ماددییە(رادەستکردنی حەقیقی) یان مەعنەوییە(رادەستکردنی حوکمی).

١ ـ رادەستکردنی ماددی : دانانی فرۆشراو لەبەردەست کڕیاردا بە شێوەیەك کە بتوانێت مومارەسەی تایبەتمەندییەتی خاوەندارییەتی خۆی بکات لە بەرهەمگرتن و بەکارهێنان و سوودلێوەرگرتن و بەکارهێنان و کۆنترۆڵ و دەستبەسەرداگرتنی ئارام. ئەوەی شایانی باسە کە رێگەی دانانی فرۆشراو لە ژێر دەسەڵاتی کڕیاردا بە پێی سروشتی بابەتی پابەندبوونەکە(شتی فرۆشراو ـ جێگەی گرێبەستەکە) دەگۆڕێت. لە گواستراوەکاندا رادەستکردن و وەرگرتن بە دەستاودەستکردن دەبێت، لە خانوبەرەشدا ـ بۆ نموونە خانوو ـ بە لابردنی ئەو شتانەی کە تایبەت بە خۆیەتی و بە رادەستکردنی کلیلەکانی، وە رادەستکردنی زەوی کشتوکاڵی لابردنی هەرشتێك تێیدا کە پێی دەوترێت خانوبەرە (بە تایبەتکردن) کە بۆ خزمەتی زەوییەکە دانراوە، وەك مەکینە و ماتۆڕی ئاوو شتی تری وەك ئەمانە کە هی فرۆشیارە و سەر بە زەوییەکەیە و لە خزمەتی زەوییەکە یا باخەکەدایە، هەروەها بە چۆڵکردنی لە ئاژەڵ، ئەگەر ئاژەڵی تێدا بوو. رادەستکردنی پارە و ئەوراقی دارایی و بازرگانی بەوە دەبێت بخرێتە ژێردەستی کڕیار یان ئەوکەسەی نوێنەری ئەوە. وە رادەستکردن لە کەلوپەلی بازرگانیی هاوردە و نێردراودا بارکردنیەتی، وە رادەستکردنی بەرگە و ئەوراقی بارکردنەکە بە کڕیار یان ئەو کەسەی نوێنەری کڕیارە بە رادەستکردنی کەلوپەلەکە دادەنرێت.

هەربەم شێوەیە رادەستکردنی هەر شتێك دەگۆڕێت بەپێی سروشت و جیاوازیی نەریتی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی.

٢ ـ رادەستکردنی مەعنەوی: لە نموونەکانی:

أ ـ پێویستە فرۆشراو لە بەردەستی کڕیاردا بێت پێش گرێبەستی نێوانیان، وەك ئەوەی بەکرێی گرتبێت یان دڵگیرکەر بێت یان بارمتەی گرتبێت (رەهنێکی وەها کە لە بریتی قەرزەکە ببرێت لە کاتی

ئەدانەوەی قەرزەكەدا) یان شتەكەی خولستبێت یان شتی تری لەم جۆرە، بۆیە ئەم جۆرە وەرگرتنە ماددییەی كڕیار بە رادەستكردنێكی مەعنەوی دادەنرێت بە نیسبەت فرۆشیارەوە.[1]

ب ـ پێویستە كڕیار كۆنترۆڵی فرۆشراوەكەی لە دەستدا بێت پاش گرێبەستەكە بە سیفەتی بەكرێگر یان خولستیار(مستعیر) یان رەهنگیر یان شتی تری لەم بابەتانە، لەم حاڵەتانەدا كڕیار بەوە دادەنرێت كە فرۆشراوەكەی وەرگرتووە بە وەرگرتنی مەعنەوی.[2]

ج ـ كۆنترۆڵی فرۆشراو بە شێوەی ماددی بگوازرێتەوە كەسی سێهەم و راستەوخۆ لە فرۆشیاری وەردەگرێت، ئەوكات وەرگرتنی فرۆشراو لە جێگەی وەرگرتنی فرۆشیاردا دەبێت لە رووی مەعنەوییەوە.[3]

**دووەم :** دەبێت خودی فرۆشراوەكە و پاشكۆكانی بە تەواوی رادەست بكرێت.[4]

**سێهەم:** پێویستە رادەستكردنی فرۆشراو و پاشكۆكانی بە هەمان ئەو حاڵەتەوە بێت كە هەیانبووە لە كاتی بەستنی گرێبەستەكەدا لە رووی چۆنیەتی و چەندییەتییەوە، وەگەرنا كەسی پابەند بە سەرپێچیكاری پابەندبوونەكەی دادەنرێت و زیان بە كەسی پابەندپێكراو دەگەیەنێت.

**چوارەم:** پێویستە ئەو فرۆشراوەی رادەستی دەكات مافی كەسی تری لەسەر نەبێت. ئەگەر رادەستی كردوو مافی كەسی تری لەسەر بوو، وەك ئەوەی لە رەهندا بوو یان لە كرێدا بوو لە كاتی رادەستكردندا، ئەوە بە تێكدانی پابەندبوونەكەی دادەنرێت گەر كڕیار رەزامەندی لە سەر نەبوو پاش ئاگادار بوونی.

زۆربەی زانایانی فیقهی ئیسلامی رایان وایە كە فرۆشتن لەم حاڵەتەدا لەسەر مۆڵەتی كڕیار دەوەستێت بە پێچەوانەی یاساوە.

**پێنجەم:** ئەگەر فرۆشراوەكە لە شتە هاووێنەدارەكان بوو، ئەوا پێویستە لەسەر كەسی پابەند هەمان پۆل رادەست بكات نەوەك پۆلێكی تر گەرچی لە هەمانجۆر بن، چونكە پۆلەكان گەرچی لە

---

[1] ماددەی (٥٣٩) لە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی.
[2] مادەی (١/٥٤٠) لە مەدەنی عێراقی.
[3] مادەی (٢/٥٤٠) مەدەنی عێراقی .
[4] بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی لە رووی نەریت و رێكەوتنەوە لە گەڵ فرۆشراوەكەدایە

چییەتییەکەیاندا(ماهیەت) جیاواز نەبن هەر لە دیارییەتی(مشخصات) و تایبەتمەندی و سیفاتی وەك رەنگ و قەبارە وتام و بۆن و شتی لەم شێوانەدا جیاوازن .

بێگومان زانایانی یاسا و زۆربەی زانایانی شەریعەت لە رووبەکەوە رەگەز و جۆریان تێکەڵکردووە و لە رووبەکی ترەوە جۆر و پۆلیان تێکەڵ کردووە لە مامەڵەکاندا، بە تایبەت لە شتە هاوێنەکاندا . رەگەز و جۆرەکان لە ماهییەتدا جیاوازن بە پێچەوانەی پۆلەکانی جۆرێك، کە لە ماهییەت و زاتییاتدا یەکدەگرنەوە، بەڵام لە وارس و تایبەتمەندییەکانیاندا جیاوازن.

ئاشکرایە کە ئەم جیاوازییە کاریگەرییەکی گەورەی دەبێت لە سەر نرخی راستەقینەی ئەم پۆلانە. کەواتە رادەستکردنی پۆلێك لە بریتی پۆلێکی تر بە لادان لە پابەندی دادەنرێت گەر پۆلی رادەستکراو باشتر نەبێت لە پۆلی فرۆشراو.

**شەشەم:** پێویستە رادەستکردن لەو کات و شوێنە دیاریکراوەدا بێت کە بە پێی رێکەوتن لە گرێبەستەکەدا دیاریکراوە. گەر دیاریش نەکرابوو ئەوا بە پێی نەریتی باو دیاری دەکرێت.

**حەوتەم:** لە هیچ حاڵەتێکی رادەستکردندا نابێت زیانی ماددی بگات بە کڕیار، وەگەرنا کەسی پابەند بە کەمتەرخەم دادەنرێت گەرچی خاڵەکانی تریش رەچاو بکات.

**شوێنەوارەکانی تێکدانی پابەندی لە یەکێك لەم حاڵەتە ناوبراوانەدا:**

ئەگەر فرۆشیار فرۆشراوەکەی رادەستی کڕیار نەکرد یان نەیویست لە شوێن و کاتی دیاریکراو بە پێی رێکەوتن یان یاسا یان نەریت رادەستی بکات، یان فرۆشراو رادەست بکات بە شێوەیەکی جیاواز لە کاتی بەستنی گرێبەستەکە بە بێ رێکەوتنێکی پێشوەخت ، یان دواکەوت لەو کاتەی دیاریکراوە لە گرێبەستەکەدا، یان خودی فرۆشراوەکەی بە بێ پاشکۆکانی رادەستکرد، یان نەیتوانی فرۆشراوەکە رادەست بکات بەهۆی ئەوەی دەسەڵاتی گشتی دەستی بەسەرداگرت و کردییە موڵکی خۆی پێش رادەستکردنی، یان رادەستکردنەکە دەبووە هۆی زیانگەیاندن بە کڕیار: بێگومان لە هەموو ئەم وێنانەدا بە کەمتەرخەم دادەنرێت لە پابەندبوونەکانیدا. بۆیە کڕیار بۆی هەیە بەپێی بنەماگشتییەکان یەکەمجار فرۆشیار ئاگادار بکاتەوە تا بۆی بسەلمێنێت کە پابەند بوونەکەی ناتەواوە و داوای جێبەجێکردنی تەواوی گرێبەستلەسەرکراو بکات لەگەڵ قەرەبوودا گەر کرا ، یان داوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەست و قەرەبوو بکات.

ئەوەی شایانی باسە کە هەڵوەشاندنەوە بە فەرمانی دادگا دەبێت و دادگاش دەتوانێت ئەو داوای هەڵوەشاندنەوە وەرنەگرێت ئەگەر فرۆشیار زۆربەی پابەندبوونەکەی بەجێ هێنا و لەم حاڵەتەشدا فەرمان دەکات بە قەرەبووکردنەوە گەر زیانێك روویدابوو.[1]

## حوکمی فەوتانی فرۆشراو پێش رادەستکردنی:

بەلگەنەویستە کە یەکێك لە گرنگترین پابەندبوونەکانی فرۆشیار رادەستکردنی فرۆشراوە بەو مەرج وسیفەتەکانەوە لە خاڵەکانی پێشوودا باسمانکرد. بەڵام حوکم چیە ئەگەر جێبەجێکردنی پابەندی ئەستەم بوو، وەك ئەوەی فرۆشراوەکە فەوتا یان بەکارهێنرا پێش رادەستکردنی بۆ کڕیار یان بریکارەکەی؟

دەکرێت لەم خاڵانەدا وەڵامەکەی کورت بکەینەوە:

**یەکەم:** فەوتان هەندێکجار ماددیە، وەك فەوتانی یان بەکارهێنانی پێش رادەستکردن، هەندێکجار یش مەعنەویە[2] وەك حاڵەتی دزرانی مامەڵە لەسەرکراو پێش رادەستکردنی لە لایەن کەسێکی نادیارەوە و لە جێگایەکی نادیاردا و هەروەها وەك لە حاڵەتی دەستگیرکردندا لە لایەن کەسێکەوە کە ناتوانرێت لێی بسەنرێتەوە.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا جێبەجێکردن ئەستەم دەبێت، ئەگەر جێگای گرێبەستەکە لەو دارایانە نەبوو کە هاوێنەدارن، بەڵام ئەگەر هاوێنەداربوو و لە بازاڕدا هاوێنەی هەبوو

ئەوا دەگونجێت لە رێگەی ئەڵتەرناتیڤەوە جێبەجێبکرێت، لەم حاڵەتەدا کڕیار مافی پارێزراوە وفرۆشیاریش پابەندبوونەکەی بەردەوامە.

**دووەم:** ئەگەر فرۆشراوەکە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ بە دەستی کڕیارەوە فەوتا، ئەوکات بە وەرگری فرۆشراوەکە دادەنرێت و پابەندیش بە جێبەجێکراو دەژمێررێت.

**سێهەم:** ئەگەر جێگەی گرێبەستەکە بە کرداری بێگانەیەك فەوتا ئەگەری جێبەجێکردن دەمێنێت بە گەڕانەوە بۆ سەر ئەو کەسە لە فرۆشیار یان کڕیار یان هەردووکیان و لەوێشەوە پابەندبوون هەر دەمێنێتەوە.

---

[1] تەماشای : د . کەمال قاسم ثروت . شرح احکام العقد لا ١٦٦ .

[2] هەندێکجاریش گشتگر یان هەندەکییە .

**چوارەم:** ئەگەر جێبەجێکردن بە هۆی فەوتانی جێگەی گرێبەستەکەوە ئەستەم بوو، ئیتر پابەندبوون بەسەر دەچێت و جێبەجێ نەبوون بە ناپابەندی دانانرێت.

**پێنجەم:** لە ئەنجامی ئەستەمبوونی جێبەجێکردنەوە چارەنووسی گرێبەستەکە خۆبەخۆ بە هێزی یاسا هەڵدەوەشێتەوە و لە ئەنجامی ئەم هەڵوەشاندنەوەش ئەمانە بەدییێت:

أ ـ نەمانی گرێبەستەکە و نەمانی شوێنەوارەکانی لە مافەکان و پابەندبوونەکان و گرێبەستەکە وەك نەبوو سەیر دەکرێت.

ب ـ نەمانی شوێنەوار بە شوێنەواری گەڕاوە دەبێت واتە لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەوە ، بە مەرجێك هەڵوەشاندنەوەکە بە هۆی کارەساتێکی دەرەوەی توانای مرۆڤەوە بێت پێش رادەستکردن ، رادەستکردنەکە جێبەجێکردنی فەوری یان بەردەوام بێت.

**شەشەم:** دەرەنجامەکانی فەوتانی فرۆشراو پاش هەڵوەشاندنەوە دەکەوێتە سەر کڕیار یان فرۆشیار؟

زانایانی یاسا و شەریعەت لەسەر دیاریکردنی ئەو لایەنەی کە فەوتانی خوازراوەکەی لەسەرە پێش رادەستکردنی بە کڕیا یەکدەنگنین ، بەڵکو دوو ئاراستەی جیاوازن:

أ ـ ئاراستەیەك پێی وایە کە دەکەوێتە سەر شانی کڕیار ، چونکە ئەو خاوەنە و دارایش لە سەر حسابی خاوەنەکەی دەفەوتێت. لە لایەنگرانی ئەم ئاراستەیەش:

١ ـ یاسای رۆمانی کە پێی وایە شوێنی گرێبەست(بابەتی پابەندی) ئەگەر پێش رادەستکردن فەوتا پابەندبتوونی فرۆشیار بە رادەستکردن لەکۆڵ دەبێتەوە و پابەندبوونی کڕیار دەمێنێتەوە بە دانی نرخەکەی.[١]

٢ ـ یاسای ئێستای مەدنی فەرەنسی(م ١١٣٨) کە هەمان رای هەیە لەسەر بناغەی بنەمای (فەوتانی دارایی لەسەر حسابی خاوەنەکەیەتی) .

زانایانی (ظاهري) لە فیقهی ئیسلامیدا لە لایەنگری ئەم ئاراستەیەن لەسەر بناغەی بەستنەوەی ئاسەوارەکانی فەوتان بە خاوەندارییەتەوە نەك بە رادەستکردنەوە.[٢]

---

[١] تەماشای د . احمد نجیب الهلالی . شرح قانون المدی المXری القدیم فی العقود١/٣٠٢ .

[٢] تەماشای المحلی بکة ٨/٣٧٩ بەندی ١٤٢١.

**ب ـ ئاراستەی دووەم :** پێی وایە کە ئاسەوارەکانی فەوتان پێش رادەستکردن دەکەوێتە سەر فرۆشیاری قەرزار. زۆربەی یاسا مەدەنییە نوێ عەرەبییەکان و جومهووری زانایانی شەریعەتی ئیسلامیش هەمان رایان هەیە. بەڵام ئەم حاڵەتانەی لێ هەڵاوێردە کراوە:

١ ـ حاڵەتی ئاگاداركردنەوەی کڕیار بە وەرگرتن لە لایەن فرۆشیارە و ئەویش بە بێ هیچ بەهانەیەك وەری نەگرێت.[١]

٢ ـ حاڵەتی رێکەوتن لە سەر ئەوەی کە فەوتان پاش گرێبەست و پێش رادەستکردن لە سەر کڕیار بێت.

٣ ـ دەستگرتنی فرۆشیار بەسەر فرۆشراوەکەدا پێش دانی نرخەکە و بە بێ مۆڵەتی فرۆشیار .[٢]

٤ ـ ئەگەر تیاچوونەکە لە لایەن کڕیارەوە بوو بێت .[٣]

**بە رای بەندە:** دادگەری وا دەخوازێت کە ئاسەوارەکانی فەوتان بە یەکسانی لە نێوان کڕیار و فرۆشیاردا بە یەکسانی دابەش بکرێت . کەوتنە سەرشانی فرۆشیار لە نیوەی ئاسەوارەکان سەرەڕای جێبەجێکردنی پابەندبوونی سەرەکی .کە رادەستکردنە لە سەر ئەو بنەمایەیە کە پابەندبوونی دووەمی بەجێ نەهێناوە کە رادەستکردنە و خاوەندارییەتیش پێش رادەستکردن ناتەواوە.

بەڵام کەوتنی نیوەی ئاسەوارەکانی فەوتان بۆ سەرشانی کڕیار لەسەر ئەو بناغەیەیە کە بۆتە خاوەنی فرۆشراوەکە لە واقیعدا سەرەڕای کامڵنەبوونی پێش رادەستکردن.

---

[١] مادەی (٥٤٧) یاسای مەدەنی عێراقی .

[٢] مادەی(٥٧٨) لە یاسای مەدەنی عێراقی . وە ئەوەی شایانی باسە ئەم حاڵەتە بە رادەستکردن دانانرێت چونکە بە بێ مۆڵەتی فرۆشیار کراوە و سەرەڕای ئەوەش کڕیار بەرپرسە لە فەوتان .

[٣] بۆ درێژەی پتر سەیری دانراومان (نظریە الالتزام برد غیر المستحق) لا ٦٤ و پاشتر .

# باسگەی چوارەم:
# کاریگەری تێکدانی پابەندی و کارتێکرانی بندەستیانە پاش رادەستکردن

یەکێك لە زەمانەتەکانی فرۆشتن[1] ئەوەیە کە بە دەستەبەریی بەرەنگاربوونەوە(تعرض) ناسراوە:

وشەی التعرض لە زمانی عەرەبیدا بە واتای بەرەنگاربوونەوەیە ، کاتێك دەوترێت: تعرض لفلان، واتە بەرەنگاری بوویەوە.[2]

لە زاراوەی یاسایی و فیقهیدا: رووبەروو بوونەوەی یەکێك لە گرێبەستکارەکانە بۆ جێگەی گرێبەست(گرێبەستلەسەرکراو) پاش گواستنەوەی خاوەندارییەتیەکەی و کۆنترۆلکردنی لە لایەن گرێبەستکارەکەی ترەوە.

پابەندبوون بە دوورکەوتنەوە لەو کارە پێی دەوترێت(دەستەبەریی بەرەنگاربوونەوە بوونەوە) و نەریت وەهایە لە یاسا و فیقهدا لە بابەتی (فرۆشتن)دا قسەی لە سەر دەکرێت، چونکە دڵیکی هەموو گرێبەستەکانە و هەموو حوکمەکانی بەسەر گرێبەستەکانی تردا جێبەجێ دەکرێت کە هەمان دیاردە(بەرەنگاربوونەوە)ی تێدا روودەدات.

ئاشکراشە کە فرۆشیار پاش رادەستکردنی فرۆشراو بە کڕیار پابەند دەبێت بەوەی کۆنترۆڵکردنێکی ئارام فەراهەم بکات بۆی کە دوور بێت لە هەر جۆرە کارێکی وەها کە ببێتە هۆی سوودوەرنەگرتنی تەواو لە فرۆشراوەکە.

لە سەر ئەم بنەمایە بەس نییە بۆ ئازادبوونی ئەستۆی فرۆشیار لەو پابەندبوونە گرێبەستییانەی کە یاسا پێویستی دەکات لە سەری بە هۆی گرێبەستی فرۆشتنەوە، کە هەستێت بەو کردارە ئامادەکارییەی پێویستە بۆ گواستنەوەی خاوەندارییەتی و پابەندبوونی بە رادەستکردن جێبەجێ بکات، چونکە کڕیار تەنها بە دەستکەوتنی شتەکە و خاوەندارییەتەکەی بە ئامانجی ئەم کڕینە ناگات،

---

[1] هەروەها هەموو گرێبەستێک کە حوکمەکانی فرۆشتنی هەیە.

[2] مختار الصحاح " مادة عرض. وە ئەم رووبەروو بوونەوە زانایانی یاسا پێی دەڵێن (التعرض).

بەڵکو پێویستە کڕیار کۆنترۆڵی ئارامی وەهای هەبێت بەسەر فرۆشراوەکەدا کە زەمانەتی خاوەندارییەتی و سوودلێوەرگرتنی بۆ کڕیار پێ بێت.

لە سەر ئەم بنەمایە فرۆشیار هەر لە کاتی بەستنی گرێبەستەوە پابەند دەبێت بەوەی بەرەنگاری کڕیار نەبێتەوە لەسەر بنەمای ئەوەی (ئەو کەسەی زەمانەتی لەسەرە پێویستە بەرەنگاری کڕیار نەبێتەوە). بە پێی نیەتپاکی.

ئاشکراشە کە بەرەنگاربوونەوە هەروەك لە خودی فرۆشیارەوە دەبێت، دەکرێت لە کەسێکی سێهەمیشەوە بێت. وە ڕووبەڕوو نەبوونەوەی کەسیی لە لایەن فرۆشیارەوە بۆ فرۆشراو پێی دەوترێت(زەمانەتی بەرەنگاربوونەوە) هەروەك بە بەرەنگارنەبوونەوە لە کەسێکی دیەوە ناو دەبرێت(زەمانەتی شایستەیی).

هەر لە سەر ئەم بنەمایە توێژینەوەی بابەتی ڕووبەڕووبوونەوە لە هەردوو حاڵەتەکەدا دابەشدەکرێت بەسەر دوو باسگەدا و یەکەمیان بۆ (دەستەبەریی بەرەنگاربوونەوە) و دووەمیان بۆ (دەستەبەریی شایستە بوون).

## خواستگەی یەکەم:
## پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوەی کەسیی
## (دەستەبەریی بەرەنگاربوونەوە)

بێگومان یاساکان[1] قسەوباسیان لە سەر پابەندیی فرۆشیار بە نەکردنی هەر کردارێك کە ببێتە هۆی بەربەستی سوودوەرگرتنی کڕیار لە فرۆشراو کردووە، کە پابەندبوونێکی نەرێنییە، چونکە جێگاکەی کارێکی نەرێنییە کە نەکردنی شتێکە، هەروەکو چۆن قسە و باسیان لە پابەندیی فرۆشیار کردووە بەوەی هەر بەرەنگاربوونەوەیەکی یاسایی کە لە کەسێکی ترەوە دەردەچێت و دەکرێت داوای مافێکی لە سەر فرۆشراوەکە بکات دوور بخاتەوە کە پابەندبوونێکی ئەرێنییە، چونکە جێگاکەی کرداری بەرگرییە یان دوورخستنەوەیە، هەروەك لە باسگەی دووەمدا باسی دەکەین.

کەواتە فرۆشیار بە پێی گرێبەست و هێزی پابەندکەری یاسا پابەندە بە دوورکەوتنەوە لە هەر کارێك چ یاسایی بێت چ مادی، کە ببێتە هۆی بەربەستکردنی گشتگری یان هەندەکی لە سوودوەرگرتنی کڕیار

[1] وەک یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی " مادەکانی (٥٤٩ ـ ٥٥٧).

لە فرۆشراوەکە، یان ببێتە ململانێکەری خاوەنەکەی لە خاوەندارییەتی فرۆشراوەکەدا.

بەرەنگاربوونەوە وەك کەمێك پێش ئێستا وتمان هەندێکجار یاساییە و هەندێکجاریش ماددییە، وەك لەم روونکردنەوەیەدا دێت:

**یەکەم: بەرەنگاربوونەوەی یاسایی:**

بریتییە لە هەر دڵخوازی(ئیدیعا)یەك کە لە لایەن فرۆشیارەوە دژی کڕیار دەردەچێت بەوەی کە مافێکی یاسایی لەسەر فرۆشراو هەیە بەرانبەر کڕیار. نموونە کردارییەکانی لای زاناکانی

یاسا ئەوەیە کە کەسێك داراییەك کە هی خۆی نییە بفرۆشێت بە کەسێکی تر ، پاشان ببێتە خاوەنی ئەو شتە بە رێگایەکی یاسایی وەك وەسیەت یان میرات یان کڕین و شتی تری لەم بابەتە، ئەوا ناتوانێت فرۆشراوەکە وەربگرێتەوە، چونکە دەستەبەرکەرە و یاسای گشتیش هەیە کە دەڵێت (ئەوکەسەی پابەندی دەستەبەریی بوو نابێت رووبە روو بێتەوە). وە ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە زاناکانی یاسا لە لێکدانەوەکانیان بۆ گرێبەستی فرۆشتندا ئەم نموونەیە دووبارە دەکەنەوە.[1]

لە دیدگای بەندەوە ئەم نموونەیە بە کەڵکی ئەوە نایەت ببێتە نموونەی کردەیی بەرەنگاربوونەوەی یاسایی، چونکە فرۆشیار ئەو شتەی فرۆشتووە کە خاوەنی نییە و بە کەسێکی فزولی دادەنرێت و گرێبەستی کەسی فزوولیش دەوەستێنرێت تا مۆڵەتی ئەوکەسە وەردەگیرێت کە خاوەنی شتەفرۆشراوەکەیە و وەستێنراویش هیچ ماف و پابەندییەك رووی تێناکات، کاتێك پابەندیش نەبوو چۆن دەستەبەریی بەرەنگاربوونەوە دەبێت؟ لە کاتێکدا دەزانین کە دەستەبەری و پابەندیی لێکگرێدراون ئەگەر هاوواتاش نەبن ، هەرکات پابەندی نەبوو دەستەبەریش نابێت.

بەڵام هەندێکجار بەرەنگاربوونەوەی یاسایی وێنا دەکرێت لە چەند حاڵەتێکدا، وەك دیاریکردنی جێگای گرێبەست بە جۆر، ئەوکات فرۆشیار جیاکردنەوە ناکات، جا لە حاڵەتی فرۆشتن لە دەرەوەی بازنەی (الشهر العقاری ـ فەرمانگەی تۆمارکردنی خانووبەرە) لە یاسای میسریدا و سەرپێچیکردنی فرۆشیار لە تۆمارکردن لەم فەرمانگەیەدا. وە حاڵەتی رادەستنەکردن لە گرێبەستە عەینییەکاندا.

بێگومان ئەم بابەتانەمان لە باسەکانی پێشووی ئەم بەندەدا باسکرد.

---

[1] لەو کەسانەش : دوکتۆر سەعدون العامری. الوجیز فی العقود المسماة (عقدی الایجار و البیع) چاپی ١٩٧٤ لا ١٣١ .. دوکتۆر کمال قاسم ثروت ـ شرح احکام عقد البیع چاپی ١٩٧٦ لا ١٧١ . دوکتۆر جعفر الفضلي ـ الوجیز فی العقود المسماة عقد البیع ١٠٧/٢ .

### دووەم: پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوەی ماددی:

بەرەنگاربوونەوەی ماددی : برتییە لە دەستێوەردانی فرۆشیار لە کاروباری فرۆشراودا پاش گواسرانەوەی خاوەندارییەتەکەی بۆ کڕیار، وەك ئەوەی فرۆشراوەکە دراوسێمولکی بێت و فرۆشیار دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو مولکەی فرۆشتوویەتی و خاوەندارییەتەکەی گواستۆتەوە بۆ کڕیار . نموونەی ئەم جۆرە دەستدرێژییانە زۆرن وەك ئەوەی بەشێك لە مولکە فرۆشراوەکە بخاتە سەر مولکەکەی خۆی و شتی تیا بنێژێت یان بچێنێت یان بینای تیا دروست بکات، یان بیکاتە بەشێکی خزمەتگوزاری مولکەکەی خۆی بێت بە بێ مۆڵەتی کڕیاری خاوەن مولك، یان ئەو دووکانەی بفرۆشێت کە لە تەنیشتی دووکانێکی تری خۆیدا بێت و کڕیار مەرج دابنێت لە سەری کە ململانێی نادروستی لەگەڵ نەکات بە فرۆشتنی هەمان ئەو کەلوپەلانەی لە دووکانەکەیدا دەیفرۆشێت، پاشان فرۆشیار بە پێچەوانەی ناوەرۆکی ئەم مەرجەوە بجولێتەوە .

### تایبەتمەندییەکانی پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوە:

پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە و گرنگترینیان ئەمانەن:

أ ـ پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوە پارچەپارچە نابێت، چونکە جێگەی پابەندی ئەوەیە کە دوور بکەوێتەوە لە کارێك خاوەندارێی کڕیار بۆ جێگەی گرێبەستەکە لەقبکات و خاوەندارێکە نائارام بکات و ببێتە هۆی ئەوەی بە تەواوی یان هەندەکی کار بکاتە سەر سوودوەرگرتن لە فرۆشراوەکە.

ب ـ پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوە پابەندییەکی بەردەوامە، کەواتە فرۆشیار هیچکات بۆی نییە بەرەنگاری کڕیار ببێتەوە هەرچەند ماوەیەکی زۆریش تێپەڕبوبێت بەسەر گرێبەستەکەدا. ئەم پابەندییە بە کاتبەسەرچوونی هەڵوەشێن و لابەر(مسقط) هەڵناوەشێتەوە ئەگەر پایە و مەرجە بابەتی و فۆرمییە یاساییەکانی لە کاتی رادەستکردن و وەرگرتنی جێگەی گرێبەستەکەدا هەبێت.

ج ـ گوێزرانەوە بۆ میراتگر یان وەسیەتبۆکراو: ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی تری بەرەنگار نەبوونەوە کە دەگوێزرێتەوە بۆ پاشینانی گشتی ـ الخلف العام ـ(میراتگر و وەسیەتبۆکراو) و پاشینانی تایبەت ـ الخلف الخاص ـ (کڕیاری دووەم و سێهەم) و بەم شێوەیە.

### پاداشتی تێکدانی پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوە:

ئەگەر فرۆشیار پابەندییەکەی تێکدا و بە کردار بەرەنگاربوونەوە کۆنترۆڵی ئارامیی کڕیاری شێواند،

ئەم ئەنجامانەی لەم وێنانەدا لێ دەکەوێتەوە:

أ ـ غەرلەمەی ئامادەسازی(الغرلمة التمهيدية) کە دادوەر بەکاریدەهێنێت بۆ وەستاندنی فرۆشیار لە سەرکەشیکردنی لە بەرەنگاربوونەوە ماددییەکانیدا.

ب ـ دڵخستنی ئەو جێگایەی خاوەنەکەی ململانێی نادروست دەکات لەگەڵ ئەو دراوسێ بازرگانەی جێگاکەی لێ کڕیوە.

بۆ نموونە ئەگەر کەسێك جێگایەکی فرۆشت کە دراوسێی جێگابازرگانیەکەی خۆی بوو و کڕیاریش بە مەرجی دانابوو کە نابێت فرۆشیار ململانێی نادروستی بکات، وەك فرۆشتنی هەمان ئەو کەلوپەلانەی کڕیار لە دووکانەکەیدا دەیفرۆشێت، بەڵام فرۆشیار ئەو ململانێیەی کرد، ئەو کاتە فەرمان دەکرێت بە دڵخستنیجێگاکەی ئەم.

ج ـ قەرەبوو کردنەوە: ئەگەر بە هۆییەرەنگاربوونەوەی ماددییەوە زیانێك بە کڕیار گەشت یان سوودوەرگرتنی لە جێگای گرێبەستەکە کەمکردەوە، ئەوکات فەرمان دەکرێت بە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانە لە سەر داوای زیانلێکەوتوو و رەچاوکردنی قەبارەی زیانەکە.

د ـ رووخاندنی هەر شتێکی نوێ کە لەسەر ئەو موڵکەی کڕیار دروستکراوە پاش فرۆشتن، وە ئەم مافی رووخاندنەی لە رێگەی دادگاوە دەبێت و مەرجیش نییە کە فرۆشیار مۆڵەت بدات، چونکە دەستدرێژیکارە و شوێنەواری دەستدرێژییەکانی لادەبرێت.

## خواستگەی دووەم:
## کاریگەریی کرداری
## تێکدانی پابەندبوون پاش رادەستکردن

پابەندبوون بە بەرەنگارنەبوونەوەی یاسایی هەمیشە کەسیی نابێت، هەروەك بەرەنگاربوونەوەی ماددی، بەڵکو دەکرێت لە کەسی سێهەمەوە بێت کە داوای مافی یاسایی خۆی بکات لە سەر فرۆشراوەکە بە گشتگری یان هەندەکی. بێگومان زانایانی شەریعەت و یاسا [١] ئەم بابەتەیان لە ژێر سەردێڕی دەستەبەرکردنی شایستەییدا تاوتوێ کردووە.

---

[١] لەو یاسایانەی قسەوباسیان لەسەر ئەم بابەتە کردووە، یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی لە ماددەکانی (٥٥٠ ـ ٥٥٧).

وە ئەوەی شایانی باسە کە (پابەند بوون بە دووڕخستنەوەی ئەوکەسەی ئیدیعای مافێك دەکات لە سەر فرۆشراوەکە) و (دەستەبەریی شایستەیی) و (دەستەبەری پێڕاگەشتن ـ الدرك ـ) و (دەستەبەریی بەرەنگاربوونەوە) و (لە ئەستۆگرتنی ئەنجامەکانی شایستەیی) هەموویان دەربڕینی هاوولتان و یەك واتا دەگەیەنن کە بریتییە لە: وەفاداریی فرۆشیار بە پابەندبوونی لە بەرانبەر کڕیاردا لە هەر بەرەنگابوونەوەیەك کەوا لە کەسی سێهەمەوە تووشی دەبێت. تێکدانی فرۆشیاریش بۆ پابەندییەکەی کردارێکی کاریگەرە لە سەر بەرژەوەندی کڕیار .

وە دەستەبەرییش(الضمان) وەك باسمان کرد لەم شوێنەدا هاوواتای پابەندبوونە.

وشەی (الاستحقاق)یش لە زمانی عەرەبیدا بە چەند واتایەك هاتووە وەك: (داواکردن[1] ـ الطلب) وە (گۆڕان بە سەردا هاتن ـ الصیرورة و ـ التحول[2] ـ) وە بە واتای پرسیارکردنیش[3] دێت و نزیکترین واتاشی لە واتا زاراوەییەکەی واتای یەکەمیانە، کاتێك دەوترێت (استحقه) واتە داوای ماف خۆی لێکرد .

لە زاراوەشدا بە چەند واتایەك پێناسە کراوە وەك: ئاشکرایی مافداریی شتێك و واجیبوونی بۆ کەسێکی تر . لابردنی خاوەندارییەتی شتێك بە سابتبوونی خاوەندارییەتییەکی پێشی و بە بێ بەرانبەر.

**پایەکانی شایستەیی:**

پایەکانی شایستەیی چوارن:

١ ـ کەسی شایستە: ئەو کەسەیە کە داواکەری ماف خۆیەتی لەو فرۆشراوەدا کە لای کڕیارە.

٢ ـ شایستە: بریتییە لە فرۆشراو چ گشتگیر بێت یان هەندەکی بێت یان ئەو مافەی بڕیاری لەسەر دەدرێت.

٣ ـ شایستە لە سەر: کە کڕیارە .

٤ ـ دەستەبەری شایستەیی: بریتییە لە فرۆشیار لە گرێبەستی فرۆشتندا نموونە .

---

[1] وەک ئەوەی دەڵێن: استحقه واتە داوای مافی خۆی کرد.

[2] وەک دەڵێن: استحجر الطین ، واتە گۆڕاو بوو بە بەرد.

[3] وەک دەڵێن: استخبره، واتە داوای هەواڵی لێکرد .

**مەرجەکانی شایستەیی گشتگیری و هەندەکی:**

بۆ بەدیهاتنی شوێنەوارەکان لە سەر دەستەبەری شایستەیی چەند مەرجێك هەیە و گرنگترینیان:

١ ـ ئاگادارکردنەوەی کڕیار: واتە پێویستە لە سەر داواکار(کەسی شایستە) یەکەمجار کڕیار ئاگادار بکاتەوە و داوای هەموو یان هەندێکی فرۆشراوەکە بکات، یان داوای ئەو مافەی خۆی بکات کە لە سەر کڕیارە جێگیرە و دەبێت بە بڕاردەی خۆی بیگەڕێنێتەوە بۆی پێش ئەوەی پەنا بۆ دادگا ببات، تا دوژمنایەتی دروست نەبێت و سۆزی نێوانیان بپارێزرێت و مەسرەف بۆ بگەڕێتەوە.

٢ ـ سوێندی روونکردنەوە: ئەوەیە کە کەسی شایستە سوێند بخوات کە نەیفرۆشتووە و نەیکردۆتە دیاری و نەیکردووە بە خێر و بە هیچ شێوەیەك لە خاوەنداریەتیی دەرنەچووە.

٣ ـ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی کە شایستەیە، جا گەر بە دڵنیاکانی کەسی شایستە لەسەر(واتە کڕیار)سەلمێنرا یان بە سوێند نەخواردن، ئەوا مافی گەڕانەوەی نییە بۆ سەر فرۆشیار هەروەها کەسی شایستە بە نرخەکە و قەرەبوو لای هەندێك لە زانایان [1] و یاسادانەری عێراقیش لە ژێر کاریگەریی ئەم بۆچوونەدایە [2].

٤ ـ شایەتیدان لەسەر بوونی دارایی شایستە(فرۆشراو) و دیاریکردنی لە رووی چەندییەتی و چۆنیەتیەوە، بۆیە پێویستە لەسەر دادوەر دوو کەسی رەوشت و باوەڕپاك(عادل) بنێرێت لەگەڵ گەواهی دەرانی سەلماندنی شایستەیی بۆ دڵنیابوونەوە لە سروشتی دارایە شایستەکە و دیاریکردن و تەشخیسدانی بە پێی ئەوەی لە واقیعدا هەیە.

٥ ـ پێویستە هۆکاری شایستەیی پێش گواستنەوەی خاوەنداریەتی (خاوەنداریەتی فرۆشراو) بۆ کڕیار . ئەگەر پاش ئەوە بێت ئەوا هیچ دەستەبەرییەك ناکەوێتە سەر فرۆشیار . بۆ نموونە: ئەگەر کەسێك خانوویەکی کڕی پاشان لە لایەن دەوڵەتەوە خاوەنداریەتەکەی لێ سەندرایەوە لەبەر قازانجی گشتی، فرۆشیار لێی بەرپرس نابێت .

---

[1] وەک حەنەفییەکان .

[2] کاتێک مادەی (١/٥٥١) دەڵێت ( کڕیار دەستەبەری بەدەست ناهێنێت ئەگەر شاسیتەیی نەسەلمێنرا، مەگەر بە دڵپێدانان یان سوێند نەخواردن) .

٦ ـ نابێت کریار ئاگاداربووبێت لە نادروستیی خاوەندارییەتی فرۆشیار و دروستیی شایستەیی، وەگەرنا ناتوانێت بگەڕێتەوە سەر فرۆشیار ئەگەر پێشتر زانیبووی کە فرۆشیارەکە ڕاستگۆ نییە لەوەدا کە دارایییەکە هی ئەوە .

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەسەر هەندێك لەم مەرجانە ئەوەیە کە مەرجی نالۆجیکین و لۆجیکی یاسایی قبوولّی ناکات، وەك لەم ڕوونکردنەوەیەدا باسی دەکەین:

أ ـ ئاگادارکردنەوە بە یەکێك لە مەرجەکانی دروستیی گەڕانەوەی کریار بۆ سەر فرۆشیار دانانرێت، ئەگەر شایستەیی فرۆشراو دەرکەوت و بە بەڵگە وەرگیراوەکان شایستەیی سەلمێنرا، چونکە هۆکاری گەڕانەوە هێشتا هەر ماوە چ ئاگادارکردنەوە هەبێت یان نا .

ب ـ کریار مافی ئەوەی هەیە بگەڕێتەوە سەر فرۆشیار بۆ داواکردنی نرخ و قەرەبوو ، چ سەلماندنی شایستەیی بە بەڵگە سەلمێنرابێت یان بە دانپێدانان یان بە نکوولیکردن لە سوێندخواردن، بە مەرجێك نییە تخراپیی کریار و ڕێککەوتنی لەگەڵ داواکار (کەسی شاینستە)ئەسەلمێنرابێت .

ج ـ هەبوونی زانیاری کریار لەسەر شایستەیی نابێتە بەربەستی گەڕانەوە، چونکە زانینی کریار بەوەی کە فرۆشراو هی فرۆشیار نییە نابێتە هۆی ئەوەی نەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەر فرۆشیار بە نرخەکە لە کاتی شایستەیی فرۆشراوەکە، بەڵکو فرۆشیار پێویستە لە سەری نرخەکە بگەڕێنێتەوە لە حاڵەتی سەلماندنی شایستەیی لە لایەن کەسی شایستەوە و نەگەڕاندنەوەی نرخ لە لایەن فرۆشیارەوە پاش فەرماندان بە سوودی کەسی شایستە بەوەی کە داوای کردووە پاش تێکدانی پابەندییەکەی، وە لەبەر ئەوەی لە بابەتی دەوڵەمەندیی بێ هۆیە .

### جۆرەکانی شایستەیی:

لە ڕووی چەندییەتییەوە شایستەیی دوو جۆرە، گشتگیر و هەندەکی:

**یەکەم :** شایستەیی گشتگیری: بریتییە لەوەی دەربکەوێت کە خودی شتە فرۆشراوەکە هی کەسێکی سێهەم بێت، وەك ئەوەی دزێك (یان کەسێکی تر)شتە دزراوەکە بفرۆشێتەوە بەو کەسەی خاوەندارییەتەکەی لێ وەرگرتووە. هەروەها وەك دارایییەکی دەگیرکراو کە دەگیرکەرەکە یان کەسێکی تر فرۆشتی و خاوەنی ڕاستەقینەش داوایەکی لەسەر کریار تۆمار کرد و داوای وەرگرتنەوەی فرۆشراوە دزراوەکە یان دەگیرکراوەکە یان هەرشتێکی لەم بابەتەی کرد لە کریار . لەم حاڵەتانەدا شایستەیی

گشتگیر دەبێت، چونکە خاوەندارییەتی هەموو فرۆشراوەکە بە تەواوی دەگەڕێتەوە بۆ داواکارەکە (کەسی شایستە) ئەگەر ئەوە بە بەڵگەی وەرگیراو سەلمێنرا.

**دووەم:** شایستەیی هەندەکی: ئەوەیە کە هەندێك لە فرۆشراوەکە بە شایستەی کەسێکی سێهەم دەرچێت، یان مافێکی بڕیار لەسەردراوی لە سەر بێت. بۆ نموونە ئەگەر شەریکێك لە داراییەکی هاوبەشدا بەشەکەی خۆی و بەشی شەریکەکەشی فرۆشت بە بێ ئەوەی بریکاری بێت بێت، پاشان شەریکەکەی داوای شایستەیی لەسەر کڕیار تۆمار کرد، شایستەیی لێرەدا هەندەکی دەبێت. هەروەها ئەگەر یەکێك لە میراتگرەکان بەشەکەی خۆی و بەشی میراتگرەکانی تری فرۆشت بێ بریکاریتی ئەوان و پێش دابەشکردنی میراتەکە.

وە نموونەیەکی تری شایستەیی هەندەکی، مافی قەرزدەری بارمتەگیر لەسەر ئەو داراییە بارمتەکراوەی قەرزاری بارمتەدەر بە بێ مۆڵەتوەرگرتن لێی فرۆشتوویەتی پێش دانەوەی قەرزەکەی. هەروەها وەك مافی بەشی خزمەتگوزاریی موڵکی فرۆشراو کەوا لە کاتی بەستنی گرێبەستەکەدا و فرۆشیار دەرینەخستووە و شتی تری لەم بابەتە لە مافە داراییە بڕیار لەسەردراوەکان لە سەر فرۆشراو، وە کڕیار بیکرێت سەرەڕای گشت ئەم مافانەی کە لە سەریەتی.

**پابەندییەکانی فرۆشیار لە دەستەبەریی شایستەییدا:**

أ ـ فرۆشیار پابەند دەبێت بە دوورخستنەوەی داوای هەرکەسێك کە داوای مافێك دەکات لەسەر فرۆشراوەکە، بە هەموو ئەو ڕێوشوێنە یاساییانەی دەتوانێت پەنای بۆ ببات، چ داواکان پەیوەندی بە موڵکییەتی فرۆشراوەکەوە بێت بە گشتگیری یان هەندەکی یان مافێکی عەینی بێت(وەك بارمتە) یان کەسی بێت(وەك کرێ)، ئەگەر ئەو داوایەی ڕەتکردەوە ئەوا جێبەجێکاری پابەندییەکەیەتی، وەگەرنا بە تێکدەری پابەندییەکەی دادەنرێت و سزایەکی دێتە سەر و یاسا یان بنەما گشتییەکان بڕیاری لە سەر دەدەن.

ب ـ ئەگەر فەرمان لە سەر ئەوە درا کە کەسی شایستە داوای لە بارەوە تۆمارکردبوو، فرۆشیار پابەند دەبێت بەرانبەر کڕیار بەو پابەندییانەی بە پێی نییەتپاکی(وەك ئەوەی کاتی گرێبەستەکەی نەزانی یان پێش وەرگرتن نەیزانی کە فرۆشراوەکە بە تەواوی یان هەندێکی شایستەی کەسێکی ترە)، یان بە پێی نییەتخراپی، بە شێوەیەك کە ئەوەی باسکرا بەم شێوەیەی خوارەوە بزانێت:

**یەکەم:** ئەگەر فرۆشیار نییەتی باش بوو ئەوا ئەم پابەندییانەی دەبێت:

١ ـ گەڕاندنەوەی هەموو ئەونرخەی لە کڕیار وەریگرتووە، چ نرخی فرۆشراوەکە زیادیکردبێت یان کەمیکردبێت.

٢ ـ نرخی ئەو بەروبوومەی کڕیار لە ئەستۆی گرتووە کە بیدات بە شایستەکان.

٣ ـ ئەو مەسرەفە سوودبەخشانەی لە فرۆشراوەکەدا کردوویەتی .

٤ ـ مەسرەفەکانی داوکاریی شایستەیی ( ئەو داوایەی کەسێکی تر بەرزی کردۆتەوە لەسەر کڕیار بۆ سەلماندنی ئەو مافەی هەیەتی لەسەر فرۆشراوەکە، وەك باج و کرێی پارێزەر و شتی لەم بابەتە) بەو ئیعتیبارەی دژە لەو داوایەدا کە سەرکەوتوو نەبووە تێیدا بەرانبەر ئەو کەسە شایستەیەی فەرمان بە شایستەیی دراوە بۆی ، بێگومان پێویست دەکرێت لە سەری کە مەسرەفی ئەم داوا یاسایە بگرێتە ئەستۆ بەو ئیعتیبارەی لایەنی دۆڕاوە .

هەروەها کڕیار مەسرەفی داوکەی (داوای دەستەبەری)لە فرۆشیار وەردەگرێتەوە کە دژی بەرزی دەکاتەوە پاش فەرماندان بە شایستەیی کەسی دی بۆ فرۆشراوەکە، کەواتە کڕیار مەسرەفەکانی ئەم داوای دەستەبەرییە دەکاتەوە لە فرۆشیار و فرۆشیاریش پابەند دەبێت بە دانەوەی ئەم مەسرەفانە پێی.

**دووەم: ئەگەر فرۆشیارەکە نیەتی خراپ بوو:**

بە شێوەیەك کاتی بەستنی گرێبەستەکە بزانێت کە فرۆشراوەکە هی کەسێکی ترە، لەم حاڵەتەدا بە نیەتخراپ دادەنرێت و هەموو ئەو شتانە دەگێڕێتەوە کە فرۆشیاری نیەتپاش دەیگێڕێتەوە، هەروەها ئەو زیادەیەی کە هاتۆتە سەر نرخی فرۆشراوەکە و خەرجییەکانی تەواوکاری و قەرەبووی هەر زیانێکی تر و هەر کاسبییەك کە لە دەستیداوە و هەر زیانێکیش لێیکەوتووە.[1]

### شوێنەوارەکانی کاریگەریی تێکدانی پابەندی لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستدا و کارتێکرانی رەزامەندی و شوێنەوارەکەیان:

ئەو یاداشتانەی باسمانکرد چەند شوێنەوارێکی کاریگەریی بەرەنگابوونەوەن لە فرۆشیارەوە یان لە کەسی سێهەمەوە، کارتێکرانی کۆنترۆڵی کڕیار پاش رادەستکردن لە سەر بناغەی کردار و کاتێکرانی فەلسەفی .

[1] ماددەی (٥٥٤) لە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی .... د . کمال قاسم ثروت ـ سەرچاوەی پێشوو لا ١٨٨ و پاشتر .

# بەندی چوارەم: کاریگەریی تاوانەکانی فریودان و فێڵکردن و کارتێکرانی بەرژەوەندی گشتی

## پێشەکی

فریودان و فێڵ لەو کارانەن کە پێچەوانەی مرۆڤایەتی و رەوشتبەرزین و هۆکاری نەهێشتنی متمانە و ئەمانەت و نییەتپاکین لە ئاڵوگۆڕە داراییەکان و لە بواری شەرەف مامەڵەکردندا. لەو دیاردە ناشیرینانەن کە رۆژ بە رۆژ لە هەڵکشاندایە لەگەڵ پێشکەوتنی هۆکارەکانی فێڵکردن و بەکارهێنانی رێگای چەواشەکاری، پاش ئەوەی نەریتی مادیگەرایی بەسەر مەعنەوییەتدا زاڵ بووە و رەوشتی خراپ بە سەر رەوشتی جواندا سەرکەوتووە، خواردنی جەستەیی بەسەر خواردنی رۆحیدا زاڵبووە و ئاستی مرۆڤ بەرەو ئاستی ئاژەڵی دادەبەزێت، بە شێوەیەك وای لێهاتووە کە دەژی بۆ ئەوەی بخوات و بەس، لە کاتێکدا مرۆڤ بۆ ئەوە دروستکراوە کە بخوات بۆ ئەوەی بژی و بخوات بۆ ئەوەی ئەو پەیامە بگەیەنێت کە دەستووری خوداوەندی ناوی لێناوە (ئەمانەت) کە بریتییە لە هەموو ئەو شتانەی لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەنجامی بدات بۆ قازانجی خۆی و کەسانی تر، هەروەك بە روونی لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرمێت:﴿ أنا عرضنا الامانةعلي السموات والارض فأبين أن يحملنها و أشفقن منها وحملها الانسان انه كان ظلوما جهولا ﴾ سورەتی الاحزاب/ ٧٢ .

ئەمەش رەوانترین و جوانترین شتە کە مرۆڤ وێنای بکات لە وێنەی خوداوەندی بۆ ئەمانەت بەو شێوەیەی کە ئەگەر گریمانەی هۆشمەندی بۆ ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان بکەین و پاشان ئەم دروستکراوانە کە سروشتیان بەهێزەو کێشیان قورسە و فراوانن داوای هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتەیان لێ بکرێت داوای لێبوردن دەکەن لەبەر ئەوەی دەترسن ئەو

کارەیان پێ نەکرێت و دەترسن لە ئەنجامەکانی ناپاکی لەم ئەمانەتە، بەڵام مرۆڤ کە لاوازترین دروستکراوی باوەشی ئەم بوونەوەرانەیە ئەو ئەمانەتەی هەڵگرت، بە هۆی ڕۆزنی عەقڵەوە کە تەنها بەو دراوە و کاتێکیش ناپاکی لەو ئەمانەتە بکات ستەمێکی زۆر لە خۆی و مرۆڤایەتی دەکات و نەزانییەکی گەورەی کردووە کاتێك بێئاگایە لەو ئەنجامە نەرێنییانەی دەبێتە بەرهەمی ئەم ناپاکییە، کە ئەنجامە ترسناکەکانی کاردانەوەی دەبێت لە سەر خۆی و ئەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژی بە زیان و خراپەکاری.

تاوانەکانی خڵەتاندن و چەواشەکردن و فێڵکردن لە پێشەوەی ئەو تاوانەن کەوا لە لایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێن. بە مەبەستی پاراستنی مرۆڤ لەم تاوانە و هاوێنەکانی لە پەیامە خوداوەندییەکاندا داوا لە مرۆڤ کراوە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و هاوشێوەکانیان ئەنجام بدات. ئەم خواپەرستییانەش. ئەگەر بە شێوەیەکی راست و دروست ئەنجام بدرێن وزەیەکی رۆحیی وەها دەبەخشن کە کرێکار لە کارگەکەیدا و جووتیار لە کێڵگەکەیدا و مامۆستا لە خوێندنگەکەیدا و کارمەند لە شوێنکارەکەیدا و دایك لە ماڵەکەیدا و دەسەڵات لە کاتی بەکارهێنانی بەرپرسیارییەتییەکانیدا چاودێری خۆیان بکەن و لێپرسینەوەیان لە خۆیان هەبێت و خۆیان بکەنە دادوەر و نەیار لە هەمانکاتدا و پێش ئەوەی کەسێکی تر لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات.

هەروەها یاسا دانراوەکانیش گرنگییانداوە بەوەی ئەو تاوانانە قەلاچۆ بکەن بە رێگا چارەسەرییەکان، کە بریتییە لەو سزایانەی بڕیاردراوە بۆ هەریەك لەو تاوانانە. وە لە نموونە سەرەکییەکانی تاوانە ئابووری و تەندروستییەکان تاوانی خڵتاندنە لە گرێبەستدا، وە تاوانی فێڵکردن و هاوردەکردنی خواردن و دەرمانی ساختە و بەسەرچوو، وە تاوانی هەبوونی ئەم جۆرە خواردن و دەرمانانە .

جا لەبەر ئەوەی سوورین لەسەر گەیاندنی سوود و روونکردنەوەی پتر توێژینەوەکەمان لە سەر ئەم چوار جۆرە تاوانە دابەشکردووە بەسەر چوار باسگەی سەربەخۆدا.

ئەوەی شایانی باسیشە کە ئەم بەندەی کۆتایی باس لە بابەتی تاوانەکان دەکات، وە باسکردنی لە چوارچێوەی دەروازەی سێهەمدا لە بەرپرسیارییەتی مەدەنیدا لە سەر ئەو بنەمایەیە کە ئەم تاوانانە پەیوەندییەکی بەهێزیان بە مامەڵە داراییەکانەوە هەیە، واتە لەو تاوانانەیە کە پەیوەندی بە داراییەکانەوە هەیە.

# باسگەی یەکەم:
# کاریگەریی تاوانی خلەتاندن و کارتێکرانی بەرژەوەندی

## تاوانی خلەتاندن لە گرێبەستدا

بریتییە لە دەرخستنی شتێك بە شێوەیەکی پێچەوانە لەگەڵ واقیعی ئەو شتە لە دەرەوەی زیهنی فێڵکار و فێڵلێکراوی گرێبەستکاران بە مەبەستی ئەوەی فێڵکار قازانجێکی ناڕەوای دەستکەوێت لە سەر حسابی زیانی فێڵلێکراو.

ئەم تاوانە لە رووی کاریگەرییەوە لە یەکێك لە گرێبەستکارانەوە و کارتێکرانی بەرژەوەندی گرێبەستکارەکەی تر، دەکەوێتە ژێر بابەتی کردار و کارتێکرانی فەلسەفییەوە. ئاشکراشە کە گەلێك رێگای پێشکەوتوو لەم سەردەمەدا هەیە بۆ خلەتاندن، بەهۆی پەرەسەندنی شێوازەکان و رێگاکانی فێڵ و چەواشەکردنەوە. لە گرنگترین وێنەکانیشی ئەمانەن:

أ ـ جیاوازی لە خودیبوونی شوێنی گرێبەستەکەدا(گرێبەست لە سەرکراو)، لە کاتێکدا گرێبەست لەسەر شتێك بکرێت و شتێکی دی رادەست بکرێت و وەربگیرێت. وەك ئەوەی فرۆشیار شتێك بفرۆشێت بەڵام شتێکی تر رادەست بکات کە لە ماهییەت و خود دا جیاوازن.

ب ـ جیاوازی لە سیفەتی جەوهەریدا یان لەو توخمە بێسوودانەی لە پێکهاتەی ناو شتەکەدا هەیە.

ج ـ جیاوازی لە جۆرەکەیدا یان لەجێگەی دروستکردنیدا یان لە ئەسڵ یان لە سەرچاوەکەیدا، وەك لە حاڵەتەکانی ساختەکردن و چاولێکەریکردنی ناونیشان و مارکە بازرگانییەکان، وەك ئەوەی لەسەر دەفرێك بنووسێت کە یابانییە (بۆ نموونە) بەڵام لە راستیدا چینی بێت (بۆ نموونە).

د ـ جیاوازی لە ژمارەدا لەو شتانەدا کە دەژمێررێن و جیاوازی لە ئەندازەدا لەو شتانەدا کە چەندییەتین و جیاوازی لە پێوانەدا لەو شتانەدا کە پێوانەیین و جیاوازی لە کێشدا لەو

شتانەدا کە کێشانەیین و شتی لەو بابەتە.

## پایەکانی تاوانی خەڵەتاندن:

ئاشکرایە کە هەموو تاوانەکان لەوەدا هاوبەشن کە بەرپابوونیان وەك تاوانێك لەسەر سێ پایەی سەرەکی گشتی راوەستاوە و بریتین لە:

١ ـ **پایەی ماددی:** بریتییە لە لایەنی ماددی تاوان، واتە ئەو شێوەیەی کە پێی دەردەکەوێت لە جیهانی بینرلودا.

پایەی ماددیش لەسەر سێ توخم راوەستاوە:

أ ـ **کردار**: بریتییە لەو چالاکییە ئەرێنی یان هەڵوێستە نەرێنییەی دەدرێتە پاڵ تاوانبار.

ب ـ **ئەنجام**: بریتییە لەو شوێنەوارە دەرەکییەی دەستدرێژی بۆ سەر مافێك خۆی تیا دەنوێنێت کە یاسا دەیپارێزێت .

ج ـ **پەیوەندی هۆکاریی**: ئەو پەیوەندییە یە کە کردار و ئەنجام پێکەوە دەبەستێتەوە، بە شێوەیەك کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕوودانی ئەنجامەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی کاری تاوانکارانە لە لایەن تاوانکارەوە.

٢ ـ **پایەی شەرعی:** ئەو سیفەتە ناڕەوای کردارە لە کاتی بەدیهاتنی ئەم دوو توخمەدا وەریدەگرێت:

أ ـ ملکەچی دەقێکی تاواننوێن و یاسا سزایەك بڕیار دەدات بۆ ئەوەی دەیکات. ئەمەش لەسەر بنەمای (تاوان و سزا تەنها بە دەق دەبێت).

ب ـ ملکەچی هۆیەك لە هۆکارەکانی ڕەوایی(الاباحە)نەبێت، هەروەك لە حاڵەتی بەرگری شەرعیدا. چونکە نەبوونی ئەم هۆکارە مەرجێکی بناغەییە بۆ ئەوەی کردارەکە سیفەتی تاوانبوونی تێدا بمێنێتەوە کە لە دەقی بەتاواندانانەوە وەریگرتووە.

٣ ـ **پایەی مەعنەوی:** بریتییە لەو ویستە تاوانخوازەی[1] لەگەڵ کرداردا هەیە(پایەی ماددی). چ لە وێنەی قەستی تاوانکاریدا بێت وەك تاوانی ئەنقەست یان لە وێنەی هەڵەکردندا

---

[1] چالاکییەکی دەروونییە بەرەو بەدیهێنانی ئامانجێک لە رێگەی هۆکارێکی دیاریکراوەوە ، دیاردەیەکی دەروونی و هێزێکە مرۆڤ پشتی پێدەبەستێت بۆ ئەوەی کاریکاتە ئەو شت و کەسانەی لە دەورویەریدان. وە جوڵێنەری چەندین جۆر هەڵسوکەوتی سروشت ماددین کە لە جیهانی دەرەکیدا ←

بێت وەك تاوانی نائەنقەست[1] ئاشكرایە ئەو چوار تاوانەی لێكۆڵینەوەی لەسەر دەكەین لەم بەندەدا لە تاوانە ئەنقەستییەكانن .

لە رووی بەدیهاتنی پایە گشتییەكانەوە چییەتی(ماهییەت)ی رەگەزی تاوان یەك شتە و بریتییە لە (هەموو ئەو قەدەغانەی كە بە پێی یاسا و شەرع سزایان بۆ دانراوە) . جا هەموو جۆرەكانی تاوانە جیاوازەكان لە حەقیقەت و چییەتیدا دەكەوێتە ژێر ئەم رەگەزەوە، چونكە چییەتی هەر جۆرێك لەو رەگەزە هاوبەشە پێك دێت لەگەڵ فەصڵی جیاكەرەوەی لە جۆرەكانی تری تاوان.

ئاشكراشە كە پایە تایبەتییەكانی تاوانی خڵەتاندن سێ دانەیە:

١ ـ پایەی ماددی: بریتییە لە پرۆسەی بەكارهێنانی ئەو رێگا فێڵاوی و چەواشەكارییانەی لە یەكێك لە گرێبەستكارەكانەوە بەكاردەهێنرێت، بە شێوەیەك كاریگەر دەبێت لە خڵەتاندنی گرێبەستكارەكەی تردا كە گرێبەستەكەی لەگەڵدا ئەنجام دەدات، هەروەك لە یەكێك لەو چوار وێنەیەدا كە لە جیاوازییەكاندا كەمێك پێش ئێستا باسمانكرد .

٢ ـ پایەی شەرعی: ئەو دەقە یاساییەیە كە خەڵەتاندن بە تاوان دادەنێت و سزایەكی تایبەتی جەستەیی یان دارایی بۆ دادەنێت لەسەر بنەمای ( تاوان و سزا تەنها بە دەق دیاری دەكرێت) .

٣ ـ پایەی مەعنەوی: بریتییە لە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجێكی نارەوا لە لایەن گرێبەستكاری خڵەتێنەرەوە، بۆ بەدەستهێنانی قازانجێكی دارایی لەسەر حسابی زیانی گرێبەستكارە خەڵەتێنراوەكەی تر .

---

چەندین شوێنەواری ماددی و دەروونی بەدیدەهێنن بۆ تێركردنی ئەو پێداویستییانەی خوازراون.. بە دەستەواژەیەكی تر، ویست بریتییە لە چالاكییەكی دەروونی لە هۆش و ئیدراكەوە پەیدا دەبێت و زانیارییەك گریمانە دەكات دەبارەی ئەو ئامانجەی چاوی لێگرتووە و ئەو هۆكارەی پشتی پێ دەبەسترێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجە نارەوایە .تەماشای مامۆستا محسن فؤاد فرج ـ جرائم الفكر و الرای و النشر. چاپی ١٩٨٧ لا ٢٤.

[1] دوكتور محمود نجیب حسني: الموجز فی شرح قانون العقوبات/ القسم العام . لا ٢٤ .

کەواتە کارتێکردن و کارتێکران بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە نێوان خەڵەتێنەر و خەڵەتێنراودایە، وە لە نێوان کرداری تاوانکارانەی یەکەم و بەرژەوەندی ئابووری دووەمدایە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، کە هەردوو لە بابەتی کردار و کارتێکرانی فەلسەفین .

**شوێنەوارەکانی پرۆسەی کارتێکردن وکارتێکران:**

شوێنەواری ئەم تاوانە بریتییە لە سزایەکی جەستەیی (وەك بەندکردن) یان دارایی ( وەك غەرامە ) یان هەردوو سزاکە بە پێی قەبارەی تاوانەکە و ترسناکیی تاوانبارەکە لەسەر کۆمەڵگە، سەرەڕای قەرەبووی ئەو زیانەی تووشی کەسی خڵەتێنراو بووە .

وە نموونەی پیادەکارییەکانی تاوانەکانی خڵەتاندن ئەوەیە کە لە مادەی یەکەمی یاسای جەزایی میسریدا هاتووە لە ژمارە (٢٨١) ی ساڵی ١٩٩٤ ـ کە نوێترین یاسایە لە نێو وڵاتە عەرەبییەکاندا ـ ئەوەندەی ئاگادارم ـ و ئەم بابەتەی بەم شێوەیە باسکردووە:

( سزای بەندکردن بۆ ماوەیەك کەمتر نەبێت لە ساڵێك و پتر نەبێت لە سێ ساڵ و غەرامەیەك کەمتر نەبێت لە دەهەزار جونەیە ویتر نەبێت لە سی هەزار جونەیە ، یان بە ئەندازەی نرخی ئەو کاڵایەی بابەتی تاوانەکەیە کامیان گەورەتر بێت ، یان بە یەکێك لەم سزایانە، ئەگەر ئەو تاوانەی کرد کە لە پەرەگرافی پێشوودا (تاوانی خڵەتاندندا) ئاماژەمان پێکرد، یان دەستیکرد بە ئەنجامدانی ئەو تاوانە بە بەکارهێنانی تەرازوو و پێوەر و پێوانە و و ئامێری پشکنینی تر ی ساختە و جیاواز، یان بەکارهێنانی ئەو رێگا و هۆکار یان دۆکیومێنتانەی پرۆسەی کێشانەی کاڵاکە یان پێوانەکەی یان ئەندازەپێوەکەی یان پشکنینەکەی ناراست دەردەچێت)[1] .

ئەمەش جگە لەو سزا تەواوکارییە پێویستییانەی بڕیاردراون بۆ تاوانەکە بە پێی یاسا ناوبراوەکە کە بریتییە لە دەستبەسەراگرتن(المصادرة) و بڵاوکردنەوەی لە دوو رۆژنامەدا یان لە شوێنانەدا هەڵبواسرێت[2] کە دادگا دیاری دەکات بۆ ماوەیەك کە تێ نەپەڕێت لە حەوت رۆژ لە سەر ئەرکی حوکمدراو. وە هەندێك لە سزا تەولوکارییەکان بریتییە لە

---

[1] الجريدة الرسمية ـ ژمارە (٥٢) لە ٢٩/کانوونی یەکەم /١٩٩٤ .

[2] المحامي بالنقض . ابراهيم المنجي ـ جرائم التدليس و الغش . چاپی ١٩٩٧ . ل ٧٨ .

بێبەشکردن لە هەندێك ماف و تایبەتمەنداری(مزایا) وەك ئەمانەی خـوارەوە:

١ ـ وەرگرتنی هەندێك پۆست و خزمەتگوزاری گشتی .

٢ ـ هەڵگرتنی نیشانی ڕێزی نیشتیمانی یان بیانی.

٣ ـ هەڵگرتنی چەك[١] .

وە ئەوەی شایانی باسە کە ئەم یاسا میسریەی باسمان کرد، لە سزای بڕیاردراودا بۆ تاوانی خڵەتاندن جیاوازی نەخستۆتە نێوان تاوانەکە بە تەواوی و دەستپێکردن بە تاوانەکە

**سروشتی تاوانی خەڵەتاندن:**

أ ـ تاوانی خەڵەتاندن سروشتێکی دووفاقی هەیە، چونکە لەو ڕووەوە کە دەستدرێژیکردنە بۆ سەر مافی تایبەتی گرێبەستکاری دەیتدرێژی لێکراو سیفەتێکی مەدەنی هەیە و پاداشتەکەی قەرەبوویەکی داراییە لەسەر ئەو زیانەی تـووشی گرێبەستکاری خەڵەتێنراو بـووە .

سیفەتێکی جەزاییشی هەیە لەو ڕووەوە کە گرێبەستکاری خەڵەتێنەر سەرپێچی ئەو دەقە یاساییەی کردووە کە خەڵەتاندن دەکاتە تاوان کە سزایەکی جەستەیی یان دارایی یان هەردووکیانی داناوە بۆی وەك باسکرا .

ب ـ لە ڕووی تـوخمی کاتەوە تاوانێکی کاتییە و لەو کاتەدا کۆتایی دێت کە دەکرێت بە کردەییش لە پاش تاوانەکە کۆتایی دێت،چ دەستپێکردنی تاوانەکە بێت چ کردنی تاوانەکە بێت بە تەواوی.

ج ـ لە ڕووی پایەی ماددییەوە تاوانێکی ئەرێنییە و بە قسە ئەنجام دەدرێت.

٢ ـ لە ڕووی سزاوە تاوانێکی تەمبێکارانە(تعزیری)یە لە شەریعەتی ئیسلامدا، چونکە شەریعەتی ئیسلامی دەقی هەیە لە سەر بەتاوانناساندنی و دیاریکردنی سزاکەشی ولز لێهێناوە بۆ کاربەدەستی موسوڵمانان(ولی أمر). خـودای پەروەردگار دەفەرکێت﴿ يخادعـون الله و الذين امنـوا وما يخدعـون الا انفسهم وما يشعرون﴾ سـورەتی البقرە/٩ .

---

[١] مادەی (١٠٠) لە یاسای ئێستای سزاکانی عێراقی . ژمارە ١١ساڵی ١٩٦٩ .

ئاشکرایە کە بە پێی شەریعەتی ئیسلام کاربەدەستی موسولْمانان دەتوانێت سزا دیاری بکات بۆ ئەو تاوانانەی لە قورئان و فەرمووودەدا باسکراون و سزایەکی دونیاییان بۆ دیاری نەکراوە، وەك تاوانی خەڵەتاندن .

# باسگەی دووەم:
# کاریگەریی ساختەکاریی و کاریگەربوونی بەرژەوەندی گشتی

## ساختەکاری(الغش):

هەر کردارێکە دەتوانێت سروشت یان تایبەتمەندی یان سوودی ئەو شتانە بگۆڕێت کە کەوتوتە ژێرکاریگەریی کارەکەیەوە بە هەر هۆکارێك بێت.[1]

هەندێك جار ساختەکاری بەوە دەبێت کە کەرەستەیەکی کەمنرخ دەخرێتە جێگای کەرەستەیەکی تر کە نرخی بەرزترە بە مەبەستی ساختەکاری، یان بە کەمکردنەوەی هەندێك لە کەرەستەکان یان بە زیادکردنی کەرەستەی تر بە مەبەستی زیادکردنی چەندییەتییەکەی و کەمکردنەوەی کاریگەرییەکەی.

ئاشکرایە کە لەم سەردەمەدا ساختەکاران هونەری جۆربەجۆر بەکاردەهێنن لە ئەنجامدانی ئەم تاوانەدا بە هۆی پەرەسەندنی هۆکارەکانی ساختەکارییەوە و بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجە ئابوورییەکانی خۆیان و بە دەستهێنانی قازانجی فراوان بە بە ڕێگەی ناڕەوا .

## پایەکانی ساختەکاری:

پایە تایبەتەکانی ساختەکاری سێ دانەن:

١ ـ پایەی ماددی: بریتییە لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی گۆڕینی سروشت یان تایبەتمەندی یان سوودەکانی ماددەکە .

---

[1] د . حسن صادق المرصاوی ـ شرح قانون العقوبات الخاص چاپی ١٩٧٨ . لا ٦٩٨ .

٢ ـ پایەی مەعنەوی: نیازی تاوانکردن کە خۆی لە مەبەستی گەشتن بە بەرژەوەندیەکی ناڕەوادا دەبینێتەوە .

٣ ـ پایەی شەرعی: بریتییە لەو دەقەی باس لە دیاریکردنی تاوان و سزاکەیدا دەکات لە سەر بنەمای ( تاوان و سزا تەنها بە دەق دیاریدەکرێت ) .

**سروشتی تاوانی ساختە:**

أ ـ لە رووی رێکخستنی یاساییەوە: پێگەی تاوانی ساختەکاری لە ناو تاوانەکانی یاسای گشتیدایە، چونکە چالاکیی کەسی ساختەکار تێکدانی سیستەمی گشتیی کۆمەڵگەیە و دەستدرێژییە بۆ سەر ئەو مەسڵەحەتانەی کۆمەڵگە کەوا یاسا دەیپارێزێت .

ب ـ لە رووی ئامانجەوە: تاوانێکی ئاسایی یە، چونکە هیچ هۆکارێکی سیاسی لەگەڵ نییە، تەنها تاوانێکە بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجی ماددی تایبەتی .

ج ـ لە رووی توخمی کاتەوە: پێگەی لە کاتدا ئەوەیە کە بە تاوانێکی بەردەوام دادەنرێت بە پێی جۆر و سروشتی ساختەکارییەکە .

د ـ لە رووی ئەو مافەوە کە دەستدرێژی کراوەتە سەر: بە تاوانێکی تایبەت دەستنیشان دەکرێت ئەگەر ئەو مافەی دەستدرێژی کراوەتە سەر تایبەت بوو بە تاکەکانەوە، ئەم لایەنەش زۆرینەیە لە تاوانەکانی ساختەکاریدا.

هـ ـ لە رووی دیدگای شەریعەتی ئیسلامەوە:بەو شێوەیە دەستنیشان دەکرێت کە تاوانێکی ئاینییە و دەقی فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە زۆر فەرموودەدا بە تاوانی داناوە، بۆ نموونە کە دەفەرمێت:( من حمل علینا السلاح فلیس منا و من غشنا فلیس منا[١] ) واتە: ئەو کەسەی چەك لە دژی ئێمە بەرز بکاتەوە لە ئێمە نییە و هەرکەسێك ساختەکاری بکات لێمان لە ئێمە نییە) لەم فەرموودە پیرۆزەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە کەسی ساختەکار لە کاتی ساختەکردنەکەیدا لە دەرەوەی ئیسلامدایە .

---

[١] صحیح مسلم ـ باب الایمان ٦٩/١ .

## ئەو خواردەمەنییانەی زیان بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنن:

ئەو ئەو خواردەمەنییانەی ساختەیان تێداکرلوە زیان بە کۆمەڵگە دەگەیەنن، سەرەڕای زیانی ئابووری لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

١ ـ ئەگەر پیسبوویێت بە میکرۆب و کەڕوو و تیشکدانەوە، بە شێوەیەك کە مرۆڤ تووشی نەخۆشی بکات .

٢ ـ ئەگەر ئەو مادده ژەهراوییانەی تێدا بوو کە زیان بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێت.

٣ ـ ئەگەر ئەو خواردنە لە لایەن کەسێکی تووشبوو بە یەکێك لە نەخۆشییە درمییەکانەوە بەکارهاتبوو یان کەسێکی هەڵگری میکرۆبێك لێی خوارد و ئەگەری پیسبوونی بەم میکرۆبە هەبوو .

٤ ـ ئەگەر لە ئاژەڵێکی نەخۆشەوە بەرهەمهێنرابێت و نەخۆشییەکەش ئەگەری گوێزرانەوەی تێدا هەبێت بۆ مرۆڤ .

٥ ـ ئەگەر تێکەڵ بوو بە خۆڵ یان هەر خڵتەیەك کە رێژەکەی بەرزتر بێت لە ئاستی رێپێدراو یان ئەستەم بێت پاکژ بکرێتەوە .

٦ ـ ئەگەر ماددەی پیسبووی تێدا بوو .

٧ ـ ئەگەر دەفرەکانی یان پێچەرەوەکانی ماددەی زیانبەخشی تێدا بێت بۆ تەندروستی.[1]

## کاڵا ساختەکان:

لەم حاڵەتانەدا کاڵا بە ساختە دادەنرێت:

١ ـ ئەگەر پرلوپڕی کوالێتی بڕیارلەسەر درلو نەبوو.

٢ ـ ئەگەر تێکەڵ یان ئاوێتە کرا بە مادەیەکی تری وەها کە سروشت و چاکییەتیەکەی بگۆڕێت .

٣ ـ ئەگەر بە شێوەیەکی هەندەکی یان گشتگیری یەکێك لە ماددەکانی ناوی گۆڕرا بە ماددەیەکی تری وەها کە لە مادده یەکەمەکە کەمتر بێت لە رووی چاکییەوە .

---

[1] صحیح مسلم ـ باب الایمان ٦٩/١ .

- ئەگەر یەکێك لە توخمەکانی بە هەندەکی یان گشتگیری لابرا .

٥ - ئەگەر ویسترا خراپی وبەسەرچوونی خواردنەکە بشاردرێتەوە بە هەر ڕێگایەك بێت.

٦ - ئەگەر ماددەیەکی پیسبووی تێدا بێت .

٧ - ئەگەر بە هەندەکی یان گشتگیری توخمگەلێکی خۆراکیی خراپبووی تێدابێت، چ ڕووەکی بێت چ ئاژەڵی .

٨ - ئەگەر ئەو زانیارییانەی لەسەر دەفر و پاکەت وبەرگی خواردنەکە بوو پێچەوانە بوو لەگەڵ پێکهاتەی ڕاستەقینەی خواردنەکە، ئەمەش دەبێتە هۆی خڵەتاندنی بەکاربەر یان زیانگەیاندن بە تەندروستیی مرۆڤ [1]

ئەگەر کاڵاکان ساختە و زیانبەخش بن بە تەندروستی مرۆڤ ، ساختەکاری بە زیانبەخش دا دەنرێت بۆ تەندروستیی گشتی.

## شوێنەوارەکانی کاریگەریی ساختەکاری و کارتێکرانی بەرژەوەندی:

بە هۆی کاریگەریی تاوانی ساختەکاری و کارتێکرانی بەرژەوەندی ئابووری یان تەندروستی لە سەر بناغەی کردار و کارتێکرانی فەلسەفی ، هەندێك شوێنەوار پەیدا دەبێت کە هەندێکیان سزاییە و لەو سزا جەزائییانەدا خۆی دەبینێتەوە کە بە پێی ئەو یاسایانە جیاوازە کە مامەڵەیان لەگەڵ تاوانی ساختەدا کردووە ، وە هەندێکیان مەدەنییە و لەو قەرەبووەدا خۆی دەبینێتەوە کە لە ژێر تیشکی قەبارەی زیاندا دەخەملێنرێت .

لەو یاسایانەی قسەوباسیان لە سەر بابەتی پاداشتی تاوانی ساختەکاری کردووە یاسای ژمارە (٢٨١) ی ساڵی (١٩٩٤) کە پێشتر باسکرا لە ماددەی دووهەمیدا کە دەڵێت: ( سزای بەندکردن بۆ ماوەیەك کەمتر نەبێت لە ساڵێك و پتر نەبێت لە سێ ساڵ و غەرامەیەك کەمتر نەبێت لە دەهەزار جونەیە وپتر نەبێت لە سی هەزار جونەیە ، یان بە ئەندازەی نرخی ئەو کاڵایەی بابەتی تاوانەکەیە کامیان گەورەتر بێت : دەدرێت بەسەر هەرکەسێکدا ساختەکاری بکات یان دەستپێبکات بە ساختەکاری لە خواردنی مرۆڤدا یان لە خواردنی ئاژەڵدا یان لە حەبی دەرمانیدا یان لە ڕووەکی پزیشکیدا یان لە دەرماندا یان لە

---

[1] سەرچاوەی پێشوو .

بەروبوومی کشتوکاڵیدا  یان لە بەرهەمی سروشتی یان پیشەسازیدا یان هەرشتێکی تری ئامادەکراو بۆ فرۆشتن) .

(وە هەرکەسێك شتێك لەم خواردەمەنییانە یان لەم دەرمانانە یان رووەکە پزیشکییانە یان بەرهەمە کشتووکاڵییانە یان هەر بەرهەمێنراوێکی ساختە بخات روو بۆ فرۆشتن یان بیفرۆشێت یان ئامادەی بکات بۆ فرۆشتن، یان هەر شتێك لەمانەی فرۆشت، چ ساختکراو بن یان کاتیان بەسەرچوو بێت و ئەمیش لەم حاڵەتە ئاگادار بێت)[1] .

وە دادگا دەتوانێت ئەو دامەزراوە دابخات کە ئەو کاڵایەی بەرهەمهێناوە و داخستنەکەش لە ساڵێك پتر نەبێت، یان دەتوانێت فەرمان بکات بە هەڵوەشاندنەوەی[2] .

## باسگەی سێهەم:
## کاریگەریی تاوانی هاوردەکردنی خواردنی ساختەکراو و کارتێکرانی بەرژەوەندی گشتی

ئاشکرایە کە زۆربەی کات لە هەموو وڵاتانی جیهاندا دەوڵەت سەرپەرشتی هێنانی پێداویستییەکانی ژیانی گەلەکەی دەکات  لە وڵاتانی ترەوە لەو بوارانەدا کە کەرتی ناوخۆیی ناتوانێت بەشی پێویست بەرهەم بهێنێت.

بەڵام وەك هەڵاوێردنییەك هەندێکجار دەوڵەت رێگا دەدات بە هەندێك چالاکی بازرگانی بە شێوەیەکی رەها یان مەرجدار، وەك هاوردەکردنی هەندێك پێداویستی کۆمەڵگە کەوا لەو وڵاتەی هاوردەی لێدەکات زۆرە.  مەرجی ئەم کارەش ئەوەیە کە زیان بە بەرژەوەندی گشتی یان تایبەتی نەگەیەنێت لە سەر ئاستی تەندروستی و ئابووری .

---

[1] بە وەرگرتن لە مامۆستا ابرهیم منجی ـ  سەرچاوەی پێشوو ـ لا ٢٢٣ و پاشتر .

[2] سەرچاوەی پێشوو . لا ٢٢٣ .

**تاوانی هاوردەکردنی خواردنی ساختە:**

دەکرێت ئەم تاوانە پێناسە بکەین بەوەی  کە هاوردەکرنی ئەو شتە پێویستەیە کە هاوردەکردنی  ترسناکیی بۆ سەر تاك و کۆمەڵ هەیە لە رووی تەندروستی و ئابوورییەوە .

پایەکانی تاوانی هاوردەکردنی کاڵای ساختە:

ئەم تاوانە  جگە لە پایە گشتییەکانی، لەسەر سێ پایەی تایبەت وەستاوە کە بریتین لە:

١ ـ **پایەی ماددی:** بریتییە لە چالاکییەکی ماددیی تاوانکارانە کە لە کردەیەکی ئەرێنی پێکدێت و خۆی لە کارێکی نایاساییدا دەبینێتەوە کە هاوردەکردنی خواردنی ساختەی قەدەغەکراوە بە هێنانی لە دەرەوەی سنوورەکانی وڵاتەوە.

ئەوەی شایانی باسە کە هەوڵی هاوردەکردنی خواردەمەنی ساختە لە رێگای رەسمیی فەرمانگەی گومرگەوە پێش هاتنە ناوەوەی وڵات، بە سەرەتا و دەستپێکردنی تاوانی هاوردەکردنەکە دادەنرێت. .

٢ ـ **پایەی مەعنەوی:** بریتییە لە ئاگاداریی تاوانبار لەوەی کە ئەو خواردنانە ساختەن و سەرەڕای ئەوەش بەم تاوانە هەڵدەستێت بۆ بەدەستهێنانی ئەو قازانجە فرلوانەی کە لە جیاوازی نێوان نرخی خواردەمەنی هاوردەکراوی ساغ و هاوردەکراوی ساختەدا هەیە .

٣ ـ **پایەی شەرعی:** بریتییە لەو دەقە یاساییە کارپێکراوانەی هاوردەکردنی  خواردنی ساختە بە تاوان دادەنێت، ئەو هاوردەیەی زیان بەبەرژەوەندی تەندروستی گشتی یان زیان بە ئابووری گشتیی نیشتیمانی دەگەیەنێت و سزایەکی ئازادیگیر(وەك بەندکردن) یان سزایەکی دارایی(وەك غەرامە)ی بۆ دیاری دەکات ، جگە لە دەسبەسەراگرتنی کاڵاکە و لەناوبردنی .

**چۆنیەتی یاسایی هاوردەکردنی خواردن و دەرمانی ساختە:**

بە پێی گۆشەنیگا جیاوازەکانەوە چۆنیەتییەکەی دەگۆڕێت:

أ ـ لە رووی پایە ماددییەکەیەوە بە تاوانێکی ئەرێنی دادەنرێت، چونکە چالاکیی تاوانبار لە کردەیەکی ئیجابی پێکدێت کە خۆی لە هەستانیدا بە کارێك دەبینێتەوە کە یاسا

بەریەستی کردووە، ئەویش هاوردەکردنی خواردن و دەرمانی ساختە و خراپ و قەدەغەکراوە .

ب ـ لە رووی سروشتی تاوانەکەوە بە تاوانێکی کرداری دادەنرێت، چونکە تەنها بە کردار ئەنجام دەدرێت و تاوانبار هەڵدەستێت بە هاوردکردن و سنووربڕین بە شێوەیەکی ماددی

ج ـ لە روووی مەبەستەوە بە تاوانێکی ئەنقەستی دادەنرێت لەو کاتەوە کە دەزانێت کە ئەو کاڵایە ساختەیە یان کاتی بەسەر چووە .

د ـ لە رووی مافی دەستدرێژی بەسەرداکراوە وە، بە تاوانێکی گشتی دادەنرێت کە زیان بە بەرژەوەندی کۆمەڵگە دەگەیەنێت .

هـ ـ لە رووی ئامانجەوە، بە تاوانێکی ئاسایی دادەنرێت نەك سیاسی، چونکە ئامانجی بەدەستهێنانی سوودێکی ماددییە .

و ـ لە رووی قەبارەی سزاکەیەوە، بە تاوانێکی ناوەنجی دادەنرێت .

### چاودێری لەسەر کاڵای هاوردە:

پێویستە لە سەر دەوڵەت لیژنەی تایبەتی دروست بکات بۆ چاودێریکردنی ئەو کاڵا و دەرمانانەی لە سنووری وشکانی و دەریایی (بەندەرەکان) و ئاسمانیەوە(فرۆکەخانە) هاوردە دەکرێت، بە شێوەیەك کە نوێنەرانی وەزارەتەکانی تەندروستی و کشتوکاڵ و ئاوەدانکردنەوە و ئازووخە و بازرگانی وەزارەتی هاوێنەی تری پەیوەندیدار، بۆ چاودێریکردنی هاوردەکان بە پێی یاساکانی مەسڵەحەتی گومرگی . بە مەرجێك کاریەدەستان یان نوێنەرەکانیان و نوێنەرانی کۆمپانیاکانی بیمەی پسپۆر ئامادەی کارە پەیوەندیدارەکان بن .

### ئەرکەکانی لیژنەکانی چاودێری:

ئەم ئەرکانەش بە یاسا دیاریدەکرێن کە گرنگترینیان ئەمانەت:

١ ـ پشکنین و شیکرنەوەی ئەو نموونانەی لە نامەکان و دۆکیومێنتەکانی شتە هاوردەکراوەکانەوە وەرگیراون .

٢ ـ دڵنیابوونەوە لە ساغی و دروستی ئەو دۆکیومێنت و بڕوانامە تەندروستی و بەیتەرییانەی سوودی لێ وەردەگیرێت، هەروەها هەر بەڵگەنامەیەکی تری هاوپێچ .

٣ - دۆسییەی فەرمی بۆ سەلماندنی ئەو پشکنینە ئاشکرایانەی کە کراون، دڵنیابوونەوە لە یەکانگیری و هاووێنەیی نموونەکان و شتە هاوردەکراوەکانەوە لە رووی خود و جۆر و مواسەفاتەوە.

## شوێنەواری کاریگەریی تاوانی هاوردەکردنی کاڵای ساختە و کارتێکرانی بەرژەوەندی گشتی:

کاریگەریی و کارتێکرانی فەلسەفیی لەم بوارەدا چەند شوێنەوارێك بەدیدەهێنن کە هەندێکی کەسییە و هەندێکی بابەتییە:

أ - لە شوێنەوارە کەسییە جەستەییەکان: سزا ئازادیگیرەکانی وەك زیندان و بەندکردن و سزا داراییەکان(غەرامە) .

ب - لە شوێنەوارە بابەتییەکانی:

١ - لەناوبردنی کاڵا هاوردەکراوەکە بە سووتان و هەر شتێکی لەو بابەتە .

٢ - داخستنی ئەو دووکان و شوێنە بازرگانییانەی خاوەنەکانی ئەم جۆرە کاڵایانە هاوردە دەکەن و داخستنەکەش یان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان بە هەمیشەیی .

٣ - هەڵوەشاندنەوە و لێسەندنەوەی ئەو مۆڵەتە فەرمییەی پێشتر دراوە بەو هاوردەکارانە لە بازرگانان یان کەسانی تر .

# باسگەی چوارەم:
# تاوانی گرتنەخۆی کالاّ ساختەکان
# بە مەبەستێکی ناڕەوا

### گرتنەخۆ(حیازة)ی ناڕەوا :

بریتییە لە دۆخێکی ماددی کە بەهۆیەوە کەسێك کۆنترۆڵی کردەیی شتێکی دیاریکراو دەکات کە دیاردەی ساختەکاری تێدایە لە سەر هەرسروشتێك بێت، چ خواردەمەنی بێت چ دەرمانی تەندروستی بێت یان کەرەستەی بیناسازی یان ئامێری میکانیکی یان تەقەمەنی یان چەك و شتی لەو بابەتانە .

### توخمەکانی لەخۆگرتن:

گرتنەخۆ دوو توخمی هەیە، مادی و مەعنەوی:

أ - **توخمی مادی:** زاڵبوونی کردەیی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەسەر ئەو کاڵایەدا کە لایەتی.

ب - **نییەتی خاوەندارییەتی:** چونکە گرتنەخۆلە تایبەتمەندییەتی خاوەندارییە و لە دەستڕۆشتنی خاوەنە بەسەر موڵکی خۆیدا، هەروەها تایبەتمەندی و دەستڕۆشتنی بەکارهێنان و سوودلێگرتن و گۆڕانکاری تێداکردن .

### پایە تایبەتەکانی تاوانیگرتنەخۆی کالا تایبەتەکان:

ئەم تاوانە جگە لەو پایە گشتییانەی لە باسگەی یەکەمی ئەم بەندەدا باسمانکرد، سێ پایەی تایبەتی هەیە:

١ - **پایەی ماددی:** بریتییە لە پرۆسەی گرتنەخۆی خواردەمەنی ساختە، بە شێوەیەك کە دەستەڵاتی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی بەسەردا هەبێت .

٢ ـ **پایەی مەعنەوی:** بریتییە لە ئامانج ناڕەوای کەسی لەخۆگر، واتە ویستی ئەوە بکات کە کاڵا لەخۆگیراوەکە بۆ مەبەستێکی ناڕەوا بەکار هێنێت و نییەتی ئەوە بهێنێت کە مافی خۆیەتی ئەو کاڵایە بەکاربهێنێت وەك خاوەنێك .

ئەوەی شایانی باسیشە گرتنەخۆئەوە ناگە یەنێت خاوەنی شەرعیی کاڵاکەیە، چونکە لە دەستدا بوون سیفەتێکی گشتییە بۆ کاڵایەك خاوەنی بیت یان نا، بە شەرعی لات بێت یان نا، بە شێوەیەکی ئەسڵی بێت یان بە شێوەیەکی ڕەسایی .

ئاشکرایە کە بەدیهاتنی سیفەتێکی پابەند گشتگیر نابێتە هۆی حەتمیبوونی مەلزوومێکی تایبەت، چونکە هەندێکجار ڕەسەن و ئەسڵی و ڕەوا دەبێت، وەك لەدەستدابوونی ماڵێك لە لایەن خاوەنەکەیەوە، هەندێکجاریش ناڕەوا دەبێت، وەك ئەوەی داگیرکەر و دز شتەداگیرکراوەکەیان لە دەستدایە .

هەندێجاریش دامەزراوو ئارام دەبێت، وەك ئەوەی خاوەنی شتێك هەمان ئەو شتەی لە دەستدا بێت . هەندێجاریش لەدەستدابوونەکە ناجێگیر و کاتییە، وەك شتی خوازیار لای کەسی خوازەر و شتی بەکرێگیراو لای کەسی بەکرێگیر .

٣ ـ **پایەی شەرعی:** بریتییە لەو دەقەی لەدەستابوونی کاڵا ساختەکان بە تاوان دادەنێت و بە ڕوونی و ڕێکی سزای بۆ دیاری دەکات، لەسەر بنەمای (تەنها بە دەق تاوان و سزا دیاری دەکرێت) .

### چۆنیەتیی تاوانی گرتنەخۆی کاڵا ساختەکان:

چۆنیەتیی ئەم تاوانە لە چەند ڕوویەکی جیاوازەوەیە کە هەندێکی بریتییە:

أ ـ **لە ڕووی ئامانجەوە** بە تاوانێکی ئاسایی دادەنرێت کە بە مەبەستی کەسیی دەکرێت، چونکە چالاکیی تاوانکارانەی تاوانبار هیچ هۆکارێکی سیاسی لە پشتەوە نییە، چ لە بابەتەکەیدا چ لەو پاڵنەرانەیدا کە تاوانبار بەرەو ئەو کارە دەبات .

گرنگیی جیاوازیدانان لە نێوان تاوانی ئاسایی و سیاسیدا لەوەدا ڕەنگدەداتەوە کە تاوانباری سیاسی لە نێوان وڵاتاندا ڕادەستی یەکدی ناکرێنەوە، بەڵام تاوانباری ئاسایی ڕادەستدەکرێتەوە بۆ سزادانی لە لایەن دەوڵەتی دەسەڵاتدارەوە، ئەمەیان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، بەڵام لەسەر ئاستی ناوخۆ سزای تاوانباری سیاسی سووکترە لە وڵاتانی

دیموکراسیدا و قورسترە لە وڵاتانی دیکتاتۆریدا بە مەبەستی پاراستنی دەسەڵات، لە سەردەمی کۆن و نوێدا قسەیەك کراوە کە دەڵێت (ئەو کەسەی ئەمڕۆ تاوانباری سیاسیە، رەنگە سبەی فەرماندار بێت).

**ب ـ لە رووی (کایە)وە:** بە تاوانێکی گشتی دادەنرێت، چونکە کار لە کۆمەڵگە دەکات و زیانی پێدەگەیەنێت، بۆیە دەخرێتە ژێر سیستەمی یاسای گشتی لە سزا و بەتاوانداناں و حوکمەکان و شوێنەوارەکاندا .

**ج ـ لە رووی پایەی مادییەوە:** بە تاوانێکی ئەرێنی دادەنرێت، چونکە پایە مادییەکەی کردار و لەدەستدابوونی کاڵای ساختەیە لە خواردن یان دەرمان یان ئامێری میکانیکی یان هەر کەلوپەلێکی تر، بە مەبەستی فرۆشتنی بە کاریەران و بۆ ئامانجی ناڕوا .

**د ـ لە رووی توخمی کاتەوە:** بە تاوانێکی بەردەوام دادەنرێت، چونکە گرتنەخۆ هەر بە سروشتی پرۆسەیەکی بەردەوامە لە رابوردوو و ئێستا و داهاتوودا و کاتی نییە و بە ئەنجامدانی کۆتایی بێت وەك تاوانی کوشتن، کە لە خودی خۆیدا کاتییە، بەڵام لە رووی شارینەوەی تەرمی کوژراوەکەوە بە تاوانێکی بەردەوام دادەنرێت .

**پێویستیی دانانی یاسای بنەبڕکردنی چەواشەکردن و ساختەکاری:**

زۆر پێویستە کە یاسادانەری هەر وڵاتێك یاسایەکی جیئایی وەها دابنێت کە بە هەموو چەشنێك خەڵەتاندن و چەواشەکردن و ساختەکاری بنەبڕ بکات، بۆ ریشەکێشکردن و نەهێشتنی هۆکارەکانی دەستاودەستکردنی ئەو کاڵا ساختە و خراپانەی زیان بە ئابووری نیشتمان و تەندروستی گشتی دەگەیەنن. پێویستە ئامێری چاودێری لە سەر سنوورە نێودەوڵەتیەکان دابنرێت و رێگا وشکانی و ئاسمانی و دەریاییەکان بە رووی ئەو کەسانەدا دابخرێت کە بە نیازن لە رێگای هاوردەکردن و بندەستخستن و دەستاودەستکردنی کاڵای ساختە و خراپەوە زیان بە مەسڵەحەتی ئابووری و تەندروستیی گشتی بگەیەنێت .

هەروەها پێویستە سیستەمێکی چاودێری دابنرێت بەسەر بازاڕەکانەوە و پشکنین بکرێت بۆ ئەو کاڵایانەی کڕین و فرۆشتنی پێدەکرێت، بە مەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی گشتی .

ئەم دەزگایە لە سەردەمەکانی سەرەتای دەسەڵاتی ئیسلامدا هەبووە و ناوی سیستەمی (الحسبة ) بووە. ئومێدەوارین کە ئەم سیستەمە بە سوودە زیندوو بکرێتەوە و بە خۆبەخشانە پەیڕەو بکرێت هەروەك جاران، یان مووچەیەکی بۆ دیاری بکرێت لە دارایی گشتی و بە شێوەیەکی فەرمی بدرێت، چونکە قازانجی گشتی چ ئابووری بێت چ تەندروستی لە پێشەوەی بەرژەوەندیە زەرووریيەکانی کۆمەڵگە و تاکەوەیە لە سەردەمی نوێدا، پاش ئەوەی ژیانی ماددی ئاڵۆز بووە و پڕبووە لە ڕێگا فێڵئامێزەکان و پڕە لە خڵەتاندن و ساختەکاری، ئەمانەش هەمووی بەرهەمی پەرەسەندنی ژیانی مرۆڤایەتی یە.[1]

رَبِّ زِدْنِي عِلْماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ

[1] بۆ درێژەی پتر، سەیری : د. یاسین رشید الزیباری بکە لە پەرتووکی وقائع من نظام الرقابة والحسبة دراسة مقارنة.